# بیروباوەڕی ئیسلامی

## لە دوو توێی قورئان و سوننەتدا

( ٣٠٠ پرسیار و وەڵام )

لە نووسینی

**هێمن عبدالعزیز**

چاپی سێیەم

زنجیرەی پەروەردەی ئیسلامی

(٢)

# بیروباوەڕی ئیسلامی
# لە دوو تویّی قورئان و سوننەتدا

(٣٠٠ - پرسیار و وەڵام)


نووسینی

**هێمن عبدالعزیز**



چاپی دووەم

ساڵی ١٩٩٧ز

# پێشکەشە

- بەو جگەرگۆشانەی کە نەوەی نوێی ئەم سەردەمەن و تینوو و تامەزرۆی ئاوی سازگاری حەوزی کەوسەرن.
- بۆ ئەو لاوە خواویستانەی کە قوتابی قوتابخانەی ئیسلام و شوێن کەوتەی پێغەمبەری ئەکرەمن ﷺ.
- بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە دروشمی (**رضينا بالله رباً، وبالإسلام ديناً، وبمحمد ﷺ رسولاً**)یان بەرز کردۆتەوەو دەیانەوێ لە واقیعی ژیانیاندا ڕەنگداتەوە.

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٢﴾ الرَّحْمَنِ
الرَّحِيمِ ﴿٣﴾ مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ ﴿٤﴾ إِيَّاكَ
نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴿٥﴾ إِهْدِنَا الصِّرَاطَ
الْمُسْتَقِيمَ ﴿٦﴾ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ
غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ ﴿٧﴾

## وتەی بەڕێز عبدالقادر توحیدی:

الحمد لله الذي ارسل رسوله بالهدى ودين الحق ليظهره على الدين كله واصلي واسلم على المبعوث رحمة للعالمين صلاةً وسلاماً دائمين الى يوم الدين وعلى آله واصحابه وذريته ومن تبعه ودعا بدعوته اجمعين..

اما بعد:

بناغەی ئایین و سەری هەموو بەشەکانی خواناسی بریتی‌یە لە یەکاپەرستی لە سەر ڕێچەو ڕێبازی دیاری کراوی ئایینی پیرۆزی ئیسلام و یەکەم مەرجی چوونە ناو چوار چێوەی ئیسلامە بۆیە هەر قسەو بانگەواز و نووسینێك بەرەو یەکتاپەرستی گەورەترین و بەنرخترین قسەو بانگەواز و نووسینە:

﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلاً مِمَّنْ دَعَا إِلَى اللهِ وَعَمِلَ صَالِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾

سوپاس بۆ خوای گەورە کە لەم بارەیشەوە نوسراوی زۆر چاك نوسراوە و وەدەست لاوان و کۆڕیەکانی ئەم سەردەمە دەکەون دەتوانن ڕێگای ڕاست و دروستی خواناسی بدۆزنەوە بەلاّم کوردستان و نەوە تازەکانی لەم بارەوە بە زمانی خۆیان کەم بەش بوون و تازە خەریکن لەو بارەیشەوە بەبراو خوشکانی تری خۆیان بگەن ئەوەتە لەم ڕۆژانەدا برای بەڕێز کاك (**هێمن عبدالعزیز**) نوسراوێکی خۆی هێنایە لام و داوای لێ کردم کە چاوێکی پێدا بخشێنم منیش ئەگەر چی زۆر کاتم کەم بوو گرفتاریشم، بەلاّم لەبەر گرنگی نوسراوەکە و پێویستی لاوانی ئەمڕۆی کوردستان بەو عیلمە بەنرخە داواکەیم قەبوول کردوو لەماوەی هەفتەیەکدا خوێندمەوە بەڕاستی خوا پاداشتی ئەو برایە بەڕێزە بداتەوە و کردەوەکانی وەرگرێت و ئێمەو ئەویش لە سزای دواڕۆژ بپارێزێت شتێکی چاکی لەم بارەیەوە واتە یەکتاپەرستی لەم نوسینەیدا تۆمار کردووە ئەگەر چی ئێمە هەموومان مرۆڤین و لە هەڵە خاڵی نین (ئیشی بێ عەیب تەنها تایبەتی خوایە و کەسی تر) لە پاش خوێندنەوەمان بۆ هەر باسێك چیمان بە پێویست زانی بێ لە ئەندازەی زانیاری خۆمان لە کەم و زیاد و هێنانی بەڵگەو ڕێنمایی کۆتاییمان نەکردوە ئەمەش دیسان مانا نی‌یە کە ئیتر بێ‌عەیبە بەلاّم ئەبێ ئەوە بزانین هەرکەسێك بە دەرك و زانیاری و توانایی بێ دەربڕینی خۆی خوا داوای لێدەکات. گرنگ ئەوەیە کە برایان وخوشکانی خواناسمان چیان لە توانادایە و بە پێویستی دەزانن سەبارەت بە خزمەتکردنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام کۆتایی نەکەن و نی‌یەتی خۆیان پاك کەنەوە بۆ خوا و ئامادەی گوێ گرتنیش بن لە زانایان و بزانن: ﴿وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ﴾.

پێویستە بزانین ئینسان پێش هەموو کەسێك دینی بۆ خۆیەو دەیەوێ خۆی لە سزای دواڕۆژ ڕزگار بکات لەبەر ئەوەی دەبێ کام کردار و ووتار و نی‌یەت ڕاستر و پاکتر و بە بەلگەتر بێت و دواڕۆژ لە دادگای خوادا بێ بەلگە نی‌یە و دانامێنێ ئەوە بکات بە ڕێگا و ڕێبازی خۆی هەوڵی بۆ بدات و لە خۆیدا جێگیریان بکات و ئینجا بەخەڵکیشی ڕاگەیەنێت (داری لار سێبەری ڕاست نابێتەوە) خوایش دەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ كَبُرَ مَقْتًا عِنْدَ اللهِ أَنْ تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾.

جا کەواتە با هەموو برایان و خوشکانمان خۆیان زەحمەت بدەن و لە ناخی دڵیانەوە درەختی پەرستی «التوحید» بڕوێنن و هەمیشە خەریکی ئاوەدان و بە هێزکردنی بن بەخوێندنەوەی قورئان و فەرمووده ڕاستەکانی پێغەمبەری ئازیزمان (درودی خوای لێبێ) و سەرنجدان لە ڕەوشتە بەرزەکانی ئەو پێشەوا مەزنە کە ١٣ ساڵ تەمەنی پێغەمبەرایەتی لەسەر یەکتا پەرستی و ڕەوشت بەرزی بردەسەر.

بابرایان و خوشکانمان زیاتر لە یەکتاپەرستی (التوحید) سەرنج بدەن چونکە یەکتاپەرستی بنەی مرۆڤ لە دووبەرەکی و چەند پارچەیی و حزب حزبێنە ڕزگار ئەکات و ئەیکات بە لە فەرمودەکانی خوای کاربەجێ و زانا و لە هەڕەشەکانی ئەو زاتە خۆی دەپارێزێت چونکە ئەگەر بڵێ من خوا دەناسم بە چاکی و یەکتا پەرستم بەڵام چەند حیزبیەتم پێ ڕاستە لە کاتێکا کە خوا دەفەرمووی: ﴿وَلَاتَكُونُواْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ مِنَ الَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعًا﴾. وە دەیان ئایەتی تر.

زانینی تەوحید تەنیا ئەوە نییە بیزانین بەڵکو دەبێ کار بکاتە سەر ژیانمان و لە هەڵس و کەوتی ڕۆژانەماندا ڕەنگ بداتەوە و هەموو کردار و گوتارێك دەبێ یەکتاپەرستی تێدا ڕەچاو کرێت ئەگینا ئەو کردار و وتارە دوچاری پەتا دەبن و (قازانج سەری مایە دەخوات) وەکو لە فەرمودەیەکی قودسیدا هاتووە: ﴿أَنَا أَغْنَى الشُّرَكَاء عَنِ الشِّرْكِ﴾

مەبەستی شیرك لێرەدا خۆپیشاندان (الرياء)ە ئاشکرایە گرنگی هەموو شتێك بە گرنگی هەمیەتی هیچ شتێکیش بە ئەندازەی یەکتاپەرستی بەرهەمی گرنگی نابێت لەبەر ئەوە پێویستە برایان و خوشکانمان گرنگییەکی لەسنور بەدەر بەم گۆشەیە بدەن و منیش پێم وایە بەرهەمی ئەم برا عەزیزەمان سوودێکی گرنگی دەبێ بۆ ڕۆڵە خواناس و تازە پێگەیشتوەکانی کوردستان لەبەر ئەوە ئامۆژگاری منیش بۆیان ئەوەیە ئەم پەڕاوە تەماشاکەن و سوودی لێوەرگرن و منیش بەم تەمایییەم پاداشتم تەنها لە خوا دەوێ.

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته

١٠ رجب ١٤١٧

**عبد القادر تەوحیدی**

مەسیف سەڵاحەددین

# وتەی بەڕێز مامۆستا بەشیر:

الحمد لله رب العالمین، والصلاة والسلام علی امام المتقین وقائد الغر المحجلین نبینا (محمد) وعلی آله وصحبه ومن تبعهم باحسان الی یوم الدین.

اما بعد:

بێگومان بیروباوەر بەردی بناغەیە لە بوونی مرۆڤدا بە درێژایی مێژوو، مرۆڤ توانیویەتی بژی بەبێ پیشەسازی و کشت و کاڵ و بازرگانی و تەکنۆلۆژیا و بەبێ زۆر هۆیەکانی تازەی ژیان، بەڵام نەیتوانیوە بەبێ بیروباوەڕ بژی.

جا هەر کۆمەڵێك باوەڕیان بە شتێ هەبووە، هەندێك ئاگریان پەرستوە هەندێك دار و بەرد هەندێکی تریش ڕۆژ و مانگ و ئەستێرە، کەمێکیش بەهۆی پێغەمبەرانەوە (**علیهم الصلاة والسلام**) گەیشتوونەتە ڕاستەڕێ.

وە دۆزینەوەی ڕاستەڕێ لەم هەموو ڕێچکۆکانە، پێوستی بە هەوڵ و بە دوا گەڕان هەیە:

**﴿وان هذا صراطي مستقیما فاتبعوه ولا تتبعوا السبل فتفرق بکم عن سبیله ذلکم وصاکم به لعلکم تتقون﴾ الانعام ١٥٣.**

وە لەم پەڕتووکەی بەردەستمان کە کاتێ هێمن دایناوە بە ناونیشانی (**بیروباوەڕی ئیسلامی لە دوو توێی قورئان و سوننەتدا - ٣٠٠ پرسیار و وەڵام**) هەوڵی ئەوە دراوە کە بیروباوەڕی ئیسلامی بخرێتە ڕوو بە شێوەیەکی تازە و جوان و سەرنج ڕاکێشەر، ئەویش لە ڕێگای چەند پرسیار و وەڵامێکدا کە بێگومان شێوەیەکی سوود بەخشە. وە ئەم کتێبە شایەنی ئەوەیە کە بخوێندرێت و سوودی لێوەربگیرێت، هیواداریـن کـە دانەر توانیبێتی کەلێنێك لە پەرتوکخانەی ئیسلامی بە زمانی کوردی پڕبکاتەوە.

داواکارین لە خوای باڵا دەست و بە توانا کە بەم هەوڵ و ماندوو بوونەی برای دانەر تەرازووی چاکەکانی گرانتربێت لە ڕۆژی قیامەت.

تەوفیقیش هەر لەخواوەیە.

والسلام علیکم ورحمة الله وبرکاته

**م/ بشیر خلیل الحداد**

ووتارخوێنی

مزگەوتی: حاجی حسن بزاز// هەولێر

**٢٤جماد الاخرة ١٤١٧**

تشرینی دووەم ١٩٩٦

# پێشەکی[1]

یان

# لاباسێکی گرنگ

**الحمد لله رب العالمین والصلاة والسلام علی رسوله (محمد) وعلی اله وصحبه اجمعین.**

خوای بە تواناو کاربەجێ لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێ: ﴿أَفَغَيْرَ دِينِ اللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُ أَسْلَمَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ﴾ آل عمران ٨٣.

واتە: ئایا (بێبڕوایان) داوای دینی غەیری خوا دەکەن لە کاتێکا کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە ملکەچی خوان وە هەمووش بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە.

کەواتە غەیری ئایین و بەرنامەی خوا هیچ بەرنامەیەکی تر بە کەڵکی مرۆڤایەتی نایەت و خەڵکی پێی بەختەوەر نابێ، چونکە هەر ئایینی خوایە خەڵکی لە لارولەوێری و نەگبەتیو داماوی ڕزگار دەکات، بە پێچەوانەوە غەیری شەریعەتی خوا ناتوانێ خەڵکی بەختەوەرکاو لە قوڕولیتەیان دەربهێنێ.. چونکە ئایینی خوا قەناعەت بۆ خەڵکی دروست دەکا و ڕێگای ڕاستیان بۆ ڕوون دەکات بەڵکو وای لێدەکات لە سەنگەری بیروباوەڕ نەبێ هەنگاو بۆ هیچ شتێك هەڵنەیەنێ چونکە بەختیاری لە بیروباوەڕەوە هەڵدەقوڵێ.

کەواتە بیروباوەڕ دەماغی هەڵس و کەوتە، گەر هەر کەم و کوڕیەك ڕوویکاتە ئەم دەماغە ئەوا بێشك ئاژاوەیەکی گەورە بەرپادەبێ و خاوەنەکەی دووچاری قات و قوڕی و سەریەشەکی ئەوتۆ دەبێت کە هەرگیز لێی دەرنەچێ. هەر بۆیە ئایینە ئاسمانییەکانی خوا بە گشتی و قورئانی پیرۆز کە تاکە بەرنامەی ڕاستەقینەی (إنس و جن)ە بەتایبەتی بایەخ بە چەسپاندنی بیروباوەڕدەدات، بەڵکو گشت سورەتەکانی قورئان بە (مکي و مدني) یەوەپشتێنی بیروباوەڕی ئیسلامییە بە کەمەری مرۆڤ و پەیوەستکردنیەتی بە پەروەردگارەوە، ئەویش بنچینە و بناغەی ئەم ئایینەیە کە بەبێ ئەو بەرپابوونی مەحاڵە. بەتایبەت سورەتە مەکییەکان کە کاری سەرەکی پەروەردەکردنی مرۆڤ بووە لەسەر بنچینەی بیروباوەڕی ئیسلامییەوە. ناوك و کرۆکی ئەم ئایینەش لە سەر (٣) بنچینەی سەرەکییەوە دەوەستێت کە بریتین لە:

١- هەقیقەتی خوایەتی خوا.

٢- هەقیقەتی بەندایەتی بۆ پەروەردگار.

٣- پەیوەندی نێوان بەندەو پەروەردگاری.

ئەم سێ هەقیقەتە حەتمییە دەبێ لە دڵ و دەروون دروست بێ و وەك چرا لە مێشك و دڵی مرۆڤا داگیرسێ و لە زمان و دەستیش ڕەنگ داتەوە.

---

[1] پێشەکی چاپی یەکەمی ئەم کتێبە هێندێ هەڵەی تێکەوتبوو، وا لێرە دا سەر لە نوێ بە شێوەیەکی تر دام ڕشتەوە.

بـه دواکـەوتنی ئـەم ئاینـەش دەبـێ تێکـڕای دینەکـه وەك خـۆی وەربگـیرێ و پـیاوی هـەموو مەیدانەکانی بیت، نەك بە تەنها مەجبووری چەند لایەنەکی‌یەوە بیت.

بۆیە پێم وایە کارێکی نارەوا و ناپەسندە کە بەتەنها دوای لق و پۆپەکانی ئەم ئایینە بکەویت و لێت بێ بە هەموو دین، چونکە بەم جۆرە دید و بۆچوونە مەحالە پێ‌یەوە لە شەریعەتی خـوا حـاڵی بیی و مشتێك حەقیقەتی تەواوی لێ هەڵرێژی.

ئەم خەڵکە کە بە تەنها دوای برێکی نەك تێکڕای ئەم ئایینـە کـەوتووە هەقیقـەتی ئـەم دینـەی لێ وون بووە. دەتوانم بڵێم هەڵوێستی ئەم جۆرە کسانە وەك ئەو پیاوە کوێرە وایە کە دەستی بە قاچی فیل کەوتبوو وای دەزانی کە فیل بـە تـەنها ئەوەندەیـە!! کـاتێکیش کـە لێی دەپرسـی فیـل چۆنـە؟ دەڵێت فیل وەك ئەستونگەیەکی درێژ وایەو بەقیتی لەزەویدا چەقیوە؟! ئەگـەر کـاتێك لێی وەدەنـگ بێ و پێی بڵێ کابرای بێ چاوی بـەر پـیواری هیـچ نـەزان، چ خـوا قـەبوڵ دەکـات لـە شـکل و ڕەنگ و حەجم و سەنگی فیل بـەم جـۆرە کـەم کەیتـەوە، ئـاخر وورگ و بیچمـی زەبـەلاحی فیـل لەکوێ کۆلکە دارێکی ڕەق و تەقی ووشك لـە کوێ؟ بـەلاّم ئـەو لـە کـەری شـەیتان نایەتـە خـوار (بشفری هەر بزنە) و لە قسەی خۆی دانابەزێ.

بـەم جـۆرە وادەزانم بایـەخ دان بەچـەند بابـەتێك لەشـەریعەتی خـواو پاشـان هەڵســەنگاندنی بەعەقڵەوە، والەم ئینسانە دەکات کەگومانی خراپ بەپەروەردگاری ببـات، تـاوای لێدێـت پـەل بـۆ بوون (وجود) ی خواش باوێت؟!!

بۆیە کارێکی غەیرە (منطقي) یە کە مشت ومڕ لەسەر چەند بابەتێك دروست کەیت وخۆتـی لێبکەیت بەچاوساغ ودەم ڕاستی کارەکـە کـەچی بابەتەکـە خـۆی لـەخۆی دا جێگـای مشـت ومـڕ نـەبێ. تەنانـەت هـی‌وا هەیـە دەمـەقاڵی یـان لەسـەر چـەند بابـەتێکی (اصـول) ی هەڵگیرسـاندووە کەئیمامە بەڕێزەکان هەر لەزووەوە بەپێی بەڵگەی قورئـان وسـوننەت براندویانەتـەوە... بـۆ نموونـە لەمەڕ ئایەتی ﴿الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى﴾ گوتەی ئیمـام (مـالك) دەهێننـەوە کەدەفـەرمووێ: (الاستواء معلوم والكيف مجهول والايمان به واجب والسؤال عنه بدعة) واتە: بوونی خـوا لەسـەر عەرش زانراوە، چۆنیەتەکەی نادیارە، پێویستە باوەڕت پێی هەبێ وپرسیار لێکردنیشی بیدعەیە.

کەچی لەسـەنگەری ئـەم گوتـە بـەڕێزە سـەر دەکـەن بەچۆنیـەتی (اسـتواء) کـەو (تـأويل) ی نابـەجێی بۆدەکـەن و دەڵێـن : نـابێ خـوا لەسـەر عـەرش بـێ، گوایـە خـوا لەسـەر عـەرش بوون وێکچواندنە بەدروست کراوەکانی بۆیە (تأويل) ی دەکەن.. بەڵام نازانن (تأويل) کردنەکەیان خۆی لەخۆی دا بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە بۆ خۆیان باوەڕیان بەوێکچواندنی سیفەتەکانی خوا هەیـە بە دروست کراوەکانی ئەنا (تأويل)ی ناکەن.بەڵام لە هەقیقەت دا هیـچ کـام لـە سـیفەتەکانی خـوا (تشبيه) نین تا پێویستی‌یان بە (تأويل) هەبێ.

دەی ئەگەر ماناو واتای ئەم ئایەتەش بەقەولی خۆیـان دیـار نـەبێ، ئـەوەتا فـەرموودەی لەمەڕ کەنیزەکـە زۆر بەئاشـکراو بـەبێ (تـأويل) دەبێـژێ خـوا لــە ئاسمانــە.. کەواتــە ئەومشــت ومــڕو خوارکردنەوەی بۆ چی‌یە؟

ئەنجامی تەنها سەرقاڵ بوونیش بەم کارە ناجوامێرانەیە کە ڕۆڵە ساواکانیشـیان پـەللاری کوێـر دەوەشێنن وجووراوی مامۆستاکانیان؟!!! بێ سێ‌و دوو کاوێژ دەکەن !!

ئەوەتا هی وا هەن بوون بە دەست کـەلای چـەند چـاو تـەنگێك بەتایبـەت ئەوانـەی دژ ئاسـا ڕقیان لە لامپایە و دژی تیشکی خۆری ڕاستەقینەن. ئەوەتا شـەووڕۆژ سـەرگەرمی جوێـن دانـن بـە زانایانی هاوچەرخ !! بەتایبەت ئەوانەی بوژێنەرەوەی بیروباوەڕی ڕاستەقینەی ئیسلامی بوو ون لـەم سەدەی بیستەمەدا. کەیەك لەوانـە مامۆسـتای بـەڕێز (**محمـد نـاصرالدین الالبـانی**) یـە کـە خـاوەنی کتێبی(سلسلة الاحادیث الضعیفة والموضوعة و أثرها السيء في الأمة) یە، بەتۆمەتی ئەوەی کەگوایـە ئێمە دژی مەزهەبی ئیمامە بەڕێزەکانین، بەتایبەت مەزهەبی ئیمام (**الشافعي**) بەڕەحمەت بـێ بـەڵام نازانن ئەمە پیشەی ئێمەنی‌یە، بەڵکو ئەمە کرمێکی خۆیانە کەوتۆتە نیـو ڕەگ و ڕیشـاڵی خۆیـان.. بەڵکو جوێن دان بە ئیمامەکان پیشەی کەسێکە کە جوێن دان بداتە پاڵ خواو پێی وابێ کـە خـوا جوێن بە بەندەکانی خۆی دەدات؟

بۆیە من زۆر بە ڕاشکاوی ڕوو لە شاگردەکانی ئـەم جـۆرە ئاخوندانـە دەکـەم و دەڵێـم ئـەوەی دەرگای ماڵی دزیون کرمێکی ڕەش و تاریکە؟ باچیتر دەرگای مزگەوت هەڵنەقەنێنن؟ چونکە ئێمـە پێمان وایە خواردنی گۆشتی زانایان خواردنی گۆشتێکی ژەهراویە. بەڵکو شانازی‌یە بـۆ ئێمـە کـە کەڵە پیاونکی وەك ئیمام شافعی لەسەدەی سەلەف دا ژیا بێ، بۆیە لامان شەرم نی‌یە ئەگەر قوتابی ئەم زاتە بەڕێزە بین، چونکە پێمان وایە کە خوای پەروەردگار پلەی زانایانی هێندە بـەرز کردۆتـەوە بۆیە لەڕیزی فریشتەکانی خۆی حسێبیان بۆ دەکات.. ئەوەتا لە ئایەتی ﴿**شهد الله انه لا اله الا هو والملائكة واولوا العلم قائما بالقسط لا اله الا هو العزيز الحكيم**﴾ آل عمـران ١٨، زۆر بەجوانی ئەم ڕاستیە دەردەکەوێ، بۆ یە وادەزانم ڕێز گرتنمان لە ئیمامەکان (**اقتداء**) کردنە بە ئیمام (**احمد**) لەڕیز گرتنی ئیمامی (**شافعی**) دا (ڕەحمەتی خوایان لێبێ) ، ئەوەتا دەگێڕنەوە کەوا ڕۆژێـك ئیمام شافعی بەسەر (گـوێ درێـژ)ێکـەوە بـوو ئیمـام (**احمـد**) لـە گـەڵ هاوڕێیـەکی خـۆی چـاوی دەکەوێت بە ئیمام (**شافعي**)، دەچێتە لای و پرسیاری لێدەکات و ئەویش وەڵامـی دەداتـەوە لەگـەڵ ئەوەش ئیمام (**شافعي**) هەر هەچە هەچەیەتی و ئیمام (**احمد**)یش بە دواوەیەتی، دوایـی هاوڕێکـەی ئیمام (**احمد**) پێی دەڵێ یا ئیمام ئەوە کەسێکی تـر نـەبوو پرسـیاری لێبکـەیت و ئـەوە ئـەم گەنجـە بەسەر گوێدرێژەکەیەوە و تۆ پرسیاری لێدەکەیت؟ ئیمام (**احمد**)یش وەڵام دەداتەوە و دەڵێ ئـەوە تـۆ چی دەڵێیت؟ هەر قسەیەك لە زمانی ئیمـام (**شـافعي**) دەردەچـێ خەسـارەتمەندە ئـەوەی نەیبیسـتێ؟! ئەمە هەڵوێستی ڕەسەنی ئیسـلامەتی‌یە بەرامبەر بە زانایانی ئیسلامی بۆیە هیـوام وایـە ئێوانـەی کـە جڵەوی ئەم مشـت ومڕەیـان بەدەسـتە بـا سـەنگەری خۆیـان لـە بەرامبـەر شـەیتان و (**اتبـاع**)ەکـەی لێبدەن و بەڕێزەوە کاری هەڵەی یەکتر چابکەن نەك بە جوێندان وبەقسەی تاڵ، ئایینیش بـە هـەموو لق و پۆپەکانی‌یەوە ئەهلی پسپۆڕی خۆی گەرەکـە مـەرج نی‌یـە بـە تـەنها یـەکێك هـەموو ئـایینت تێبگەیەنێ، من پێم وایە بابەتی بیروباوەڕ لەکەسێك وەردەگیرێ کە ئەهلی مشت ومڕ نـەبێ دوای شارەزا بوون لە قورئان و چاك فەرمووده بەڕێزەکانی پێغەمبـەر ﷺ لێـك هـەڵاوێرێ و تـاوو تـوێی بکات و (**صحیح**) و (**ضعیف**) و (**موضوع**)...هتد لێك جیاکاتەوە، هەروەك وەرگرتنی شەریعەت و فیقهی ئیسلامی بە ئەدەبەوە لەسەر ئەژنۆ دانیشێ لای مامۆسـتایەك بخوێنـێ ئـەو دەمـە کـەس نـاڵێ کابرای لەم لا ڕاهاتوو ئەوەی تۆ باست کرد دین نەبوو. ڕۆڵەی تازە ڕابـووش لێـك هەڵناقۆزنـەوە و

جوێن بەم و بەو بدەن. بەتایبەت جوێندان بە ئیمامەکان. چونکە ئەمانەی کە بە ئیمام ناسراون لە هەر بەرەیەکەوە بن، (**معصوم**) نین ڕەنگە هەڵەشیان بووبێ بەڵام هەر کام لە ئیمامەکان ئەگەر سەرنجیان بدرێت فەزڵی زۆریان هەیە بەسەر مسوڵمانان و هەر یەك لە ڕوویەکەوە ئەسپی خۆی تاوداوە، ئینجا ڕەخنەکانیشمان با مەوزووعیانە و لە دڵ و دەروونێکی پاکەوە دەربچێ چونکە ڕەخنە لە خۆ (**النقد الذاتي**) بە کارێکی پیرۆز دەزانم، بەڵام بە مەرجێ مەرجی ڕەخنەیی تیا هەبێ نەك لێمان ببێتە کارێکی شەخصی، بە کورتی دەبێ وەك ئاوێنە ئاسا ڕووی هەقیقەت وەك خۆی نیشان بدەین بەبێ بریندارکردن، ئەم قسانەش کە دەکەم خوێنەری سەنگین و خۆشەویست ئاگادار دەکەمەوە کەمن پاساو بۆ هەڵەی هیچ کەسێك ناهێنمەوە، هەڵەش لە شوێنی خۆی هەر هەڵەیە، ئایین و بەرنامەی خواش وەك مانگی چواردە ڕوون و ڕووناکەو، حەوجێش بە پەنجە جولانێ ناکات، ئەوەی لێشم پەسند ناکات مەیدانی قسان لەبارە و دەتوانێ لە (ڕووم)ا هەڵبڕێژێ.

**﴿هذا بلاغ للناس ولينذروا به وليعلموا انما هو اله واحد وليذكر اولوا الالباب﴾** ابراهيم٥٢.

**هێمن عبد العزیز**

هەولێر ـ خەبات

٨ ذي القعدة ١٤١٧

١٧ئـــازار ١٩٩٦

# ڕێخۆشکردن

ئەم کتێبەی بەردەستت پێك هاتووە لە (٣٠٠) پرسیار و وەڵام دەربارەی بیروباوەڕی ئیسلامی، کە ئەم باسانەی خوارەوەی بەخۆوە گرتووە.

١. بیروباوەڕو ئەو شتانەی کە دەبێ مسوڵمان بیزانێ.
٢. ئیسلام و بەشەکانی.
٣. یەکخواناسی و هەقیقەتی باوەڕ.
٤. بەندایەتی و بەشەکانی.
٥. ﴿لا اله الا الله﴾ و بەشەکانی و دژەکانی.
٦. دۆستایەتی و دوژمنایەتی و بەشەکانی.
٧. حاکمیەتی خوا.
٨. تێکۆشان لە ڕێگای خوا.
٩. باوەڕ بە فریشتەکان.
١٠.هەقیقەتی جنۆکە و شەیتان.
١١.باوەڕ بەکتێبەکان.
١٢.باوەڕ بە پێغەمبەران (**علیهم الصلاة والسلام**).
١٣.باوەڕ بە ڕۆژی دوایی.
١٤.باوەڕ بە قەزا و قەدەر.
١٥.پێناسەی سەلەف و بانگەوازی سەلەفی.

هەرکام لەم باسانەی سەرەوە بە بەڵگەی قورئان و سوننەت بە تیروتەسەلی توێژراوەتەوە، قسەی خۆم تێنەخستووە بۆ زیاتر بەرچاو ڕوون بوون و شارەزابوونیش لە باسەکانی ئەم کتێبە دەتوانن بەدوای سەرچاوەکاندا بگەڕێن و زیاتر هەزمی بکەن..

ناشڵێم هەرچی دەربارەی بیروباوەڕ هاتووە نووسیومە. بەڵام دەڵێم تا ڕاددەیەکی چاك گرنگترین باس و لێکۆڵینەوەی بەخۆوە گرتووە کە زۆر لە مسوڵمانان تائێستا بە چاکی لێی نەگەیشتوون.. چونکە تا ئێستا کتێبێکی ئاوا بە زمانی کوردی نەنوسراوە، بۆیە بەهیوای ئەوەم گرنگترین کەلێنی لە بەرنامەی پێگەیاندن و فێرکردنی بیروباوەڕی ئیسلامی پڕکردبێتەوە بۆ پێگەیاندنی لاوە ئیسلامی‌یەکانی تازەڕابوو.

تکاشم وایە کە هەر کەم وکوڕی‌یەك لەم کتێبە بەدی کرا یان لەگەڵ دیدی هێندێ کەس نەگونجا نەم دەنە بەر تانە و تەشەری خۆیان تا لە ئاکام ڕۆڵە ساواکانیشمان بەبێ‌ئاگا ناومان بزڕێنن.. چونکە پاکی و بێ لەکەیی هەر بۆ خوا دەشێ و ئێمەی لاوازیش خاوەن هەڵەوپەڵەی خۆمانین.

بەکورتی دەڵێم وەك ئیمام (علي) ڕەزای خوای لێبێ دەڵێ: **قسەی باش وەرگرە و گوێ مەدە کێ گوتوویەتی..**

**دەتۆش بیخوێنەوە، وەردی دەوە، وردی کەوە، لێی ورد بەوە، ئەگەر بەهرەی پێگەیاندی و شتی باشی تێگەیاندی، ماڵی نووسەر سەد جار ئاوا، دەنا زوو لێی گەڕێ و باسی مەکە و کەسمان لەکەس.**

❁ ❁ ❁

# بەشی یەکەم

# بیروباوەڕو ئەو شتانەی کە دەبێ مسوڵمان بیزانێ

## پ١/ بیروباوەڕ (عەقیدە) مانای چی‌یە؟

و: زاراوەی (**عقيدة**) لە بنچینەوە بە مانای (**عقدة**) دێت واتە (گرێ) مەبەست لە گرێش ئەوەیە کە خوای پەروەردگار وای لە بەندەکانی خۆی دەوێ کە بە جۆرێك پەیوەست بن لە گەڵ ئایین و بەرنامەکەی خۆی کە وەکو گرێیەك پێیەوە قایم بن و لێی جیا نەبنەوە. بۆیە گەر بینرا کسێك نوێژ ناکات یان ڕۆژوو ناگرێت یان خوانەناسە ئەوا خۆی لەگەڵ بەرنامەی خوا شل کردۆتەوە تاوەکو بە تەواوی لێی جیا دەبێتەوە وەکو چۆن دوو پەڕۆی لێك گرێدراو لە ئەنجامی شل بوونی (گرێ)کە لێك جیا دەبنەوە...

هەروەها (**عقدة**) بە مانای (**العهد الموثوق**) دێ واتە: پەیمانێکی پتەو یان بەمانای (**البيع**) دێت واتە (فرۆشتن) بۆیە خوا وای لە بەندەکانی دەوێ کە پەیمان بدات لەسەر ئەوە کە خۆی بۆ خوا بفرۆشێت لە بریتی ئەوە بەهەشتی پێبدات وەك دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشْتَرَىٰ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلْجَنَّةَ﴾ التوبة ١١١. واتە: خوا گیان وماڵی لە بڕواداران کڕیوە لە بریتی ئەوە بەهەشتیان پێ دەبەخشێ.

## پ٢/ گرنگی بیروباوەڕ چی‌یە لە ژیانی ئادەمیزاددا؟

و:

١) بۆ ئەوەی خەڵکی نیەت پاك بن و بێ کینە و غەرەز بن تاوەکو بتوانن بە چاکی خوای خۆیان بپەرستن کە حەتمەن بۆ ئەوەش خولقێنراون.

٢) ڕزگارکردنی بیروژیر (**الفكر والعقل**) لە بیروباوەڕی تێك چرژاوو گەنیوی بێگانە کە هیچ کات مشوری کێشەکانی مرۆڤایەتی نەبوون و خەڵکیان زیاتر بەرەو چاڵ و نەفامی و دوواکەوتوویی بردووە.

٣) ئۆخژن و شادمانی دەدات بە دەروونی ئادەمیزاد هەروەك خوا دەفەرمووێ: ﴿أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ﴾ الرعد ٢٨. واتە: بەیادی خوا دڵان ئۆقرە گیردەبن.

٤) پاراستنی مەبەست و گوفتاری ڕاستەقینە لە هەڵدێر و کەندەرانی کوێرەوەریی و تاریکی، واتە لە ڕێگەی بیروباوەڕی ئیسلامی‌یەوە خوا پەرستی‌یەکەمان دووچاری کز بوون و سست بوون نایەت..

---

١) پ - پرسیار

٢) و - وەڵام

٥) خاوەنی بڕیار و حەزم و جەزم دەبین: واتە: بڕیار و هێز و توانامان لە دەست خۆ دەبێ و بە دەستی خۆمان پشتی خۆمان دەخورێنین پێغەمبەری نازداریش ﷺ دەفەرمووێ: ﴿الْمُؤْمِنُ الْقَوِيُّ خَيْرٌ وأَحَبُّ إِلى ا للهِ مِنَ الْمُؤْمِنِ الضَّعِيفِ﴾ مسلم. واتە: بڕواداری بە هێزو توانا لە لای خوا چاکتر و خۆشەویست ترە لە بڕوادارێکی بێ توانا.

٦) ئوممەتێکی داڕێژراو و پتەوی لەسەر بنیات دەنرێ کە توانای هەموو شتێکی هەبێ بە جۆرێك دوژمن نەتوانێ زەفەری پێ‌بیات، هەر حکومەتێك گەر لەسەر بنچینەی باوەڕ بەخوا بوون و بیروباوەڕێکی ڕاستەقینە دانەمەزرێ ڕۆژێك دێت بڕوخێ گەلانی پێشووی وەك (فرعون) و (کیسرا) و (هرقل) و (هتلر) و (هۆلاکو) و...هتد چاکترین بەڵگەن بۆ ئەم ڕاستی‌یە...

(صلاح الدين الايوبي)یش بە ئیسلام توانی (قدس) ڕزگار بکات بەڵام نەوەکانی دوای ئەو پشتیان لە ئیسلام کرد بۆیە (قدس) داگیر کرایەوە...

٧) گەیشتن بە خۆش بەختی و کامەرانی دنیا و دوارۆژ، ئەویش بە چاك کردنی کۆڕ و کۆمەڵ لەسەر بنچینەی بیروباوەڕی ئیسلامی‌یەوە دەبێ...

٨) بۆ وەڵام دانەوەی پرسیارە نەمرەکان (الاسئلة الخالدة) کە بریتین لەم پرسیارە: (لە کوێ هاتووی؟ بۆچی هاتووی؟ بۆ کێ دەچیت؟)[1]

## پ٣/ ئەو شتانە چین کە دەبێ مسوڵمان بیان زانێ؟

و: چوار شت هەن کە دەبێ هەموو مسوڵمانێك بیان زانێ:

١) سێ بنچینەکە کە ئینسان دەبێ بیزانێ ئەویش بریتین لە ناسینی (خوا و پێغەمبەر ﷺ و ئایینی ئیسلام بە بەڵگەوە) هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿ذَاقَ طَعْمَ الإِيمانِ مَنْ رَضِيَ بِا للهِ رَبًّا، وبِالإِسْلامِ دِيناً وبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً ﷺ﴾ مسلم. واتە: تامی باوەڕی چەشتووە ئەو کەسەی ڕازی بێ بەوەی خوا پەروەردگاری بێ‌و ئیسلام ئایین و بەرنامەی بێ‌و محمد ﷺ پێغەمبەر و سەرقافڵەی بێ.

٢) کار پێ‌کردن بەو سێ بنچینەیە دوای ناسینیان.

٣) بانگەواز بۆ کردنیان.

٤) ئارام گرتن لەسەر ئەو پەرچ و ئازارانەی کە هاوشان لەگەڵ بانگەوازی‌یەکە دێتە ڕێ‌ی.

خوای گەورە بەڵگە بۆ هەر چواران دەهێنێتەوە و دەفەرمووێ: ﴿وَالْعَصْرِ إِنَّ الإِنْسَانَ لَفِي خُسْرٍ، إِلاَّ الَّذِينَ آمَنُوا وعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾ العصر. واتە: سوێند بە زەمانە ئینسان بە گشتی لە دۆڕان دایە، مەگەر ئەوانەی کە بڕوایان هێنابێ و

[1] هەروەك (إيليا ابو ماضي) شاعیر دەڵێ: (جئت لا أدري من أين ولكني أتيت ...) واتە: هاتووم و نازانم لە کوێوە هاتووە بەڵام دیارە کە هاتووم.

کردەوەباشەکانیان کردبێ و ئامۆژگاری یەکتریان کردبێ بە ئاییینی ڕاست و ئامۆژگاری یەکتریان کردبێ بە خۆڕاگرتن.

## پ٤/ خوای خۆت بەچی ناسیوە؟

و: خوای خۆم بە نیشانەکان و دروست کراوەکان و گۆڕینی شەوو ڕۆژ...هتد ناسیوە، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ لَا تَسْجُدُوا لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَاسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَهُنَّ إِنْ كُنْتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾ فصلت ٣٧. واتە: نیشانەکانی خوا بریتین لە شەو و ڕۆژو خۆرو مانگ، (کەواتە) ئێوە سوژدە نە بۆ خۆر و نە بۆ مانگ ببەن (بەڵکو) سوژدە بۆ ئەو خوایە ببەن کە ئەوانەی دروست کردووە ئەگەر بەس ئەو دەپەرستن، یان دەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ، الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ فِرَاشًا وَالسَّمَاءَ بِنَاءً وَأَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقًا لَكُمْ فَلَا تَجْعَلُوا لِلَّهِ أَنْدَادًا وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ البقرة ٢١،٢٢ واتە: ئەی خەڵکینە پەروەردگارتان بپەرستن (ئەو پەروەردگارەی) ئێوە و ئەوانەی پێش ئێوەشی دروست کردووە بەڵکو (بەو پەرستنە) خۆتان بپارێزن (لەبێ فەرمانی) ئەو خوایەی کە زەوی بۆ ڕاخستوون و ئاسمانی بۆ کردوون بە کۆشك و ئاوی بارانی دارشتووە لە ئاسمانەوە، ئینجا بەو ئاوە هەموو جۆرە میوەیەکی بۆ ڕۆزی ئێوە دەرهێنا، کەواتە هاوتای بۆ پەیدا مەکەن و ئێوە خۆتان دەزانن (کە بێ هاوتایە).

(ابن کثیر) بەرەحمەت بێ دەڵێ: دروست کەری ئەم شتانە خۆی شیاوی پەرستنە.

## پ٥/ ئایین (دین) چی‌یە؟

و: ووشەی (دین) لە زمانی عەرەبی بە زۆر مانا دێت لەوانە:

١) سەرکۆنەکردن و دەسەڵات و حوکم ڕانیتی: هەروەك دەڵێن (دَانَ النَّاسَ) واتە: واتە زۆریان لێ‌کردن تا بە گوێیان بکەن. یان (دنتهم فدانوا) واتە سەرکۆنەیان کردن و ئەوانیش بە گوێیان کردن.

٢) گوێ ڕایەڵی و مل پێ کەچ کردنیان بۆ حاکمیەتی خوا، هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿أُرِيدُ مِنْ قُرَيْشٍ كَلِمَةً تَدِينُ بِهَا الْعَرَبُ﴾. واتە: قسەیەکم لە قوڕیشی‌یەکان دەوێ تاوەکو ملی عەرەبەکانی پێ کەچ بکەن. یان لە باسی (خوارج)دا دەڵێن: ﴿يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ مُرُوقَ السَّهْمِ مِنَ الرَّمِيَّةِ﴾. واتە: لە گوێ ڕایەڵی دین دەردەچن هەروەك تیر لە کەوان دەردەچێ. خوای گەورەش بۆ هەردوو خاڵی ڕابردوو دەفەرمووێ: ﴿قُلْ إِنِّي أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ اللَّهَ مُخْلِصًا لَهُ الدِّينَ، وَأُمِرْتُ لِأَنْ أَكُونَ أَوَّلَ الْمُسْلِمِينَ﴾ الزمر ١١-١٢. واتە: بڵێ من فەرمانم پێ‌کراوە کەوا بەس خوا بپەرستم و حوکمڕانیتی و گوێڕایەڵی بە تەنها بۆ ئەو بکەم، وە فەرمانیشم پێ‌کراوە کەوا یەکەمینی موسڵمانان بم.

٣) شەریعەت و یاسا و مەزهەب و داب و نەریت.٪. هەروەك دەڵێن: (مَازَالَ ذَلِكَ دِينِي وَدَيْدَنِي) واتە: بەردەوام ئەوە داب و نەریتی منە. یان خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿كَذَلِكَ كِدْنَا لِيُوسُفَ مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ الْمَلِكِ﴾ یوسف ٧٦. واتە: ئا بەو شێوەیە تەگبیرمان بۆ یوسف کرد (چونکە بەپێی سیستەم و دەستور و یاسای حکومەتی میسر) نەیدەتوانی براکەی بهێنێتەوە لای خۆی...

٤) پاداشت و تۆڵەو لێ پێچینەوە، هەروەك کافرەکان دەڵێن: ﴿أَإِنَّا لَمَدِينُونَ؟﴾ الصافات ٥٣. واتە: ئایا ئێمە لێمان دەپێچرێتەوە؟ یان دەڵێن: (إِنَّهُ كَانَ دَيَّانَ هَذِهِ الأُمَّةِ بَعْدَ نَبِيِّهَا). واتە: ئەم پیاوە قازی و حاکمی دادگای ئەم وولاتەیە لە دوای پێغەمبەرەکەیان. خوای گەورەش لە قورئاندا دەفەرمووێ: ﴿أَرَأَيْتَ الَّذِي يُكَذِّبُ بِالدِّينِ﴾ الماعون ١. واتە: ئایا ئەو کەسەت نەبینی کە بڕوای بە لێپرسینەوەی ڕۆژی دوایی نی یە؟

کەواتە: بە پێی ئەم چوارخاڵەی سەرەوە دەتوانین بڵێین:

(**دین**): ئەو دەستوورو یاساو ڕێسایەیە کە دەبێ لە ژیاندا کاری پێ بکرێ و ملی بۆ کەچ بکرێ و گوێ ڕایەڵی گشت ماددەو دەقەکانی ئەم دەستورە بکرێ و دەبێ چاوەڕێی پاداشت و سزای ڕۆژی دوایش بن لەسەر جێبەجێ کردن و جێبەجێ نەکردنی ئەم دەستوورە. چاکترین و پوخت و ڕێکترین ئایینیش لە لای خوا ئایینی ئیسلامە، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللهِ الإِسْلامُ﴾ آل عمران ١٩. واتە: ئایینی ڕاست و دروست لای خوا هەر ئیسلامە. یان دەفەرمووێ: ﴿وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلامِ دِيناً فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ﴾ آل عمران ٨٥. واتە: هەرکەسێك غەیری ئایینی ئیسلام هەڵبژێرێت و بیکات بە ئایینی خۆی ئەوا لێی وەرناگیرێ و بەسەریدا ئەدرێتەوە. پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرمووێ: (**وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لايَسْمَعُ بِي أَحَدٌ مِنْ هَذِهِ الأُمَّةِ يَهُودِيٌّ ولانَصْرَانِيٌّ ثُمَّ لَمْ يُؤْمِنْ بِالَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ إِلاَّ كَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ**) أخرجه مسلم. واتە: سوێند بەو خوایەی کە گیانی منی بەدەستە هیچ کەسێك ناوی من نابیسێت لەم ئوممەتە گاور بێ یان دیان، لە پاشدا باوەڕ بەو ئایینە نەهێنێ کە من بۆی هاتووم بێ گومان دەبێ بە هاوڕێ و هاودەمی دۆزەخی یەکان (و هەتا هەتایە لە نێو ئاگر دەمێنێتەوە).

## پوختەی قسان:

ئایینی ئیسلام ئایینی گشت پێغەمبەران (**علیهم الصلاة والسلام**) و پیاو چاکان بوو، ئەوەتا (نوح) پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿أُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾. واتە: فەرمانم پێکراوە کەوا لە موسوڵمانان بم، یان (ابراهیم واسماعیل) **علیهم الصلاة والسلام** دەفەرموون: ﴿رَبَّنا واجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ﴾. واتە: ئەی پەروەردگارمان وامان لێبکە کە تەسلیمی تۆ بین. یان (موسى) ﷺ دەفەرمووێ: ﴿فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوا إِنْ كُنتُمْ مُسْلِمِينَ﴾. واتە: پشتی خۆتان بە خوا ببەستن ئەگەر ئێوە موسوڵمانن. یان (یوسف) ﷺ دەفەرمووێ: ﴿تَوَفَّنِي مُسْلِماً وأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ﴾. واتە: بە موسوڵمانیم بمرێنە و بمخەرە کاروانی پیاو چاکان...هتد.

## پ٦/ بەشەکانی دین یان ڕوکنەکانی دین چین؟

و: دین لە سێ بەش پێك دێت کە بریتین لە:

١) **ئیسلام**: هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ:(الإِسْلاَمُ اَنْ تَشْهَدَ اَنْ لاَاِلَهَ اِلاَّ اللَّهَ واَنَّ مُحَمَّداً رَسُوْلُ ا للهِ وتُقِيمَ الصَّلاَةَ وتُؤْتِيَ الزَّكاةَ وتَصُومَ رَمَضَانَ وتَحُجَّ الْبَيْتَ اِنِ اسْتَطَعْتَ اِلَيهِ سَبِيلاً) رواه مسلم، واتە: ئیسلام ئەوەیە کە دان بنێیت بەوە کە غەیری خوا کەسی تر شیاوی پەرستن نی‌یە و (محمد) یش نێردراوی خوایە، وە نوێژ بەرپا بکەیت و زەکاتێ بدەیت و ڕۆژووی ڕەمەزان بگریت و حەج بکەیت ئەگەر توانات هەبوو.هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ ا للهِ الإِسْلاَمُ﴾ آل عمران ١٩. واتە: ئاییني ڕاستە قینە لە لای خوا ئیسلامە.

٢) **ئیمان**: هەروەك پێغەمبەر خوا ﷺ لە وەڵامی (جوبرائیل) عليه السلام کە لەسەر شێوەی عارەبێکی خێلەکی هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و پرسیاری لێ‌کرد دەربارەی ئیمان ئەویش فەرمووی: ﴿الإيمانُ أَنْ تُؤْمِنَ با للهِ ومَلاَئِكَتِهِ وكُتُبِهِ ورسُلِهِ واليَوْمِ الآخِرِ وتُؤْمِنَ بالْقَدَرِ خَيْرِهِ وشَرِّهِ﴾ رواه مسلم عن عمر بن الخطاب. واتە: ئیمان بریتی‌یە: لە باوەڕهێنان بە خواو بە فریشتەکان و بە کتێبە ئاسمانی‌یەکان و بە پێغەمبەران و بە ڕۆژی دوایی و و بە قەدەر بە خێر و شەڕی‌یەوە.

٣) **ئیحسان**: بە هەمان شێوە پێغەمبەر ﷺ لەوەڵامی (جوبرائیل) عليه السلام کەدەربارەی (احسان) کردی فەرمووی: ﴿الإِحْسَانُ: أَنْ تَعْبُدَ ا للهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ﴾ رواه مسلم عن عمر بن الخطاب. واتە (احسان) بریتی‌یە لەوەی: کە خوای خۆت بە جۆرێك بپەرستی وەکو ئەوەی کە دەیبینی، خۆ ئەگەر تۆش ئەو نەبینی، ئەو تۆ دەبینێ.

# بەشی دووەم

# ئیسلام وبەشەکانی

## پ٧/ ئیسلام چی‌یە؟

و: ئیسلام ئەو ناوەیە کەوا ئایین و بەرنامەی پێغەمبەری ئیسلامی ﷺ پێ ناسراوە، هەروەك خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِيناً﴾ المائدة ٣. واتە: من بەوە رازیم کەوا بە تەنها ئیسلام ئایین و بەرنامەتان بێ.

هەروەها لە رووی زمانەوانی‌یەوە بە سێ مانا لێك دراوەتەوە:

**یەکەم**: خۆ بەدەستەوە دان و خۆ یەك لا کردنەوە.

**دووەم**: ئاشتی و ئاسایش.

**سێیەم**: گوێ رایەڵی و مل کەچ بوون.

لەرووی شەرعیشەوە، ئیسلام بریتی‌یە لە:

یەکتایی خوا و خۆ بەدەستەوەدان و مل کەچ بوون و یەك لا بوونەوە، هەروەها بریتی‌یە لە برواهێنان بەو بنچینە ئایینی‌یانەی کە بۆ پێغەمبەری ئیسلام ﷺ هاتووە.

قورئانی پیرۆز (ئیسلام)ی لە دژی (شرك) داناوە، هەروەك دەفەرمووێ: ﴿قُلْ أَغَيْرَ اللهِ أَتَّخِذُ وَلِيّاً فَاطِرِ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَهُوَ يُطْعِمُ وَلاَيُطْعَمُ، قُلْ إِنِّي أُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَسْلَمَ وَلاَ تَكُونَنَّ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ الانعام ١٤. واتە: بڵێ ئایا غەیری خوا بکەم بە گەورەی خۆم لە کاتێکدا کە خوا ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە و خەڵکی نان دەدا و کەس ئەو نان نادات؟ بڵێ: من فەرمانم پێ‌کراوە کە من یەکەم کەس بم کە خۆم تەسلیم بکەم بە خوا (و پێمی گوت) کەوا وەکو مشریکەکان مەبە.

هەروەها قورئان ئیسلامی لە دژی کوفر داناوە هەروەك دەفەرمووێ: ﴿وَلاَ يَأْمُرَكُمْ أَنْ تَتَّخِذُوا الْمَلاَئِكَةَ وَالنَّبِيِّينَ أَرْبَاباً، أَيَأْمُرُكُمْ بِالْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنْتُمْ مُسْلِمُونَ﴾ آل عمران ٨٠. واتە: ئەو پێغەمبەرە فەرمانتان پێناکات بەوەی کە فریشتە و پێغەمبەران بکەن بە چەند خوایەك بۆ خۆتان، ئایا پێغەمبەری خوا فەرمانتان پێ‌دەکا بەبێ بڕوایی پاش ئەوەی کە ئێوە برواتان هێنا بە خوا و مل کەچ بوون بۆی؟

هەروەها بە مانای یەکلا بوونەوە بۆ خوا هاتووە، هەروەك دەفەرمووێ: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ دِيناً مِمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ للهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ﴾ النساء ١٢٥. واتە: ئایا کێ چاکتر و شیرینترە لە بارەی ئایینەوە لە کەسێك کە خۆی یەك بار و پاك وخاوێن کردبێ بۆ خوا بە مل کەچی.

هەروەها بە مانای مل کەچ بوون و خۆ بەدەستەوەدان دێت قورئان دەفەرمووێ: ﴿وَأَنِيبُوا إِلَى رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُ﴾ الزمر ٥٤. واتە: بگەڕێنەوە لای پەروەردگارتان و خۆتانی بە دەستەوە بدەن.

## پ٨/ تایبەتمەندی‌یە گشتی‌یەکانی ئایینی ئیسلام چین؟

و: ئایینی ئیسلام چەند تایبەتمەنی‌یەکی گشتی هەیە، کە ئەمانەی خوارەوەن:

١) **ئایینێکی خوایی‌یە**: هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَكُمْ بُرْهَانٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكُمْ نُورًا مُبِينًا﴾ النساء ١٧٤. واتە: ئەی خەڵکینە بەراستی لە لایەن پەروەردگارتانەوە بەڵگە و بەرنامەی ڕوون و ئاشکراتان بۆ ڕەوان کراوە و نوور و ڕووناکی‌یەکی ئاشکرامان بۆ دابەزاندوون.

٢) **ئایینی ئیسلام بەرنامەیەکی هەمە لایەنە** (**الشمول**): هیچ شتێك نی‌یە کە ئایینی ئیسلام باسی لێوە نەکردبێ. بەڵکو سیستەمێکی هەمە لایەنە بۆ هەموو لایەنەکانی ژیان، دەبێ بە پێ‌ی ئەم بەرنامەیەکارەکانی ژیان ڕێکخرێ... بۆ هیچ کەس نی‌یە بڕوای بە هێندێك ب[illegible]ت و بە هێندێك نەکات.. هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿[illegible] بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ فَمَا جَزَاءُ مَنْ يَفْعَلُ ذَلِكَ مِنْكُمْ إِلَّا خِزْيٌ فِي [illegible]حَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يُرَدُّونَ إِلَى أَشَدِّ الْعَذَابِ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ البقرة ٨٥. واتە: ئایا بڕوا بە هێندێك ئایەت دەکەن و بە هێندێك ناکەن؟ پاداشتی ئەم کەسە دەبێ چی بێ گەر ئەم جۆرە ڕەفتارە بنوێنێ تەنها ئەوە نەبێ لە دونیا ڕیسوای دەکەین و لە ڕۆژی دوا[illegible] دووچاری توندترین سزای دەکەین (بزانن) کە خوا بێ‌ئاگا نی‌یە لەوەی کە دەیکە[illegible]

٣) **ئایینی ئیسلام بەرنامەیەکی جیهانی‌یە**: ئیسلام بەرنامەیەکە بە [illegible] یەك چین و تاقم نەهاتووە، بەڵکو بەرنامەیەکە بۆ هەموو نەتەوە و گرۆه و زەمانێك هاتووە، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا﴾ السبأ ٢٨. [illegible] (محمد) تۆمان ڕەوان نەکردووە بۆ هەموو کەس نەبێ بۆ ئەوەی مژدەدەر و ترسێنەر بی بۆیان.

٤) **ئایینی ئیسلام ئایینێکی واقعی‌یە**: ئەم ئایینە لەگەڵ واقیعی‌یەتی ژیان و هەڵس و کەوتی ئینسان دەگونجێ و کالای بە بالای ئینسان و پڕ بە پێستی ئینسانە... خوای گەورە کارێکی وای بە ئینسان نەبەخشیوە گەر لەتوانای ئەو نەبێ، بەڵکو هەرچی شتێك کە لە قورئان دا هاتووە گشتی بۆ ئاسانکردنی کارەکانی ئینسانە، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾ الحج ٧٨. واتە: خوا پەروەردگار هیچ شتێکی لە دینا نەکردۆتە مایە تەنگی و نارەحەتی (بۆ ئێوە). یان دەفەرمووێ: ﴿لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾ البقرة ٢٨٦. واتە: خوا ڕووی تەکلیف لەکەس ناکات گەر لە توانای‌دا نەبێت.

٥) **ئایینی ئیسلام ئایینێکی مرۆڤایەتی‌یە**: مرۆڤ بەزگماك (**فطرة**) مسوڵمانە، ئایینی ئیسلامیش ئایینێکە لەگەڵ سروشتی ئینساندا مامەڵە دەکات...

ئیسلام هاتووە تاوەکو مەکانەتی ئینسان لە بوونەوەر دیار بکا ناسنامەی خۆی لە ژیاندا پێ بەخشێ کەبریتی‌یە لە (جێ نیشانایەتی) لەسەر زەوی... هەروەها دەیەوێ ئینسان بەرەو کەمال و

بەرزی بچێ و گرنگی بە شتی بەرز و بڵند بدات لە دونیادا بەسەر بەرزی بڕژی و مل دانەنوێنێ بۆ ستەم و ناهەقی. دەیەوێ دادپەروەر بێ، دەیەوێ حەڵاڵ خۆر بێ، دەیەوێ داوێن پاك بێ... هتد.
هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ اللهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنِ الْفَحْشَآءِ وَالْمُنْكَرِ وَالْبَغْيِ...﴾ النحل٩٠. واتە: خوای گەورە فەرمان دەكات بە دادوەری و چاكە كاری و یارمەتی خزمان و بەرهەڵستیشی كردووە لە داوێن پیسی و لە كاری خراپ و لە زوڵم و زۆری.

## پ٩/ ئیسلام بۆ چی هاتووە؟

و: بۆ ئەم پرسیارە هەمان وەڵامی **(ربعي كوڕی عامر)** دەدەینەوە كەوا لە شەڕی قادسیە (ڕۆستەم) كە سەركردەی فارسەكان بوو لێی پرسی: ئێوە بۆچی هاتوون و بۆ شەڕ لە گەڵ ئێمە دەكەن؟
**(ربعي)**یش وەڵامی داوە و فەرمووی: **(ان الله ابتَعَثَنا لِنُخرِجَ مَنْ شَاء مِنْ عِبَادَةَ العِبادْ إلى عِبَادة اللهِ وحْدَهُ، ومِن ضيق الدنيا إلى سِعَةِ الدُّنيا والآخرة، ومِنْ جَورِ الأديان إلى عَدْلِ الاسْلام) البداية والنهاية.** واتە خوای پەروەردگار ئێمەی ناردووە تاوەكو خەڵكی ڕزگار كەین لە بەندایەتی بەندە بۆ بەندایەتی خوای تاك و تەنیا، هەروەها لە تەنگ و تاریكی دونیا بۆ فراوانی دونیا و دواڕۆژ و لە زوڵم و زۆری ڕێبازەكان بۆ دادگەری ئیسلام...
كەواتە: ئیسلام بۆ ئەوە هاتووە تاوەكو خەڵكی بە تەنها خوای خۆیان بپەرستن، ڕوو لە هیچ خەڵك و بە ڕنامەیەكی دەستكرد نەكەن.
چونكە ئەگەر خەڵك خوای خۆی نەناسی و پشتی كرد لە خوا ناسین ئەوا دونیای بۆ دەبێت بە چەرمی چۆلەكە.. بەڵام بە پێچەوانەوە هەم دونیا و هەم ئاخیرەتت بۆ فراوان دەبێت.
ئینجا خەڵكی ئەگەر نەهاتنە نێو ئیسلام ئەوا دەبن بە پاروویەكی چەور بۆ قورگی تاغوتان و زۆر بەئاسانی هەزم دەكرێن.. بەڵام بەهاتنی ئیسلام عیززەت و ماڵ و كەرامەتت پارێزراو دەبێ، هەروەك (عومەری كوڕی خەتتاب) ڕەزای خوای لێبێ دەفەرمووێ: **(نَحْـنُ قَـوْمٌ أَعَزَّنـا اللهُ بِالإِسْلام).** واتە: ئێمە گەلێكین بە ئیسلام خوا بە عیززەتی كردووین.

## پ١٠/ ئایا ئیسلام بۆ پاراستنی چ شتێك هاتووە؟

و: ئایینی ئیسلام بۆ پاراستنی (٥) پێنج شتان هاتووە، كە بریتین لە:
١) **بۆ پاراستنی ئایین:** خوای پەروەردگار دەیەوێ پیاوی ئیسلام زۆر بكاو نایەوێ مسوڵمانان بە زەلیلی لە ژێر ئایینێكی تر جیا لە ئیسلام ژیان ببەنە سەر. هەروەها ڕێ نادات بە وڵاتێكی مسوڵمان نشین كە حوكم بە شەریعەت و بەرنامەی خوا نەكەن و مەیدان چۆل بكەن بۆ بێ بڕوایان تا بە هەوەسی خۆیان بێ دینی بڵاو كەنەوە، چونكە ئەمانە دەبێتە هۆی بێحورمەت كردنی ئایین و بەرنامەی خوا و ئیسلام لە بەرچاوی خەڵكی نامۆو بێ نرخ دەبێ، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِـالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِـيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ

كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ﴾ الصف ٩. واته: خوا ئەو خوایەیە کە پێغەمبەری خۆی ناردووە بە ڕێنموونی و ئایینێکی ڕاست و دروستەوە تا سەر هەموو ئایینێکی بخات ئەگەر چی هاوبەش پەیداکەرانیش پێیان ناخۆش بێت. بەمجۆرە ئیسلام هاتووە تاوەکو ئایین بپارێزێ و بە هەموو دونیاشی ڕاگەیەنێ.

٢) **بۆ پاراستنی ژیری (العقل)**: هەرچی یاسا و ڕێبازی دەستکردی مرۆڤ هەیە گشتیان نەك لە بەرژەوەندی (عقل) نین بەڵکو گشتیان وەسیلەی تێك دانی عەقڵی مرۆڤن.

بەڵام ئیسلامە پێت دەڵێ ئارەق مەخۆ چونکە عەقڵی ئینسانی پێ تێك دەچێت، ئیسلامە پێت دەڵێ جگەرە مەکێشە چونکە عەقڵ و ژیری لاواز دەکات، ئیسلامە دەڵێ با پیاو و ژن لە گەڵ یەك تێکەڵ نەبن، چونکە مێشکی ئینسان تەرت و وێران دەکات. ئیسلام دەڵێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقْرَبُوا الصَّلَاةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى حَتَّى تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ﴾ النساء ٤٣. واته: ئەی بڕوا دارینە نزیکی نوێژ مەبن لە کاتێکدا کە سەرخۆش بوون، تاوەکو (ئاگاتان لە خۆ بێ و) بزانن کەوا چ دەڵێن لە نوێژدا. ئەو هەموو خۆکژی و ماڵ وێران کردنەی کە لە دونیا ڕوودەدات گشتیان بەهۆی دوورکەوتنەوەیە لە ئایینی ئیسلام.

٣) **پاراستنی ماڵ و دارایی**: ئیسلام ڕێ پێنادات کە ماڵ و سامان بە تەنها لە گیرفانی هێندێك کەس خڕ بێتەوە و هێندێك لە سەریان بڕژێ و هێندێکیشیان لەبەریان ببڕێ، ئیسلام هاتووە تاوەکو خەڵکی هەست بە چینایەتی و بەرزی و نزمی نەکەن لە کۆمەڵگادا، ئەویش بەوە دەبێ کە خەڵکی لەو ماڵەی کە هەیانە سەرفی کەن بۆ ئەوانەی کە نیانە، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَآتُوهُمْ مِنْ مَالِ اللَّهِ الَّذِي آتَاكُمْ﴾ النور ٣٣. واته: پێیان ببەخشن لەو ماڵەی کە خوا پێی داون. یان دەفەرمووێ: ﴿وَلَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ وَتُدْلُوا بِهَا إِلَى الْحُكَّامِ لِتَأْكُلُوا فَرِيقًا مِنْ أَمْوَالِ النَّاسِ بِالْإِثْمِ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ البقرة ١٨٨. واته: ماڵی یەکتری مەخۆن لە ناو خۆتانا بە نارەوا، هەروەها بە (بەرتیل) پێدان بە فەرمان داران بۆ ئەوی بەشێك لە ماڵی خەڵکی بخۆن بە گوناه، وە ئێوەش ئەزانن.

٤) **پاراستنی گیان**: ئیسلام هاتووە ئینسان بکات بە جێنشینی ئەو دروستکراوانەی پێش خۆی بە جێبەجێ کردنی فەرمانی خوا و ئاوەدانکەرەوەی خاکی خوا بۆ خوا پەرستی و برایەتی و تەبایی لە نێوان ئینسانەکان. هەر بۆیە ڕێزیشی لێناوە کە دەفەرمووێ: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ﴾ الاسراء ٧٠. واته: بێگومان ڕێزمان لە بنیادەم ناوە... ئەوە کە ڕێزی لێناوە هەڕەشەشی کردووە لەوە کە خوێنی یەکێك بە ناهەق بڕێژێ، هەروەك دەفەرمووێ: ﴿مَنْ قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا﴾ المائدة ٣٢. واته: هەرکەسێ یەکێك بە ناهەق بکوژێ و فساد لەسەر زەوی بنێتەوە، ئەوە وەك ئەوە وایە کە هەموو خەڵکی بە ناهەق کوشتووە، هەروەك گەر یەکێك یەکێك لە مردن ڕزگار کات ئەوە وەك ئەوە وایە کە هەموو خەڵکی ڕزگار کردووە لە مردن.

٥) **پاراستنی وەچە**: ئیسلام فەرمانمان پێدەکات کەوا نەوەیەکی دڵ و دەست و زمان پاك دروست بکەین کە لێ براو بن بۆ ئیسلام... پێغەمبەری خوا ﷺ لە پێشدا پێمان دەفەرمووێ:

﴿يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ مَنْ إسْتَطَاعَ مِنْكُمُ البَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجِ فَإنَّهُ أغَضُّ لِلْبَصَرِ وأحْصَنُ لِلْفَرْجِ ومَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بالصَّوْمِ فَإنَّهُ لَهُ وجَـاءٌ﴾ رواه البخاري و مسلم. واتـه: ئـەی كۆمـەڵی گـەنج و لاو هەركەسێك لە ئێوە توانای ژن هێنانی هەبوو لە گشت بوارەكاندا (دارایی مەعنـەوی جینسـی) با ژن بهێنێ چونكە ژن هێنان پارێزگاری چاوە لە خراپەكاری و قەڵای پاراستنی داوێـن (فـرج)ە لە زیناكاریدا. هەركەسێكیش نەیتوانی ژن بهێنێ با بەڕۆژوو بێ چونكە بۆی دەبێ بە قـەڵغان و پارێزگـار لـە گونـاه و تـاوان و نــەفس دەمرێــنێ. هــەروەها دەفــەرمووێ: ﴿مُـرُوا أوْلادَكُـمْ بالصَّلاةِ وهُمْ أبْنَاءُ سَبْعُ سِنِينَ واضْرِبُوهُمْ وهُـمْ أبْنَـاءُ عَشْرٍ، وفَرِّقُوا بَيْنَهـمْ فِي الْمَضَـاجِعِ﴾ حديث حسن رواه ابو داود باسناد حسن. واتە: منداڵەكانتان فێری نوێژ بكەن لە حەوت ساڵی، لـە دە ساڵی لێیان بدەن ئەگەر نوێژیان نەكرد و جێگاكانیشـیان لێـك جیابكەنـەوە لـەم تەمەنـەدا. یـان خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿يَا أيُّهَـا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أنـفُسَكُمْ وأهْلِيكُـمْ نَارًا وقُودُهَا النَّاسُ والحِجَارَةُ﴾ التحريم ٦. واتـە: ئـەی بڕواداریـنـە خۆتـان و مـاڵ و منداڵـەكانتان لـە ئـاگر بپارێزن، كە سووتەمەنی یەكەی بریتی یە لە ئینسان و بەرد.. بەم جۆرە ئیسلام گرنگی بە نەوەی نوێ دەدات.

## پ١١/ پایەكانی ئیسلام (اركان الاسلام) چەندن؟

و: پایەكانی ئیسلام (پێنج)ن هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿الإسْـلامُ أنْ تَشْـهَدَ أنْ لا إلَهَ إلاَّ اللهُ وأنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ، وتُقِيمَ الصَّلاةَ وتُؤتِيَ الزَكَاةَ، وتَصُـومَ رَمَضَـانَ، وتَحُـجَّ الْبَيْتَ إنْ اسْتَطَعْتَ إلَيْهِ سَبِيلاً﴾ رواه مسلم عن عمر ﷺ. واتە: پایەكانی ئیسلام بریتین لە: (هەردوو شایەدمانی یەكە و نوێژ و زەكات دان و بە ڕۆژوو بوونی مانگی ڕەمـەزان و حـەج كـردن ئەگـەر لـە تواناتدا هەبوو).

## پ١٢/ شایەدمانی ﴿لا إله إلا الله محمد رسول الله﴾ چی یە؟

و: شایەدمانی واتە شـایەدی دان بـەوەی كـە هیـچ كـەس شـیاوی پەرسـتن نی یـە تـەنها خـوا نەبێ، وە (محمد)یش نێردراوی ئەو خوایەیە.. ئەمەش دەبێ لە دڵدا دابمەزرێ و بەزمانیش دانـی پێـا بهێنرێ و بەرەفتاریش بسەلمێنرێ.

## پ١٣/ مەرجەكانی هاتنە نێو ئیسلام چین؟

و: مەرجەكانی هاتنە نێو ئیسلام بریتین لە گوتنی هەردوو شایەدی یەكە. هـەروەك پێغەمبـەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿أشْهَدُ أنْ لا إلَهَ إلاَّ اللهُ، وأنِّي رَسُولُ اللهِ، لايَلْقَى اللهَ بِهِمَـا عَبْـدٌ غَيْرَ شَاكٍّ بِهِمَا، إلاَّ دَخَلَ الجَنَّةَ﴾ رواه مسلم. واتە: شایەدی دەدەم كە هیچ كەس شیاوی پەرستن نی یـە

جگە لە خوا نەبێ، وە شایەدی دەدەم کە من نێردراوی خوام، هەر کەسێك ئەم دوو شایەدییە بدات و هیچ گومانیشی لێیان نەبێ ئەوا دەچێتە بە هەشت.

## پ١٤/ ئایا بە دان پیا هێنانی (الاقرار) یەك بەشی شایەدی دەبێتە مسوڵمان؟

و: نەخێر، چونکە هەرکەسێك لە کاتی خۆی بهاتبایە ناو ئیسلام دەبوایە ئەو دوو شایەدییە بلێ هەروەك کاتی خۆی پێغەمبەری خوا ﷺ بە کەنیزەیەکی گوت: ﴿**این ا لله؟ قالت: في السماء، قال من انا؟ قالت: انت رَسُولُ ا للهِ، قَالَ أَعْتِقْهَا فَإِنَّهَا مُؤْمِنَةٌ**﴾ رواه مسلم. واتە: کێ پەروەردگارتە؟ ئەویش گوتی (ا لله)، ئینجا گوتی ئەی من کێم؟ ئەویش گوتی نێردراوی خوای، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئازادی بکە ئەم ئافرەتە بڕوادارە.

## پ١٥/ ئەو کەسەی کە بە دوای تاقم و ڕێبازێکی جاهیلی کەوتووە، ئایا بە تەنها شایەدی هێنانێك بەسە بۆ هاتنە نێو ئیسلام؟

و: مەرجی هاتنە نێو ئیسلامی ئەم جۆرە کەسانە ئەوەیە، کەوا پێش ئەوەی بێنە نێو ئیسلام دەبێ بەرگی جاهیلی لە خۆیان داماڵن و سڵ بکەن لە ژیانی تاغوتی و قێز بکەن لە تاقم و ڕێبازە جاهیلییەکەی ئینجا بێنە نێو ئیسلام و ئایینی ئیسلام بکەن بە ڕێبازی ژیانی و خوا بکەن بە داهێنەر و داڕێژەری سیستەمی ژیان... هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿**فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِا للهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى لاَ انْفِصَامَ لَهَا...**﴾ البقرة ٢٥٦. واتە: هەرکەسێك بێبڕوابێ بەوەی کە دەیپەرستن لە غەیری خوا و بڕواش بێنێ بە خوا، ئەوا بە ڕاستی دەستی گرتووە بە دەستەگیرییەکی قایمی بەهێز کە پچڕان و بەربوونی بۆ نییە (کە بریتییە لە یەکخواناسین ـ التوحید) کەواتە تا واز نەهێنی لە ڕێبازی بێ بڕوایی، ئیمان لە دڵدا ناچەسپێ.
چونکە پێم وایە هەرکەسێکی بڕوا بهێنێ بە خوا بەڵام کوفر بە (**طاغوت**) نەکات، وەکو ئەوە وایە کە دان بنێ بە ﴿**لا اله الا ا لله**﴾ بەڵام بڵێت: وا لە فلانە شوێن خوایەکی تریش هەیە.

## پ١٦/ چۆن دەتوانین دان (اقرار) بەم شایەدییانە بهێنین؟

و: دان هێنان بە شایەدی ﴿**لااله الا ا لله**﴾ بەوە دەبێ کە خۆت تەنها بۆ ئەم ووشەیە یەکلا بکەیتەوە و دان هێنان بە شایەدی ﴿**محمداً رسول ا لله**﴾ش بەوە دەبێ کە هەرچی ئەو هێناویەتی بەدوای بکەوی.

## پ١٧/ گرنگی ئەم شایەدی‌یە چی‌یە؟

و: شایەدمانی بۆ نویێ کردنەوەی بـەڵێن و پەیمانـە لەگـەڵ خـوا لەسـەر ئەساسـی بـاوەڕ بـوون بەتاك و تـەنیایی خـوا لـە ڕێگەی کـار کـردن بـە شـەریعەتی خـواو شـوێن کـەوتنی پێغەمبـەری نازداردا ﷺ.

## پ١٨/ نوێژ (الصلاة) گرنگی چی‌بە؟

و: نوێژ بریتی‌یە لە خوا پەرستی‌یەکی ڕاستەقینە لە ڕێگەی کردارەوە، گرنگـی ئـەم نوێـژەش بریتی‌یە لە: ڕۆشن بوونەوەی دڵ و چاوساغی و دوور کەوتنەوە لە تاوان و سەرپێچی، جگە لـەوەی سەرلە نویێ بەستنەوەی پەیوەندی‌یە لەگەڵ خوای خۆت.

## پ١٩/ زەکات چی‌یە و گرنگی چی‌یە؟

و: زەکات بریتی‌یە لە خوا پەرستی‌یەك لە ڕێگـەی سـەرف کردنـی مـاڵ و دارایـی، گرنگـی زەکاتیش بریتی‌یە لە پاك کردنەوەی دەروون لە چاوچنۆکی و لە قرچۆکی و پێـك هێنـانی ئاتـاج و پێویستی هەژاران.

## پ٢٠/ ڕۆژوو (الصوم) چی‌یە و گرنگی چی‌یە؟

و: بریتی‌یە لە خوا پەرستی‌یەك کـە لـە ڕێگـەی خـۆ گرتـن لـە خواردنـی ڕۆژانـی ڕەمـەزان، سوود و گرنگی ڕۆژووش بریتی‌یە لە حەساندنەوەی گەدە و هەست کردن بە ژیانی هەژاران.

## پ٢١/ حەج چی‌یە و گرنگی چی‌یە؟

و: بریتی‌یە لەو خوا پەرستی‌یەی کە بە نیەتی (**بیت الحرام**) و بەرزکردنەوەی دروشمـی حـەج ئەنجام دەدرێ، گرنگی‌یەکانی (حەج)یش بریتی‌یە لە دەستەمۆکردن (**ترویض**)ی دەروون لـە توانـا سەرف کردنی ماڵ و جەستە بۆ خوا پەرستی، بۆیە حەج کردن جۆرێکە لە جیهادکردن لە ڕێگـەی خوا و یەك بوونی مسوڵمانان دەردەخات، جگە لەوە کۆبوونەوەیەکی ساڵانەیە لە سەر ئاستی هەموو دونیا.

## پ٢٢/ دژەکانی ئیسلام (نواقض الإســلام) چـین؟ یـان بـە چـی شایەدمانی هەڵدەوەشێتەوە؟

و: مەرجەکانی ئایینی ئیسلام بریتی‌یە لە بەڕاست زانین و دان پیا هێنان و سەلماندنی هـەردوو شایەدی‌یەکە.

زۆر لە خەڵکی هەن بیروبۆچوونیان وایە کەوا هەر کە گوتیان: ﴿**أشهد ان لا الـه الا الله وأن محمداً رسول الله**﴾ یەکسـەر بەری خۆیان لە ئاوێ دەردەهێنن و بەهەشـت مسـۆگەر دەکـەن. بـەڵام

نازانن زۆر شت هەن ئەگەر بیکەن پێی لە ئیسلام دەشۆرێن و دوو شایەدمانی‌یەکەیان لێ هەڵدەوەشێتەوە، هەندێك لەم خاڵانەش کە ڕێ خۆشکەرن بۆ لە ئیسلام دەرچوون و کافر بوونی بریتین لە:

١) **کارکردن بۆ غەیری خوا:** ئینسان بۆیە دروست کراوە تاوەکو بۆ خوانەبێ بۆ هیچ کەسی تر کارنەکات و مل بۆ غەیری خوا کەچ نەکات، گەر وانەبێ ئەوا لە ئیسلام دەردەچێ و پەیوەندی بە دینی خواوە نامێنێ بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿قُلْ إِنَّ صَلاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ لاشَرِيكَ لَهُ﴾ الانعام ١٦٢. واتە: بڵێ نوێژکردن و قوربانی دانم و ژیان و مردنم بۆ خوای پەروەدگاری جیهانی‌یە و هیچ هاوتایەکیشی نی‌یە.
کەواتە هەرکارێك بکرێت بە ئامانجی غەیری خوا ئەوا شیرکە و پێی لە ئیسلام دەردەچێت.

٢) **پشت بەستن بە غەیری خوا:** خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَعَلَى اللَّهِ فَتَوَكَّلُوا إِنْ كُنتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ المائدة ٢٣. واتە: پشتی خۆتان بە خوا ببەستن ئەگەر خۆتان بە بڕوادار دەزانن.

٣) **زەوت کردنی مافی خوا:** مافی خوا لە سەر بەندەکانی جگە لە پەرستن، خواکردنە حاکمیشە لە ئاست دانانی حەرام و حەلاڵ لە ژیانی ڕۆژانەماندا. بە حوکمی ئەوەی کە خوا وەدیهێنەری غەیری خۆیەتی ئەوا دەبێ لە مەسەلەی دەستوورو یاسا و شەریعەتیش دا هەر خوا بکرێتە حاکم، هەروەك خوا دەفەرمووێ: ﴿وَلِلَّهِ الأَمْرُ مِنْ قَبْلُ وَمِنْ بَعْدُ﴾. واتە: هەر بۆ خوایە فەرماندان لە پێشەوە و لەمەودوایش. یان دەفەرمووێ: ﴿فَلا وَرَبِّكَ لايُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ﴾ النساء ٦٥. واتە: سوێند بە خوای تۆ ئەی پێغەمبەر ئیمانی نی‌یە ئەو کەسەی تۆ نەکات بە حاکم لەو کێشانەی کە دەکەوێتە نێوانیان. هەروەها دەفەرمووێ: ﴿إِنَّمَا النَّسِيءُ زِيَادَةٌ فِي الْكُفْرِ يُضَلُّ بِهِ الَّذِينَ كَفَرُوا يُحِلُّونَهُ عَاماً وَيُحَرِّمُونَهُ عَاماً لِيُوَاطِئُوا عِدَّةَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ فَيُحِلُّوا مَا حَرَّمَ اللَّهُ زُيِّنَ لَهُمْ سُوءُ أَعْمَالِهِمْ وَاللَّهُ لايَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ﴾ التوبة ٣٧. واتە: دواخستنی مانگە (حرام)ەکان زێدەڕۆیی‌یە لە کوفر و بێ‌باوەڕان پێی گومڕا دەبن کە ساڵی فلان مانگە حەلاڵ دەکەن وساڵێکی تر حەرامی دەکەن تاوەکو بە قەدەر ئەو مانگەی بێ کە لە لای خودا (حرام)ن، دێن حەرامی خودا حەلاڵ دەکەن، بۆیان ڕازاوەتەوە کردەوە خراپەکانیان، خوداش ڕێنمایی گەلی بێ‌باوەڕان ناکات.

٤) **گوێ ڕایەڵی بۆ غەیری خوا:** ئەمەش دەبێتە هۆی لە ئیسلام دەرچوونی ئەو کەسانەی کە مل بۆ غەیری خواکەچ دەکەن و گوێڕایەڵی بۆ غەیری خوا دەکەن.بۆیە خوای گەرە دەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ تُطِيعُوا الَّذِينَ كَفَرُوا يَرُدُّوكُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ فَتَنقَلِبُوا خَاسِرِينَ﴾ آل عمران ١٤٩. واتە: ئەی بڕوادارینە ئەگەر ئێوە گوێڕایەڵی

بیٚ بروایان بکـەن ئـەوا هـەڵتان دەگەڕێننـەوە لـە ئاینەکـەتان و بـە خەسـارەت مـەندیش دەگەڕێنەوە لای خوا.

٥) **ڕق بوونەوە لە چـەند حوکمێکـی ئیسلامی، یـان هـەموو ئیسلام:** بـۆ نموونـە بڵێیـت: نەدەبوا خوا وای کردبا، یان دەبوا خوا وای کردبـا!! یـان ڕقـت لـە چـەند ئایـەتێك بێـت چونکە بەرژەوەندی تۆی تێدا نی‌یە... بەڵام ئەم جۆرە هەڵوێستە پیشـەی بـیٚ بروایانـە، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا فَتَعْسًا لَّهُمْ وَأَضَلَّ أَعْمَالَهُمْ، ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُوا مَا أَنزَلَ اللهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ﴾ محمد ٨-٩. واتە: ئەوانەی کە بیٚ بروان شەکەتی و ماندووبوونیان بۆ دەمێنیٚ و کارەکانیان لیٚ بەزایە دەدەیـن، چونکـە ئـەو بیٚبروایانە ڕقیان لەو قورئانەیـە کـە لای خـواوە هـاتووە تـاوەکو کارەکانیـان پیـوە پـووچ بووەوە.

٦) **خۆشویستنی دونیا و ڕق بوونەوە لە ئاخیرەت:** زۆر لە زانایـان دەڵێـن ئەگـەر یـەکێك دوا ڕۆژ بۆ دونیا بفرۆشیٚ ئـەوا لـە ئیـسلام دەردەچـیٚ و بـە مـسوڵمان حـسێب نـاکریٚ. ئەویش بـە بەلگـەی ئـەو ئایەتـەی کـە دەفـەرمووێ: ﴿وَوَيْلٌ لِّلْكَافِرِينَ مِنْ عَذَابٍ شَدِيدٍ، الَّذِينَ يَسْتَحِبُّونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا عَلَى الْآخِرَةِ...﴾ ابراهيم٢. واتە: ئاگری دۆزەخ بۆ ئەو بیٚبروایانەیە کە ژیانی دونیایان خۆشتر دەویٚ لە ئاخیرەت.

٧) **گاڵتەکردن بە شتێك لە قورئان و سوننەت:** بـۆ نموونـە: گاڵتـە بـەو کەسـە بکـریٚ کـە قورئان دەخوێنیٚ، یان گاڵتـە بەریشـی مسـوڵمانێك یـان سـیواك یـان فۆتـەی ئـافرەتێکی مسوڵمان بکریٚ، بۆیـە کـاتێك خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: بـا مسـوڵمانان پابـەندی شەریعەت و سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ بن، ئەوا دەبیٚ بەبیٚ منجەمنج کردن فەرمانەکە جیٚبەجیٚ بکریٚ. بۆیە هەرکەسێك گاڵتە بە شتێك لـە شـەریعەت بکـات ئـەوا گاڵتـەی کـردووە بـە خـوا و پێغەمبـەری خـوا ﷺ بۆیـە خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ، قُلْ أَبِاللهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ، لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ..﴾ التوبة ٦٥-٦٦. واتـە: ئەگـەر لێیـان بپرسیت بۆ وادەکەن، لە وەڵامدا دەڵێن: ئێمە بۆ گاڵتـەو سـوحبەت ئـەم قسـانە دەکـەین، تۆش پێیان بڵیٚ: چۆن ئێوە گاڵتە بە خوا و بە ئایەتەکان و پێغەمبەری خوا دەکەن؟!! تـازە هیچ عوزرێك مەهێننەوە چونکە کافر بوونەوە لە دوای ئەوەی کە باوەڕتان هێنابوو.

٨) **بیٚئەدەبی نواندن بەرامبەر بە پێغەمبـەر ﷺ و ئاکـار و سوننەتە بـەرێزەکانی:** بـە هیچ جۆرێك ڕێگا نادرێت بە کەسێك کـەوا فـەرمانی پێغەمبـەری خـوا ﷺ وەلا بنـیٚ و دوای فەرمانی خۆی یان خەڵکانی تر بکـەوێت. هـەر بۆیـە خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللهِ وَرَسُولِهِ...﴾ الحجرات ١. واتـە: ئەی بروا دارینە دەسـت پێش خـەری مەکـەن لـە فـەرمانی خـوا و پێغەمبەرەکـەی. یـان دەفەرمووێ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ﴾ الاحزاب٣٦. واتە: بۆ بڕواداران نەهاتووە چ پیاو چ ژن فەرمانێك کـە

خوا و پێغەمبەر بیدەن ئەوان غەیری ئەو فەرمانە فەرمانی تر هەڵبژێرن کە بۆ خۆیان بگونجێ.

٩) **تێک چوون و بێز بوونەوە لە کاتێک کە باسی تاک و تەنیایی خوا دەکرێ**: واتە: لە کاتێکدا کە باسی ئیسلام و ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان و مسوڵمانان دەکرێ، تووشی ژانە سەر ببیت و نێوچاوانتی لێ گرژ کەیت. هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَإِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَحْدَهُ اشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ وَإِذَا ذُكِرَ الَّذِينَ مِنْ دُونِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ﴾ الزمر ٤٥. واتە: کاتێك کە باسی تاك و تەنیایی خوا دەکرێ، ئەوانەی کە بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نی یە دڵیان پێ تێك دەچێ و (نێو چاوانیان گرژ دەبێ) بەڵام ئەگەر باسی غەیری خوا بکرێ ئەو دەمە شاد و دڵ خۆش دەبن.

١٠) **وەرنەگرتنی ئیسلام بە تەواوی و بڕوا پێ نەبوون بە هەندێک دەقی قورئان و سوننەتە ئاشکراکانی پێغەمبەر ﷺ**: خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ فَمَا جَزَاءُ مَنْ يَفْعَلُ ذَلِكَ مِنْكُمْ إِلَّا خِزْيٌ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يُرَدُّونَ إِلَى أَشَدِّ الْعَذَابِ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ البقرة ٨٥. واتە: ئایا ئێوە بڕواتان بە هەندێك ئایەت هەیە و (جێ بەجێ ی دەکەن) بڕواشتان بە هێندێك نی یە (کە جێ بەجێ ی ناکەن)دەبێ سزای ئەو کەسە چی بێ کە ئەم جۆرە هەڵوێستانەی (سەرەوەی) هەبێ؟ تەنها ئەوەنەبێ لە دونیا ڕیسوا و سەرگەردانی دەکەین و لە دوا ڕۆژیش دووچاری ناخۆشترین ئازار و ئەشکەنجەی دەکەین، خوای گەورەش بێ ئاگا نی یە لەو کردەوانەی کە دەیکەن. هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿مَنْ كَذَبَ عَلَى نَبِيِّهِ أَوْ عَلَى عَيْنَيْهِ أَوْعَلَى وَالِدَيْهِ لَمْ يَرِحْ رَائِحَةَ الجَنَّةِ﴾ حديث حسن للطبراني. واتە: هەر کەسێك درۆ بکات بە زمانی پێغەمبەرەکەی یان لەگەڵ هەردوو چاوی یان لە گەڵ دایك و باوکی ئەوا بۆنی بەهەشت ناکات.

١١) **نکوڵی کردن لە سیفەتێک لە سیفەتەکانی خوا، یان لە ناوەکانی خوا**: خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلَّا اللَّهُ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ...﴾ آل عمران ٧. واتە: خوای گەورە قورئانی بۆ تۆ ناردۆتە خوارەوە، هێندێك لەم قورئانە ئایەتەکانی ئاشکرایە و ئەوان مەبەستی بنەڕەتین لە قورئان (چونکە بۆ کاروباری ژیان بەکار دێن) هێندێکی تر لەم قورئانە ئایەتەکانی وێکچووە، (واتە یان ئاشکرا نی یە) جا ئەو کەسانەی کە لە ڕاستی لایانداوە، خۆیان بە ئایەتی وێکچوویی خەریك دەکەن بۆ ئەوەی خەڵکی گومڕا بکەن و بە گوێرەی ئارەزووی خۆیان مانای لێك بدەنەوە، لە کاتێکا هیچ کەس مەبەستی ئەم وێکچووانە نازانێ تەنها خوا دەیزانێ، جا ئەو کەسانەی لە زانستدا ڕۆچوو ون ئەڵێن: ئێمە باوەڕمان بەو وێکچووانە هەیە، گشتی فەرموودەی خوان جا هیچ کەس ئەم ئامۆژگاری یە وەرناگری تەنها خاوەن عەقڵەکان نەبێ. هەروەها دەفەرمووێ: ﴿وَلِلَّهِ

﴿الأَسْمَاءُ الحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَا وَذَرُوا الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَائِهِ﴾ الاعراف ١٨٠. واتـه: خوا خاوەن ناوی چاك و ڕێك و پێكە، ئێوەش بـەو ناوانـە داوای لێبکـەن، واز لەوانـەش بهێنن کە بڕوایان بە ناوەکانی خوا نیيە.

١٢)**نەناسینی پێغەمبـەر ﷺ بـە ناسینێکی چـاك، یـان ڕازی نـەبیت بـە پێشـەوایەتی پێغەمبەر ﷺ**: خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِمَنْ كَانَ يَرْجُوا اللهَ وَالْيَوْمَ الآخِرَ وَذَكَرَ اللهَ كَثِيراً﴾ الاحزاب ٢١. واتـه: بەڕاستی بۆ ئێـوە لـە پێغەمبـەری خـواوە پێشـەنگی و سـەرقافڵەیی هەیـە، (بەتایبـەت) بـۆ ئەوانـەی بـە ئومێـدی خـواو ڕۆژی دوایـین و زۆریـش یـادی خـوا دەکـەن. چونکـە شوێن کـەوتنی پێغەمبـەر ﷺ مایـەی خۆشویسـتن و ڕەزامـەندی خوایـە، هەرکەسـێك پێغەمبەری ئیسلام ﷺ نەکات بە سەر قافڵە، ئـەوا هیـچ هـەقی نییـە داوای ڕەزامـەندی خوا بکات و خۆی لە لای خوا خۆشەویست بکات. بەڵکو خوا دەیبوغزێنێ و ڕووڕەشـی دونیا و ئاخیرەتیشی دەکات. بۆیە دەفـەرمووێ: ﴿قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ، قُلْ أَطِيعُوا اللهَ وَالرَّسُولَ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّ اللهَ لاَيُحِبُّ الْكَافِرِينَ﴾ آل عمران ٣١-٣٢. واتـه: بڵـێ ئەگـەر ئێـوە خواتـان خۆش دەوێ بە دوای من بکەون، ئەو دەمە خـوا خۆشـی دەوێـن و لـە گوناهەکانیشـتان دەبووری، چونکە خوا لێبووردە و بە بەزەییە، (دیسان)پێیان بڵێ کـەوا گـوێ ڕایـەڵی خـوا و پێغەمبـەر بـن ئەگـەر نـا خـوا کـافرانی خـۆش نـاوێ. کەواتـە بـە دوا نەکـەوتنی پێغەمبەر ﷺ مایەی دەرچوونە لە ئیسلام.

١٣)**کافرکردنی ئەهلی ئیسلام و کافر نەکردنی ئەهلی کوفر**: یاسـایەکی شـەرعی دەڵـێ: ﴿مَنْ كَفَّرَ مُؤْمِناً فَقَدْ كَفَرَ، وَمَنْ لَمْ يُكَفِّرِ الْكَافِرَ فَقَدْ كَفَرَ، وَمَنْ شَكَّ فِي كُفْرِ الْكَافِرِ فَقَدْ كَفَرَ﴾. واته: هەرکەسێك بڕوادارێك کافر کات بۆ خۆی کـافر دەبێـت، هەرکەسـێکیش بێ بڕوایەك کافر نەکات ئەویش کـافر دەبێـت، وە هەرکەسـێکیش گومـانی لـە کوفـری کافرێك هەبێت دیسان کافر دەبێت.

پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرمووێ: ﴿لاَيَرْمِي رَجُلٌ رَجُلاً بِالْفِسْقِ أَوْ الْكُفْرِ إِلاَّ ارْتَدَّتْ عَلَيْهِ إِنْ لَمْ يَكُنْ صَاحِبُهُ كَذَلِكَ﴾ اخرجه البخاري. واته: هەرکەسێك پیاوێك فاسق کات یان کافر کات (کە لە ڕاستیدا نە فاسق و نەکافریش بێت) ئـەوا (فسـق) و (کفـر)ە کە بۆ خۆی دەگەڕێتەوە.هەروەها دەفەرمووێ: ﴿أَخْوَفُ مَا أَخَافُ عَلَى أُمَّتِي ثَلاَثٌ: رَجُلٌ قَرَأَ كِتَابَ اللهِ حَتَّى إِذَا رُئِيَتْ عَلَيْهِ بَهْجَتُهُ وَكَانَ عَلَيْهِ رِدْءُ الاسْلاَمِ إِخْتَرَطَ سَيْفَهُ وَضَرَبَ بِهِ جَارَهُ وَرَمَاهُ بِالشِّرْكِ. قِيْلَ يَا رَسُولَ اللهِ الرَّامِي أَحَقُّ بِهِ أَمِ الْمَرْمِي؟ قَالَ: الرَّامِي﴾ الطبراني. واتـه: لـە هـەموو شـتێك ترسـناکتر کـە مـن لێـی بترسـم لـە ئوممەتەکـەی خـۆم، سـێ شـتن، (یـەك لەوانــە) پیـاوێك قورئـانی خوێندبـێ، تـاوەکو خۆشەویستی ئیسلامی لە دڵ دەچەسپێ (تاوای لێدێ) لە سەری پێویست دەبـێ کـە (بـە

چاكی) پاڵپشتی ئیسلام بكات، بەڵام شمشێری لە كالآن هەڵدەكێشێ و (زمانی دەخاتە كار) و دەست دەكات بە لە ناو بردنی پشتیوان و خەمخۆرانی ئیسلام (بە ناهەق) و تۆمەتی كوفریان دەداتە پاڵ (واتە: كافریان دەكات) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆمەت كەرەكە شیاو ترە بەم كافر بوونە، یان تۆمەت پێ كراوەكە؟ فەرمووی تۆمەت كەرەكە...

واتە: پیاوی وا هەیە زۆر خۆی بە مسوڵمان دادەنێ و هەمیشە قورئانی لە بەردەمایە و دەیخوێنێ، بەڵام بە ناهەق خەڵكیش كافر دەكات... كەچی نازانێ خەڵك كافر كردنەكەی بۆ دەبێت بە مایەی كافر بوونی خۆی.

١٤)**سەرف كردنی بەندایەتی بۆ غەیری خوا**: ئینسان بۆ ئەوە دروست كراوە كە خوا بپەرستێ، چونكە مافی خوا لەسەر بەندەكانی پەرستنیەتی و هاوەڵ دانەنانە بۆی... بەڵام هەركەسێك ئەم ئەركە جێبەجێ نەكات و غەیری خوا بپەرستێ، یان دوای غەیری بەرنامەی خوا بكەوێ... ئەوا لە ئیسلام دەردەچێت و بە مسوڵمان دانانرێ... بۆیە خوای گەورە پێمان دەفەرمووێ: ﴿**قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ**...﴾ الانعام ١٦٢- ١٦٣. واتە: بڵێ نوێژ كردنم و قوربانی دانم و ژین و مردنم بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەو هیچ هاوەڵێكیشی نی‌یە واش فەرمانم پێ كراوە (كەبیپەرستم و هاوەڵی بۆ دانەنێم). یان دەفەرمووێ: ﴿**وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ يَدْعُوا مِنْ دُونِ اللَّهِ**...﴾ الاحقاف ٥. واتە: كێ لەوە گومراترە كە داوا لە غەیری خوا بكات و غەیری خوا بپەرستێ؟

## پ٢٣/ پێغەمبەر محمد ﷺ كێیە؟ كە بریتی‌یە لە بنچینەی سێیەم؟

و: ناوی تەواوی (**محمد**)ی كوڕی (**عبدالله**)ی كوڕی (**عبدالمطلب**)ی كوڕی (**هاشم**)ە لە هۆزی قوڕەیشی عەرەبە نەوەی (**اسماعیل و ابراهیم**)ە. *علیهم وعلی نبیّنا افضل الصلاة والسلام*. لەساڵی (٥٧١) ی زایینی ڕۆژی دووشەممەی مانگی (ربیع الاول) لە دایك بووە.

هەروەها (٦٣) ساڵ تەمەنی لە ژین بردۆتە سەر كە (٤٠) ساڵی پێش پێغەمبەرایەتی بووە و (٢٣) ساڵیش پێغەمبەر بووە.

یەكەم سوورەت كە مژدەی پێغەمبەرایەتی پێدا سوورەتی (**اقرأ**) بووە (١٠) ساڵ لە (مەككە) دوای (٣) ساڵ بانگەوازی نهێنی، داوای یەك خواناسی و خوا پەرستی كردووە، لە ساڵی (١٠)یەمی پێغەمبەرایەتی بەرەو ئاسمان هەڵكشاوە و هەر لەوێش (٥) فەرزەی نوێژ فەرز كراوە. (١٣) ساڵ لە دوای پێغەمبەرایەتی لە (مەككە) ماوەتەوە پاشان كۆچی كرووە بۆ (مەدینە)، كاتێ كە لە (مەدینە)جێگیر بوو فەرمانی‌دا بە جێبەجێ كردنی شەریعەتەكانی تر وەكو زەكات و ڕۆژو و حەج و بانگ دان و جیهاد و فەرمان بە چاكە و بەرهەڵستی لە خراپە...هتد. دوای (١٠) ساڵ لە

مەدینە ئنجا لە (١٢)ی ربیع الاول ساڵی (١١)ی کۆچی لە تەمەنی (٦٣)ساڵی‌دا، کۆچـی دوایـی کردووە، بەڵام ئایینەکە هەرماوە و هەر دەشمێنێت تاوەکو ڕۆژی دوایی.

# بەشی سێیەم

# یەکخواناسی (التوحيد) و هەقیقەتی باوەڕ

## پ٢٤/ یەکخواناسی (التوحيد) چی‌یە؟

و: بریتی‌یە لەوەی کە بە تەنها یەك خوا بناسی و هەر ئەویش بپەرستی. دەکرێت بە سێ بەش دە ئەمانەن:

١) یەکخواناسی لە خوایەتی (**التوحيد في الالوهية**).

٢) یەکخواناسی لە پەروەردگارێتی (**التوحيد في الربوبية**).

٣) یەکخواناسی لە ناو و سیفەتەکانی (**التوحيد في الاسماء والصفات**).

## پ٢٥/ یەکخواناسی لە خوایەتی خوا (الالوهية) یانی چی؟

و: واتە باوەڕ هێنانێکی ڕاستەقینە بەوەی کە خوایەکی هەقە و هەر ئەو مافی پەرستنی هەیە، وە لە ڕێگەی خوا پەرستی هەر ئەو خوایە بە تاك بزانی.

## پ٢٦/ ووشەی ﷲ مانای چی‌یە؟

و: زانایان لە چۆنیەتی پەیدا بوونی و تەفسیر کردنی ئەم ووشەدا دوو ڕایان هەیە:

**یەکەم**: هێندێك هەن دەڵێن ئەم ووشەیە لە هیچ چاوگ (**مصدر**)ێکەوە نەهاتووە و ناوی تایبەتی زاتی خوایە.

**دووەم**: هێندێك دەڵێن لە چاوگێکەوە هاتووە، لەسەر چاوگەکەش ڕای جوێ جوێ هەیە بۆ وێنە:

١) دەڵێن لە (**أَلَهَ**)ە هاتووە چونکە (**آلَهْتُ إِلَى فُلانْ**) واتە بە هۆی وی ئارامم بۆ هات.

٢) دەڵێن لە (**أَلَهَ الرَّجُلُ يَأْلَهُ**)وەوە هاتوە، واتە: لە ئاقار بەلایەکەوە دەستەوسان بوون و ڕزگار بوون بە هۆی یەکێکی دیکەوە.

٣) دەڵێن لە (**آلَهَ الرَّجُلُ إِلَى رَجُلٍ**)یەوە هاتووە، واتە: بە هۆی شەوق و خۆشەویستی‌یەوە ڕووی تێ‌کرد.

٤) دەڵێن لە (**آلَهَ إِلهَةُ وأُلُوهَةً**)وەوە هاتووە، واتە: پەرستی و بەندایەتی بۆ کرد.

٥) بەعزێکیش دەڵێن لە (**لاهَ يَلِيهُ**)وەوە هاتووە، واتە: خۆی پەنهان کرد.

٦) تاقمێکیش دەڵێن لە (**الوَلَهُ**)وەوە هاتووە، (**وَلَـهُ**)یش واتە: سەرسامی و مات و حەیران بوون.

کەواتە ﷲ ئەو زاتە پاکەیە:

أ) ئینسـان بـه هـۆی ویـەوە دڵـی ئـارام دەگـرێ: ﴿أَلَا بِذِكْرِ اللهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ...﴾ الرعد ٢٨.

ب) ئینسان لە کاتی تەنگانەدا هانای وەبەر دەبات و رزگاریان دەکات: ﴿أَمَّنْ يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ﴾ النمل ٦٢.

ج) ئینسان لە ئەنجامی سۆز و خۆشەویستی‌یەوە ڕووی تێدەکـات: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِلَّهِ﴾ البقرة ١٦٥.

د) ئینـسـان دەیپەرستێ و بەندایەتی بۆ دەکات: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ الفاتحة ٥.

هـ) ئینسان ناتوانێ (لە دونیا) ببینـێ و لـە پێـش چـاوانی شـێرداوە و پەنهانـە: ﴿لَا تُدْرِكُهُ الْأَبْصَارُ﴾ الانعام ١٠٣.

و) ئینسان لە ئاقار ناسینی‌دا مات و حەیران و سەرسامە و نـاتوانێ پـەی بـە زات و ماهیـەتی بەرێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾ الشورى ١١.

## پ٢٧/ چـۆن یـەك خـوا ناسـی لـە خوایـەتی خـوا (الالوهیـة) دەچەسپێ؟

و: بەوەی کە دروشمەکانی پەرستن تەنها بۆ ئەو بکەیت، وەکو:

١) (خوا)ت لە هەموو کەس زیاتر خۆش بوێ، نابێ کەسێکی ترت لە (خوا) خۆشـتر بوێـت یان بەقەد ئەم یەکێکی تـرت خۆشـتر بـوێ، چونکـە بـەم ڕفتـارە تووشـی شیرك دەبیـت. هەروەك خوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَتَّخِذُ مِنْ دُونِ اللهِ أَنْدَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللهِ، وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِلَّهِ﴾ البقرة ١٦٥. واتـە: هێندێـك لـە خەڵکی هەن غەیری خوایان بەقەد خوا خۆش دەوێ، بـەڵام ئـەو کەسـەی کـە بـڕوادارە خوای لە هەموو کەس خۆشتر دەوێ.

٢) خوای خۆت بە تاك بزانی لـە ڕێگـەی پاڕانـەوە و پشـتی خـۆ پێبەسـتن و تکـاوە، هـەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَلَا تَدْعُ مِنْ دُونِ اللهِ مَا لَا يَنْفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ فَإِنْ فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِنَ الظَّالِمِينَ﴾ یونس ١٠٦. واتە: داوا لە غەیری خوا مەکـە کـە سـوود و زیانی تۆیان بە دەست نی‌یە، ئەگەر وات کرد ئەوا تۆ دەچیتە ڕیزی زۆرداران.

٣) خوای خـۆت بـە تـاك بزانـی لـە ڕێگـەی ترسـان لـە خـواوە، هـەروەك خـوای گـەورە دەفەرمووێ: ﴿فَإِيَّايَ فَارْهَبُونِ﴾ النحل ٥١. واتە: بە تەنیا لە من بترسن.

٤) خوای خـۆت بـە تـاك بزانـی لـە هـەموو جـۆرە بەندایەتی‌یـەك کـە دەکرێ چ بەندایـەتی لاشەیی وەك (نوێژ و کڕنووش و سوژدە و ڕۆژو و قوربانی سەربڕین و سووڕان بە دەوری ڕووگە) چ گوفتاری وەك (لە خۆ گرتن و داوای پەشیمانی و لێخۆش بوون) بێ.

## پ٢٨/ یەکخواناسی لە پەروەردگاریتی (الربوبیة) خوا یانی چی؟

واتە: باوەڕهێنانێکی ڕاستەقینە بەوەی کە خوا وەدیهێنەر و پێگەیەنەر و بەخێوکەری هەموو شتێکە، غەیری ئەو هیچ کەسی تر نی‌یە، واتە: خوا بەیەك زانین لە ڕێگەی ئەوە کە خوای پەروەردگار بە تەنها بۆ خۆی (**خالق و مالك و رازق و محي و مميت و ضار و نافع و مدبر الامر**)ە. واتە خوا (دروست کەر و خاوەن و ڕۆزی دەرو زیندو کەرەوە و مرێنەر و زیان گەیەنەر و سودگەیەنەر و کار هەڵسوڕێنەری بوونەوەرە)، غەیری ئەم هیچ کەس ئەم توانایەی نی‌یە.

## پ٢٩/ ووشەی (رب) مانای چی‌یە؟

و: ووشەی (رب) لە بنچینەدا بە مانای (**التربیة**) دێت، واتە پەروەردە. هێندێك جارانیش بە مانای (هەڵسوڕاندن و چاك کردنەوە و تەواوکردن) دێ.بنچینەی ووشەی (**التربیة**)ش لە (**ربوة**)وە هاتووە، واتە (تەپۆلکە) بۆیەش خوای گەورە ئەم ووشەیەی بەکار هێناوە تاوەکو خەڵکی لە وەرگرتنی ئەم دینە کام شت هەوراز و ناخۆشی زیاترە ئەم شتە جێ‌بەجێ بکات، چونکە ئەگەر هەرکەسێك ئامادە بێت فەرمانە قورسەکانی ئیسلام جێ‌بەجێ بکات ئامادەشە ئاسانەکان دا‌بەرێنێت.

## پ٣٠/ لە قورئاندا ووشەی (رب) بە چەند مانا هاتووە؟

و: بە پێنج مانا هاتووە کە بریتین لە:

١) **چاودێری بە پێک هێنانی پێویستی‌یەکان و هەڵسان بە پەروەردەکردن و پێگەیاندن**، هەروەك خوای پەروەردگار لەسەر زمانی (یوسف) پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿قَالَ مَعَاذَ اللَّهِ إِنَّهُ رَبِّي أَحْسَنَ مَثْوَايَ﴾ یوسف ٢٣. واتە: بە ڕاستی کارم بەم جۆرەیە: خوا کاربەدەست و پەروەردەکەر و خاوەنی منە، جێ و شوێن و پلە و پایەی منی چاك و شیرین کردووە، یان: پەنا بە خوا ئەو (مێردی ئەو ژنە عەزیزی میسر) چاودێری کەرو داشتیاری منە و بە چاکترین شێوە جێگای منی کردۆتەوە.

٢) **چاودێری بەسەر چاك کردنی حاڵی خەڵکی**، هەروەك خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِي إِلَّا رَبَّ الْعَالَمِينَ، الَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهْدِينِ، وَالَّذِي هُوَ يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِ، وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ﴾ الشعراء ٧٧-٨٠. واتە: ئەوان دوژمنی منن، تەنها پەروەردگار نەبێ، ئەوەی کە منی دروست کردووە، هەر ئەویش ڕێم نیشان دەدا، خواردن و خواردنەوەم پێدەدا، کاتێکیش کە نەخۆش بم ئەو شیفام دەدا.

٣) بە مانای **سەرکردە** دێت **کە خەڵکی لە دەوری کۆدەبنەوە** و کارەکان دەچێتەوە بەردەست ئەو هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿قُلْ يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا﴾ سبأ ٢٦. واتە: پێیان بڵێ پەروەردگارمان کۆمان دەکاتەوە، هەروەها دەفەرمووێ: ﴿ثُمَّ إِلَى رَبِّكُمْ مَرْجِعُكُمْ﴾ الزمر ٧. واتە: پاشان بۆ لای پەروەردگارتان دەگەڕێنەوە.

٤) بە مانای **خاوەن دەسەلات** دێ، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَاباً مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾ التوبة ٣١. واتە: گاور و دیانەکان، قەشە و مالەکانی خۆیان (کە خاوەنی دەسەلات بوون) دەپەرستن لە جیاتی خوا.

٥) بەمانای **خاوەن** دێت، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَذَا الْبَيْتِ الَّذِي أَطْعَمَهُمْ مِنْ جُوعٍ وَآمَنَهُمْ مِنْ خَوْفٍ﴾ قريش ٣-٤. واتە: با خاوەنی ئەم رووگە (**كعبة**)یە بپەرستن کە لە برسی‌یەتی تێری کردن و لە ترس دڵنیای کردن.

## پ٣١/ ئایا هاوبەش دانەرەکانی مەککە بڕوایان بە پەروەردگاریتی خوا هەبوو؟

و: بەڵێ بە پێی ئەم بەلگانەی خوارەوە:

١) ﴿قُلْ لِمَنِ الْأَرْضُ وَمَنْ فِيهَا إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ، سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ، قُلْ مَنْ رَبُّ السَّمَوَاتِ السَّبْعِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، سَيَقُولُونَ لِلَّهِ، قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ، قُلْ مَنْ بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ. سَيَقُولُونَ لِلَّهِ﴾ المؤمنون ٨٤-٨٩ واتە: بڵێ زەوی و ئەوەی کە تیایەتی هی کێیە ئەگەر دەزانن؟ وەڵام دەدەنەوە و دەڵێن: هی خوایە، تۆش پێیان بڵێ: دەی کەواتە: بۆ یادی ئەو خوایە ناکەن؟ ئینجا پێیان بڵێ: کێ پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکان و خاوەن عەرشی گەورەیە، وەڵام دەدەنەوە ودەڵێن: خوا، تۆش پێیان بڵێ: دەی کەواتەبۆ پارێزگار نابن؟ هەروەها پێیان بڵێ: کێ هەموو موڵکی دونیای لە دەستە کە هەموو کەس پەنای بۆ دەبات و ئەو پەنا ناباتە بەرکەس ئەگەر دەزانن، وەڵام دەدەنەوە ودەڵێن: (خوا).

٢) ﴿وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى﴾ الزمر ٣. واتە: ئەوانەی کە غەیری خوا دەکەن بە دۆست و خوای خۆیان (دەڵێن) ئێمە بۆیە ئەو بتانە دەپەرستین بۆ ئەوەی لە خوامان نزیك کەنەوە. یان دەڵێن ﴿هَؤُلَاءِ شُفَعَاؤُنَا عِنْدَ اللَّهِ﴾ یونس ١٨. واتە: ئەوانە شەفاعەتمان بۆ دەکەن لە لای خوا. هەروەك ئێستا خەڵکی نەفام دەچنە سەر گۆڕی پیاو چاکان ودەڵێن: ئەو پیاو چاکانە (شەفاعەت)مان بۆ دەکەن لە لای خوا! بێ‌ئاگان لەوەی کە هیچ پیاو چاکێك توانای شەفاعەتی نی‌یە مەگەر خوا ماوەی بدات.

## پ٣٢/ ئەی ئەگەر بێباوەڕەکانی مەککە بڕوایان بە پەروردگارێتی خوا هەبوو، بۆچی پێغەمبەر ﷺ بە کافری حسێب دەکردن و شەڕی لەگەڵ دەکردن؟

و: ڕاستە کە بێباوەڕەکان بڕوایان بە پەروەردگارێتی خوا هەبوو، بەڵام لە جیاتی ئەو بپەرستن دار و بەردیان دەپەرست، یان گەورە و دەسەڵات دارەکانیان دەپەرست. هەروەها کار و پیشەی سەرەکی ئینسان دەبێ بریتی بێ لە خوا پەرستی، چونکە ئینسان هەر بۆ ئەوە خولقاوە، کەواتە ئەگەر ئەمەی نەکرد هەرچی بکات هیچ سودێکی پێنادات. چونکە تەنها بڕوا بوون بە پەروەردگارێتی خوا لە کوفر ڕزگارت ناکات تاوەکو دان نەنێیت بە خوایەتی خوا و بە کردەوە نەیپەرستی.

## پ٣٣/ یەکخواناسی لە ناو و سیفەتەکانی خوا چییە؟

و: دڵ دامەزران و دان پێداهێنانی تەواو بەوە کە بەس خوا **(سبحانه وتعالی)** خاوەنی هەموو سیفەتە بەرز و تەواوەکانە و لە هەموو هەڵەو پەڵەیەك دوورە، وە ئیسپات کردنی ئەمەش بەکردار، بەوە دەبێ کە هەر ناو و سیفەتێك (خوا) بۆ خۆی دیاری کردبێ یان پێغەمبەر ﷺ دانی پێدا هێنابێ لە قورئان و سوننەت دا هاتبێ، دەبێ بۆ خوا بڕیار بدرێ بەبێ **(تحریف و تعطیل وتكیف وتشبیه)**.

## پ٣٤/ یەکخواناسی لە ناو و سیفەتەکانیدا لەسەر چەند بنچینە دادەمەزرێ؟

و: لەسەر سێ بنچینان دادەمەزرێ کەبریتین لە:

١) بە پاك گرتنی خوا لە هەموو لەکەو ناتەواوییەك و لە پێچوونی دروست کراوەکانی.

٢) بەڕاست دانان و دان پێداهێنانی هەموو ئەو سیفەتە بەرز و بێ وێنانەی (خوا) کە لە قورئان و سوننەتدا هاتوون بەبێ کەم و زیاد و گۆڕین و دەست کاری.

٣) بێهیوا بوون لە پەی بردن بە چۆنیەتی ئەو ناو و سیفەتانە.

## پ٣٥/ بەڵگەی ئەم سێ بنچینەیە چین؟

و: بۆ خالی یەکەم و سێیەم خوای گەورە دەفەرمووی: ﴿وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ﴾ الاخلاص ٤. واتە: هیچ کەس و هیچ شتێك هاوتاو وێنەی خوا نییە لە تەواوی و بێ پەڵەییدا لە زاتیو هەم لە ناو و سیفەتەکانیدا یان دەفەرمووێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾الشوری ١١. واتە: هیچ کەس و هیچ شتێك وەك ئەو نین نە لە زات و نە لە سیفات.

بۆ بەڵگەی دووەم خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَهُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ یان ﴿وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ﴾ یان ﴿وَهُوَ الْعَلِيُّ الْحَكِيمُ﴾ یان ﴿الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى﴾.

## پ٣٦/ مەبەستمان چی‌یە کە دەڵێین نابێ ناو و سیفەتەکانی خوا (تحریف و تعطیل و تشبیه و تکیف) بکرێن؟

و:

١) **(تحریف)** واتە: نابێ ناو و سیفەتەکانی خوا دەسکاری بکرێن و بەبێ کەم و زیاد و گۆڕینی سەر (**فتحة**) و (**ضمة**) بۆ ناوەکانی واتە ئایەتی ﴿وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيمًا﴾ بکرێت بە ﴿وَكَلَّمَ اللَّهَ مُوسَى تَكْلِيمًا﴾ هەروەها نابێ بە جۆرێک (*تأویل*) بکرێن، کە مانای ئەسڵی‌یان نەمێنێ.

٢) **(تعطیل)** واتە: (لە کار خستن) ئەمیش بریتی‌یە لەوە کە نابێ لابردن و ئینکاری کردنی ناو و سیفەتەکانی خودای گەورە بکرێ، ئەو تاقمەی کە (**تأویل**)ی ناو و سیفەتەکانی خودای گەورە دەکەن (**جهمي**)یان پێ دەڵێن.

٣) **(تشبیه)** واتە: (وێچواندن) ئەویش ئەوەیە کە نابێ سیفەتەکانی خودای گەورە بە دروست کراوەکانی بچوێنی وەکو ئەوەی کە دەست و گوێ و بینینی (خوا) وەك دروست کراوەکانی سەیر بکەی.

٤) **(تکیف)** واتە: (چۆنیەتی) ئەویش ئەوەیە کەنابێ لە چۆنیەتی و هەقیقەت و ناوەڕۆکی سیفەتەکانی خوا بکۆڵیتەوە.

## پ٣٧/ سیفەتەکانی خوا چەند جۆرن؟

و: سیفەتەکانی خوا دوو جۆرن کە بریتین لە:

**یەکەم**: **سیفەتە زاتی‌یەکان** (**الصفات الذاتية**): کە بریتین لە (زانیاری، ژیان، ویست، توانا، دیتن، بیستن، ڕوو، قسەکردن، هەربوویی، هەمیشەیی، مەزنی، بێ‌نیازی، بەرزەیی، کاربەجێ‌یی).

**دووەم**: **سیفەتە کاری‌یەکان** (**الصفات الفعلية**) کە بریتین لە: (بەرز بوونەوەی سەر عەرش، هاتنە خوارێ بۆ ئاسمانی دونیا، پێکەنین، ڕازی بوون، خۆشویستن، ڕق لێ‌هەڵستان، شادی، توڕەیی).

## پ٣٨/ ئایا چی دەزانی دەربارەی ناوەکانی خوا؟

و:

١) دەبێ باوەڕمان وابێ کە ناوەکانی خوا نەبەستراونەوە بە (٩٩) ناو، وەك زۆر لە موسوڵمانان وا حاڵی بوو ون، ئەوەیش بە پێ‌ی ئەم فەرموودەیەی کە دەفەرمووێ: ﴿أَسْأَلُكَ بِكُلِّ اسْمٍ هُوَ لَكَ

سَمَّيْتَ بِهِ نَفْسَكَ أَوْ أَنْزَلْتَهُ فِي كِتَابِكَ أَوْ عَلَّمْتَهُ أَحَداً مِـنْ خَلْقِكَ أَوْ إِسْتَأْثَرْتَ بِـهِ فِـي عِلْمِ الْغَيْبِ عِنْدَكَ﴾ رواه احمد. واته: داوات لێ دەكەم بە هەموو ناوێك كە هی تۆیەو خۆت پێ نـاو ناوە، یان لـە كتێبەكـەت دا ناردووتـە خـوارەوە، یـان فـێری بەندەیـەكی خۆتـت كـردووە، یـان لە(غیب) لەلای خۆت هەڵتگرتووە.رەنگە لێرە دا یەكێك بپرسێ و بڵێ: ئەوەتـە نیـیە پێغەمبـەر ﷺ لە فەرموودەی ﴿إِنَّ لِلَّهِ تِسْعَةً وتِسْعِينَ إِسْماً مِائَةً إِلاَّ واحِدَةً مَنْ أَحْصَاهَا دَخَلَ الْجَنَّـةَ﴾ متفق عليه، دا ئاماژە بەوە دەكات كە خوا (٩٩) ناوی هەیە؟ ئێمەش دەڵێین نـەخێر،بـەڵكو لـەم فەرموودەیە وا دەردەكەوێ كە لە ناوەكانی خوا (٩٩) ناو هـەن هەركەسـێ بیـانژمێرێ دەچێتـە بەهەشت. چونكە ئەگەر وانە بووایە ئەوا فەرموودەكـە دەبـووە(ان اسماء ا لله تسعة وتسعون اسماً).(ا لله اعلم)

٢) ناوەكانی خوای گەورە (توقيف) ین بواری عەقڵی ئینسان نادەن بۆ پەی پێ بردنیان، بۆیە پێویستە لە قورئان و سوننەت وەربگیرێن و نە لێی زیاد كرێ و نە لێی كەم كرێ.

٣) ناوە پیرۆزەكانی خوای گەورە لە لایەكەوە ناون بۆ زاتێك و لە لایەكی تریشەوە ئاوەڵناو (صفة)ن بۆ ئەو زاتە. بۆ نموونە كاتێ خوا دەفەرمووێ ﴿ وَهُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ لە هەمان كاتدا دەفەرمووێ: ﴿ وَرَبُّكَ الْغَفُورُ ذُو الرَّحْمَةِ﴾ واتە، لە لایەك خوا ﴿رحيم﴾ ە بەلام لە هەمان كاتیش ووشەی ﴿رحم﴾ خۆی ئەو مانایە دەبەخشێ.

٤) ناوەكانی خوا دەست كاری ناكرێن و گۆڕان كاری بەسەر ماناكانیان نایەت، بەو مانایەی باوەڕ نەبوون بە هێندێكیان یان لادانیان لە ماناكەی خۆی، واتە نە (تعطيل) دەكرێن كە بریتییە لە لابردنی ناوەكە یان سیفەت و حوكمەكەی: وە نە (تشبيه) دەكرێن، واتە بەیەك چواندنی لە گەڵ سیفەت و كرداری دروست كراوەكانی.

## پ٣٩/ پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ لِلهِ تِسْعَةً وتِسْعِينَ إِسْمَاً، مِائَةً إِلاَّ واحِداً، مَنْ أَحْصَاهَا دَخَلَ الجَنَّةَ﴾ رواه البخاري. واتە: خوا (٩٩) ناوی هەیە هەركەسێك بیانژمێرێ دەچێتە بەهەشت. ئایا مەبەست لەم ژماردنە چۆنە؟

و: مەبەست لەم ژماردنە واتە:

١) یەك لەدوای یەك بیانژمێری.

٢) لە ماناكانی بگەیت.

٣) زۆربیری لێبكەیتەوە

٤) بەم ناوانە داوای لێبكەیت و خوای خۆتی پێ بپەرستی.

٥) كار بكاتە سەر ژیانت.

## پ٤٠/ئایا ئایەتی ﴿وَلِلَّهِ الأَسْمَاءُ الْحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَا﴾ مانای چی‌یە؟

و: واتە: خوای پەروەردگار خاوەن ناوی ڕێك و پێك و بە ناوەرۆکە و بەم ناوانە بانگی بکەن... مەبەست لەو ڕێك و پێکیەش (**الحسنى**) واتە:

١) ناوەکانی خوا: لەو پەڕی ڕێك و پێکین. بۆ نموونە کاتێ دەڵێ‌ی: (**الحي**) واتە: ژیانێکی بێ سەرەتا و بێ کۆتایی، یان (العلیم) واتە: زانیاری تەواو و نەبڕاوە، یان (**الرحمن**) واتە: لە هەموو کەس بە بەزەیی ترە بە جۆرێك هێندە بە بەزەیی‌یە بەرامبەر بە بەندەکانی زیاتر لە دایکێك بۆ کۆرپەکەی.

٢) ناوەکانی خوا گشتیان ناونیشانن بۆ خودی خۆی: واتە: کاتێك کە خوا ناوی (**رحیم**)ە سیفاتی (**رحیم**)یشی هەیە، یان ناوی (قادر)ە سیفاتی (قادر)یشی هەیە، بە کورتی دەتوانین بڵێین: هەموو ناوەکانی خوا وەسفن بۆ خودی (**الله**).

٣)گشت ناوەکانی خوا بواری بیرکردنەوەی ئادەمیزاد نین. واتە: ئادەمیزاد بۆ پەی بردن بەناوەکانی خوا (وەك و خۆی) دەستە وسانە.

## پ٤١/ پێنج بنچینەی گرنگ بژمێرە لەمەڕ ناووسیفەتەکانی خوا؟

و:

**یەکەم**: قسە کردن لەهێندێ سیفەت وەکو قسە کردنە لەهەموو سیفەتەکانی، بۆ نموونە: دان بەهێندێ سیفەت لەسیفەتەکانی خوا بهێنێ پاشان بڵێین ئەمانە سیفاتی هەقیقین.. وەکو (**الحیاة والعلم والقدرة والسمع والبصر والکلام والارادة**) بەڵام (خۆشەویستی ورەزامەندی وتووڕە بوون ورق هەڵسان) بە سیفاتی (**مجازي**) دابنێین!! بێگومان هەڵوێستی ئەم کەسانەش وەك ئەوە وایە کەدان بەهیچ سیفەتێکی خوا نەنێن؟! هەروەها ئەوانەی دەڵێن خوا ناوی (**حي**) یە بە بێ ئەوەی سیفەتی بێ، یان ناوی (**علیم**) ە بەبێ ئەوەی سیفەتی (**علم**)ی هەبێ، دیسان ئەوانە وەك ئەوانەن کەدان بەهیچ سیفەتێکی خوا نەیەنن.

**دووەم**: قسە کردن دەربارەی سیفەتەکانی خوا قسە کردنە دەربارەی زاتی خودا : واتە: هەرچی دەربارەی سیفەتەکانی خوا بگوترێ ئەوا دەربارەی زاتی خوا گوتراوە. بۆ نموونە: کاتێ کەخوای پەروەردگار دەفەرموێ (خوا لەسەر عەرشە) بەڵام یەك بڵێت نەخێر خوا لەسەر عەرش نی‌یە!! ئەوە وەك ئەوە وایە کە نکۆڵی لە بوونی (**وجود**) ی خوا بکات!!

**سێیەم**: لەکار خستنی (**تعطیل**) ی سیفەتەکانی خوا، خۆی لەخۆیدا باوەڕ بوونە بە وێکچوون (**التشبیه**): چونکە باوەڕی وایە کە سیفەتەکانی خوا بەسیفەتی دروست کراوەکانی دەچێ بۆیە لەکاری دەخات.

واتە: پێش ئەوەی (**تعطیل**) ی سیفەتەکانی خوا بکات، سیفەتەکانی خوای گەورەی (**لشبیە**) کردووە بە دروست کراوەکانی. چونکە (**تعطیل**) کردنی سیفەتەکانی خوا بۆ خۆ ڕزگار کردنە بە وێك چواندن بە دروست کراوەکانی خوا.

**چوارەم**: ئایەتـەکانی قورئـانی پیرۆز دەربـارەی ڕواڵـەتی سیفەتەکانی خـوا لێکچووەکـان (**المتشابه**) نین واتـە هیـچ ئایەتێك لـەبارەی سیفەتەکانی خـوا نیـیـە مانـای دیـار نـەبێ. تـاوەکو پێویستیان بە (**تأويل**) هەبێ..

پێنجەم: هەقیقەتی (**تأويل**)

أ- بەواتای سەرەنجامی ڕاستەقینەی هەر شتێك دێت لێدوا قۆناغیدا، بـۆ نموونـە سـەرەنجامی ڕاستەقینەی ئینسـان زینـدوو بوونەوەیـەتی لـەڕۆژی دوایـی ئـەمـەش هەقیقـەتێکی قورئانیـیـە کـە دەفەرموێ: ﴿**ولما يأتهم تأويله**﴾ یونس٣٩ واتە: هێشتا بۆیان نەهاتووە دوایـەتر ڕۆژ سـەرەنجامی بـڕوا نەهێنانەکەیان. یان دەفـەرموێ: ﴿**هـل ينظـرون إلا تأويلـه..**﴾ الاعراف٥٣ واتـە: ئایا بـێ بڕوایـان چاوەڕوانی هیچ شتێ دەکەن جگە لەدواڕۆژ وسەرەنجامە ڕاستەکەی؟

ب- (**تأويل**) بە مانای (**تفسير**) لێکی دەدەنەوە.

ج- (**تـأويل**) بـە مانـای گۆڕینـی ووشـەیەکی ئاشکرا، لەبـەر بەڵگەیــە ك کـە هەیـە، ئـەم (**تأويل**)ەش لە لای زانایانی ئوسول وایە. گۆڕینی واتـای ووشـەیەکی ئاشکراش لەلایـەن زانایـان دەکرێتە سێ بەش:

١- واتاکە دەگۆڕێ لەبەر بوونی بەڵگەیەکی دروسـت لـە قورئـان و سوننەت، ئەمەشیان لـە شەریعەتی ئیسلامدا دروستە.

٢- گۆڕینی واتای ووشەیەك کە گوایە زانایەکی (**مجتهد**) کاتێ خۆی وای بۆ چووە کە دەبـێ ئەم ووشەیە (**تأويل**) بکرێ، کەچی (**تأويل**)یش ناکرێ، ئەمەش پێی دەگوترێ (**تـأويل**)ی دوور و هەڵە.

٣- گۆڕینی واتای ووشەیەك بەبێ بەڵگە، ئەمە پـێی دەگوتـرێ گاڵتـەکردن بـە دیـن.. وەك ئەوانەی کە (**استوى**) بە (**استولى**) لێك دەدەنەوە یان (**يد**) بە (**قدرة**) یان (**وجه**) بـە (**ذات**) ئەمانـە گشتیان گاڵتە کردنن بە دینی خوا.

## پ٤٢/ ئایا سیفەتەکانی خوا فراوانترن یان ناوەکانی؟

و: سیفەتەکانی خوا فراوان ترن لە ناوەکانی. بۆ نموونە هـەر هـەموو ناوەکـانی خـوا سیفاتی خوان، بەڵام خوا چەندین سیفەتی تریشـی هەنـە کـە نـاونین بـۆ خـوا، بـۆ نموونـە خـودای گـەورە دەفەرموونێت:

﴿وَجَاءَ رَبُّكَ﴾ یـان ﴿إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ﴾ یـان ﴿فَأَخَذَهُمُ اللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ﴾، لێرەدا دەبینین کەوا (**جاء، بطش، اخذ**) گشتیان سیفەتی خوان بەڵام ناونین بۆ خوا.

# بەشی چوارەم

# بـــــــاوەڕ (الإيمـان)

## پ٤٣/ باوەڕ (الايمان) چی‌یە؟

و: لە زمانەوانی (اللغة)دا بە مانای (**بە ڕاست دانان**-التصديق) دێت، هـەروەك كـاتی خـۆی براكانی (يوسف) (عليه السلام) بە باوكیان گوت: ﴿وَمَا أَنْتَ بِمُؤْمِـنٍ لَنَـا وَلَوْ كُنَّـا صَـادِقِينَ﴾ يوسف ١٧. واتە: تۆ بە ئێمە بڕواناكەیت، ئەگەر ئێمە ڕاستیش بكەین.

هەروەها لە (**شەریعەت**)دا باوەڕ بریتی‌یە لە: باوەڕ هێنـان بـە (خـوا، فریشـتەكان، كتێبـەكان، پێغەمبەران، ڕۆژی دوایی، قەزا و قەدەر) كە هەموویان ڕوكنەكانی باوەڕ پێك دەهێنن.

## پ٤٤/ بنچینەكانی بیرو باوەڕی ئیسلامی چین؟

و: بنچینەكانی بیر و باوەڕی ئیسلامی بریتین لە باوەڕهێنان بە (خوا، فریشتەكان، كتێبـەكان، پێغەمبەران، ڕۆژی دوایی، قەزا و قەدەر) هەروەك لە كاتی خۆی پێغەمبەری خوا ﷺ لـە پرسـیاری (جبريل-عليـه السـلام) كـاتێ لێی پرسـی (**ئیمـــان**) چی‌یـە؟ فـەرمووی ﴿**الإِيمَـانُ أَنْ تُؤْمِـنَ بِاللهِ وَمَلاَئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ**﴾ رواه مسلم.

## پ٤٥/ باوەڕ بە خوا چی‌یە؟

و: باوەڕ بە خوا بریتی‌یە لە: (بڕوایەكی پتەو بـەوەی كـە خـوای گـەورە وەدیهێنـەری هـەموو شتێكە، وە هەر خۆی شیاوی پەرستنە ئەویش لە ڕێگەی نوێژ و ڕۆژو و پاڕانەوە و تكاو ترس و خـۆ بە كەم زانین و مل كەچایەتی‌یەوە، هەروەها خوا وەسف كراوە بـە سـیفاتێكی پـاك و كـامل و بـێ خلەل)، هەروەها پێك دێت لە باوەڕ بە (خوایەتی خوا و پـەروەردگارێتی خـوا و نـاو و سـیفەتەكانی خوا).

## پ٤٦/ جۆرەكانی باوەڕ بە خوا چین؟

و: جۆرەكانی باوەڕ بە خوا چوار جۆرن:

١) باوەڕ بە بوونی خوا (**وجود الله**).

٢) باوەڕ بە پەروەردگارێتی خوا (**الربوبية**).

٣) باوەڕ بە خوایەتی خوا (**الالوهية**).

٤) باوەڕ بە ناو و سیفەتەكانی خوا (**الاسماء والصفات**).

## پ٤٧/ چۆن بوونی خوا دەسەلمێنیت؟

و: بە چوار شتان:

١) **زگماکی (الفطرة)**: ئادەمیزاد هەر لە زگماکی‌یەوە کە لە دایك دەبێ مسـوڵمانە هـەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿مَا مِنْ مَوْلُودٍ إلاَّ يُولَدُ عَلَى الفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِـهِ أَوْ يُنَصِّرَانِهِ أَوْ يُمَجِّسَانِهِ﴾ رواه البخاري. واتە: هەر منداڵێك کە لە دایك دەبێ بـەزگماك بە مسوڵمانی لە دایك دەبێ، ئینجا باوك و دایکی دەیکاتە جوولەکـە یـان خـاچ پەرسـت یان ئاگر پەرست.

٢) **بەڵگەی ژیری**: هەر شتێك لەم بونەوەرە بگریت ژیری رێت پێ‌نادات تا بڵێیت لە خـۆوە دروست بووە، یان بۆ خۆیان خۆیان دروست کـردووە، چونکـە لـە پێـش بوونـی خۆیـان نەبوونـە، ئیـتر چـۆن بـوون بـە دروسـت کـەری خۆیـان؟ هـەروەك خـوای پـەروەرگار دەفەرمووێ: ﴿أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الخَالِقُونَ﴾ الطور ٣٥. واتـە: ئایـا بـێ هیـچ شت درست کراون یان خۆیان خۆیانیان دروست کردووە؟

٣) **بەڵگەی شـەریعەت**: ئایینـە ئاسمانی‌یـەکان گشـتیان باسـی تـاك و تـەنیایی خـوا دەکـەن، هەروەك خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولاً أَنِ اعْبُدُوا اللهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ﴾ النحل ٣٦. واتە: بۆ هەر گەلێك پێغەمبەرێکمان ڕەوان کـردووە بۆ ئەوەی پێیان بڵێیت خوا بپەرستن و واز لە بێ‌بڕوایان بێنن.

٤) **بەڵگەی هەست کردن**: کاتێ کە لـە خـوا دەپاڕێینـەوە و دوعاکـەمان گـیرا بـوو، هەسـت دەکەین کـە خوایـەك هەیـە لـە دوای دوعاکـە دوعامـان گـیرا دەکـات، هـەروەك خـوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ﴾ الانفال ٩. واتە: کاتێ کە داوای کۆمەکی لە پەروەردگارتان دەکەن ئەو وەڵامتان دەداتەوە...

## پ٤٨/ چۆنـی تـر بوونـی خـوا دەسـەلمێنی یـان ئایـا کـێ ئێمـەی دروست کردووە؟ کێ ئەو هەموو درەختـەی دروسـت کردووە؟ کـێ ئـەم ئاسمـان و مـانگ و ڕۆژو ئەسـتێرانەی دروسـت کـردووە؟ کـێ ئـەم بوونەوەرەی دروست کردووە؟

و: بۆ وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانە، ئێمە کۆمەڵێك پرسیار و وەڵام دەخەینە بەر چاو:

- ئایا دەزانی ئەو کورسی‌یەی کە لەسەری دادەنیشی کێ دروستی کردووە؟

\+ بەڵێ: دارتاش دروستی کردووە.

- ئایا دەزانی ئەو خانووەی کە لە ناویا دەحەوێیتەوە کێ دروستی کردووە؟

\+ بەڵێ کرێکار دروستی کردووە.

- ئایا دەزانی ئەو قوتابخانەیەی کە تیایدا دەخوێنین کێ دروستی کردووە؟

+ بەڵێ: میری دروستی کردووە.
– ئایا دەزانی ئەم کات ژمێرەی لە دەستت دایە کێ دروستی کردووە و بۆ چی دروست کراوە؟
+ بەڵێ وەستایەکی زۆر زانا و شارەزا دروستی کردووە بۆ زانینی کات.
– ئایا دەشێ بڵێین ئەم کات ژمێرە، هەر لە خۆوە بە بێ وەستا دروست بووە؟
+ نەخێر، هەرگیز شتی وا نەبووە و نابێ کەوا شت سەر بە خۆ بە بێ دەستی هێزدار و زانایەك دروست بێ، چونکە قسەی وا قسەیەکی ستەم و پڕوپوچ و بێ مانایە و لە تەرازووی ئەقڵ و مەنتقیشدا کێشی بۆ نی‌یە لەبەر بێ‌بەڵگەیی.
– جاباشە، تا ئێستا دەرکەوت کە هەر شتێك هەر چەند بچوك بێ، وەك کات ژمێر و کورسی وەیا هەر چەن گەورە بێ وەکو قوتابخانە و زۆر شتی تر، دەبێ دروست کەرێکی هەبێ، ئەی چۆن دەشێ ئەم بوونەوەرە پەروەردگارێکی نەبێ کە لە سەرەتاوە دروستی کردبێ؟!!

## پ٤٩/ ئایا ڕاستە ئەڵێن ئەوەی بە چاو نەبینرێ نابێ بڕوای پێ‌بکرێ؟

و: ئەو کەسەی کە ئەم جۆرە قسانە دەکات... پێشەکی دەبێ دان بەوەدا بهێنێ کە بۆخۆی گەمژە و بێ عەقڵە... چونکە هەر شتێك گەر بە چاو نەبینرا بڕوای پێ‌نەکرێ، ئەوا عەقڵیش بە چاو نابینرێ کەواتە بە پێ‌ی ئەم بەڵگەیە هیچ کەس لە سەر ئەم زەوی‌یە نابینی کە خاوەن عەقڵ بێ گشتیان شێت ویڵ و سەر گەردان ژیان دەبەنە سەر.
خۆ زۆر شت هەن بە چاویش نابینرێن بەڵام دەبێ بڕوای پێ بکەین.. ئەم شتانەش وەکو (هەوا، هێزی موگناتیسی، گیانی ئادەمیزاد، هێزی کێش کردنی زەوی، گەردیلە، تەزووی کارەبا... هتد) ئەمانەش گشتیان بە چاو نابینرێن، بەڵام بڕواشمان پێ‌یان هەیە...

## پ٥٠/ ئایا بوونەوەر چۆن دروست بووە؟ یان کێ بوونەوەری دروست کردووە؟

و: بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە فەیلەسوف و زاناکانی جیهان هەر لە دێرین ڕۆژگارەوە هەتا ئەمڕۆ چەند تیۆرێکیان لەم بارەوە بووە... بەڵام ئەگەر هەموو ووتەکان هەڵسەنگێنین لەم چوار پێشنیار و تیۆرانە دەرناچن؟

١) دەڵێن ئەم بوونەوەرە بێ‌یاسایە، واتە بوونەوەر بەبێ یاسا بەڕێوە دەچێ.
٢) یان دەڵێن: ئەم بوونەوەرە بەرێکەوت دروست بووە.
٣) یان دەڵێن: (**سروشت – طبیعة**) ئەم بوونەوەرەی دروست کردووە.
٤) یان دەڵێن: (**خوا**)یەکی بە دەسەڵات و توانا دروستی کردووە.

**تیۆری یەکەم**: بوونەوەری بێ‌یاسا:

به بڕوای ئێمە، هەر کەسێك ساتێك وورد بێتەوە لە بوونەوەر تێ‌دەگات کە ئەم بوونەوەرە بەبێ یاسا هەڵناکات، تەنها یەك نموومە دەهێنینەوە، ئایا لە کاتی حەج کردنا کێ دەتوانێ لە قەرە بالغی ئەم ڕۆژە حەجی خۆی بکات بەڵام بەمەرجێ لەشی بە لەشی هیچ کەسێ نەکەوێ، ئایا کەسێك بڕوا دەکات کە دەڵێ ئەم ساڵ من چوومەتە حەج و حەجی خۆم کرد بەڵام بێ ئەوی شانم بە شانی کەس بکەوێ؟ بێ‌گومان نەخێر.. بەڵام خۆ ئەگەر ساتێك وورد بینەوە لە ئەستێرەکانی ئاسمان، کە زانایان دەڵێن هەر ئینسانێك لە ڕووی ژمارەوە (١٠) ملیۆن ئەستێرەی بەرامبەرە، کەچی ئەم ئەستێرانە بەردەوام لە ناو یەکدا هاتووچۆ دەکەن، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾ یس ٤٠. واتە: هەر هەموو ئەستێرەکان لە بۆشایی ئاسمان مەلە دەکەن بەڵام بێ ئەوەی هیچێکیان بەریەکتر بکەون... ئایا دەزانن بۆ؟

وەڵامەکەی ئەوەیە: ئەگەر هەر ئەستێرەیەك بەر ئەستێرەیەك بکەوێ دونیا تەخت و وێران دەبێ.

کەواتە: دەبێ بڵێین ئەم بوونەوەرە یاسایەك هەیە کە بەڕێوەی دەبات.

**تیۆری دووەم**: بوونەوەر بە ڕێکەوت دروست بووە.

بۆ ئەمەش دەتوانین نموونەیەك بهێنینەوە:

ئەگەر تۆ خاوەنی چاپخانەیەك بیت و ئەو چاپخانەیە نیو ملیۆن پیتی تێدا بێت یەکێ لە کرێکارەکانی چاپ خانەکەت هات گوتی: ئەم شەو بوومەلەرزەیەکی گەورە قەوماو هەموو پیتەکانی چاپخانە و کاغەز و کلێشەکان هەموویان تێکەڵاو بوون بەرێکەوت دیوانێکی شیعر چاپ بوو کە لە هەموو ڕوویەکی ونژەوانییەوە لەوپەڕی وردەکاری دایە لە ڕووی کێش و سەردا (**الوزن والقافية**) و مانا و ڕێزمانەوە هیچ نارێکی تیا نییە و پتر لە (٥٠٠) لاپەڕەیە، ئایا بڕوای پێ دەکەی؟

لە وەڵامدا هەقتە پێی بڵێیت، درۆی وا گەورەم قەت نەبیستووە و لە نیسانیش درۆی وا ناکرێت. چونکە ئەم قسەیە بە عەقڵی هیچ کەسێکا نایە و ئەمە شتێکی نەگونجاوە...

دەی باشە ئەگەر نموونەیەکی وا نەگونجاو بێ، چۆن دەگونجێ بڵێین ئەم بوونەوەرە فراوانە بە ڕێکەوت دروست بووە، کە شتی وای تیایە گەلێ لە ڕاددەی عەقڵی ئادەمیزاد بەدەرە، ئایا دەزانی ئەم ڕۆژە بە شێوەیەك لە ئاسمان دانراوە کە ئەگەر چەند میلێك لە زەوی دوور کەوێتەوە، هەموو دونیا دەیبەستێ، یان ئەگەر چەند میلێك لێی نزیك بێتەوە هەمووی گڕ دەگرێ، وەئایا دەزانی مانگ ئەگەر چەند میلێك لە زەوی دوور کەوێتەوە، هەرچی تەڕایەتی هەیە نامێنێ، یان ئەگەر چەند میلێك لێی نزیك کەوێتەوە، ئەوا دونیا بە بن ئاو دەکەوێت؟ ئەمە و چەندین نموونەی تر... کەواتە بوونەوەر بە ڕێکەوت دروست نەبووە.

**تیۆری سێیەم**: سروشت بوونەوەری دروست کردووە.

ئێمەپرسیارێك لە خاوەنی ئەم پرسیارە دەکەین و دەڵێین: بەڵگەتان چییە بۆ ئەم قسەیە؟

ئەقڵ و مەنتق و زانست ئەمە قبوڵ دەکا کە بڵێین و پڕوپاگەندە بکەین، کە سروشت ئادەمیزاد و گشت زیندەوەرەکانی دروست کردووە بەو شێوە جوانە؟

باشه ئەگەر ڕاستە بۆ هەتا ئێستا نەمان بینی و نەمان بیست کەوا سروشت بەڕێکەوت قوتابخانەیەك یا قەلأیەك وەیا تاکە ژوورێك، وەیا کات ژمێرێك، یا دەرزی‌یەك دروست بکات تا قەناعەتمان پێت کەوا زەوی و ئاسمان و ئەستێرەکانیش بەڕێکەوت (سروشت دروستی کردوون)!!.

ئەمانە گشتیان لەلایەکەوە، گریمان زەوی یاخود بڵێین سروشت بە هەرجۆرێك پیاوێکی بۆ یەکەم جار دروست کرد، باشە چۆن ئەقڵی پیا شکا و توانی ئافرەتێکیش لە چەشنی ئەم پیاوە دروست بکات کە لە چەند خاسیەتێك لە گەڵیا جیا بێت کە بشێت بۆ زاوزێ بە هۆی نزیك بوونەوەیان لە یەکتری!! کەواتە ئەم تیۆرە بە ڕاست دانانرێ.

**تیۆری چوارەم**: (خوا) ئەم بوونەوەرەی دروست کردووە:

بە پێی ئەم ڕوون کردنەوانەی سەرەوە بۆت دەردەکەوێ کە ئەم بوونەوەرە نەبەبێ یاسا و نە بە ڕێکەوت و نە بە سروشت دروست بوو ون، بەڵکو لە ژوور ئەمانەوە خوایەك هەیە کە بوونەوەری وەدیهێناوە هەر ئەویش هەڵیدەسوڕێنێ، چونکە لە پێش خوا هیچ شتێك نەبووە، هەر خوای تاك و تەنیا هەموو شتی دروست کردووە، بۆ زیاتر ڕوون بوونەوە نمونەیەك دەهێنینەوە:

ئەگەر لە ژمارە چوار بپرسیت کێ لە پێش تۆ هەبووە تا تۆ لە دوای بێیتە ناو ناوان؟ لە وەڵامدا دەڵێ: ژمارەی (٣) هەبووە، ئەگەر لە ژمارە (٣)ش بپرسیت تۆ ئەم ناوەت لە کوێ هێنا؟ لە وەڵامدا دەڵێ: لە ژمارە دووەم وەرگرت ئەگەر لە ژمارە (٢)ش بپرسی ئەی تۆ ئەم ژمارەیەت لە کوێ وەدەست کەوت؟ لە وەڵامدا دەڵێ: لە ژمارە یەکەم وەرگرت...ئەگەر لە ژمارە یەکیش بپرسی ئەی تۆ لەکوێوە هاتووی؟ لە وەڵامدا دەڵێ ئەم ناوە هی خۆمە لە هیچ شتێکم وەرنەگرتووە، چونکە پێش من ژمارە (**صفر**)ە کەواتە: ﴿هُوَ الْأَوَّلُ وَالْآخِرُ﴾ واتە: خوا هەر هەبووەو هەر دەشمینێ، ووشەی ( **هەر**)بۆ خۆی نامێنێ، لەکاتێك کە پێش خواش ووشەی (**هەر**) هەر نەبووە.

کەواتە: خوا بۆ خۆی هەر هەبووە و هەر ئەویش بوونەوەری دروست کردووە.

## پ٥١/ بۆ دەبێ باوەڕ بە خوا بهێنین؟

و: چونکە ئەگەر باوەڕ بەخوا نەهێنین، ئەوا:

١) لە ژیاندا وەکو ئاژەڵ دەژین، نازانین کە کێ دروستی کردووین و بۆچی دروست کراوین. هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ الْأَنْعَامُ..﴾ محمد ١٢. واتە: بێ بڕواکان ڕادەبوێرن و دەخۆنەوە هەروەکو ئاژەڵەکان.

٢) زەوی پڕ دەبێت لە ئاشوب و ئاژاوە.

نازانێ خوا بۆ ژیانی ڕەخساندوە و بۆ چیش تا سەرئەم ژیانە نامێنێ و خەڵکیش هەر دەبێ بمرن.

٣) بێ‌بەش دەبێ لە ڕەزامەندی خوا: هیچ کات خوا سەری نایە خێ و پشتی ناگرێت.

## پ٥٢/ باوەڕ بوون بە خوایەتی خوا (الالوهية) یانی چی؟

و: باوەڕ بوون بە خوایەتی خوا واتە: باوەڕ بوون بە:

١) دەسەڵاتدارێتی خوا، یان فەرمان ڕەوایەتی خوا (**الحاكمية**).
٢) ئاسایی کردنەوەی دەرد و نەخۆشی یەکانی ئادەمیزاد (**التهدئة**).
٣) زاڵ بوونی خوا بەسەر هەموو شتێك دا (**الهيمنة**).
٤) خوا پەنا دەداتە هەموو کەسێك (**الاجارة**).
٥) خوا لە دونیا بە چاو نابینرێ (**متوارياً عن الانظار**).
٦) خەڵك لە کاتی تەنگایی پێویستی پێ ی دەبێ و هانای بۆ دەبات (**يفزع اليه الانسان**).

## پ٥٣/ هەقیقەتی باوەڕ چی‌یە؟

و: بریتی‌یە لە بەڕاست دانان بە دڵ و دان هێنان بە زمان و سەلماندن بە کردار، هەروەك شێخ (**حسن البصري**) دەفەرمووێ: (**لَيْسَ الإِيْمَانُ بالتَّمَني ولا بالتَّحَلِّي ولَكِنْ مَا وقَرَ فِي القَلْبِ وصَدَّقَهُ الْعَمَلُ**). واتە: باوەڕهێنان بە ئاوات و خۆ ڕازاندنەوە نی‌یە بەڵکو باوەڕ ئەوەیە کـە لـە دڵـدا جێ‌گیر بێ و بەکردەوەش بیسەلمێنێ.

## پ٥٤/ گرنگی ئیمان چی‌یە لە ژیانی ئادەمیزاددا؟

ئینسان بەبێ ئیمان هیچ نرخێکی نی‌یە لە لای خوا، بۆیە لە سەر ئینسان پێویستە ئیمانێکی چاکی بە ئایینی ئیسلام هەبێ و کارەکانیش لە سەر بنچینەی ئیمانەوە جێ‌بەجێ بکات.

کەواتە ئیمان گرنگی‌یەکی حەتمی‌یە لە ژیاندا بۆنموونە:

١) ئینسان لە ڕێگەی ئیمانەوە تێکەڵ بـە بەندایـەتی خـوا دەبێـت، هـەروەك خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿**أَلا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللهِ لاخَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلا هُمْ يَحْزَنُونَ، الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ...**﴾ یونس ٦٢-٦٣. واتـە: بەڕاسـتی دۆسـتانی خـوا تـرس و خـەمیان بەسەرەوە‌نی‌یە، ئەو دۆستانەی کەوا بڕوایەکی پتـەویان هەیـە و هەمیشـە خـۆ لـە گونـاه دەپارێزن.

٢) بە ئیمان ڕەزامەندی خوا دروست دەبێ: ﴿**وَعَدَ اللهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ وَرِضْوَانٌ مِنَ اللهِ أَكْبَرُ ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ**﴾ التوبة ٧٢. واتە: خوا پـەیمانی داوەتـە بـڕواداران چ پیـاو و چ ژن کەوا بیان خاتە بەهەشت کەوا چەندین ڕووبـاری بـە ژێـردا دەڕوات و بـە نـەمریش تیایـا دەمێننەوە وە خانووی چاکیان لە بەهەشتی (عدن) بە نسیب دەبێ و ڕەزامەندی خواش بـۆ ئەم کەسـە لـەم ڕۆژەدا لـە هـەموو شـتێك گـەورە تـرە، بەڕاسـتی گـەورەترین سـەرکەوتنە بۆ وان.

٣) خوا بەرگری لە ئیمان داران دەکات:
هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿**إِنَّ اللهَ يُدَافِعُ عَنِ الَّذِينَ آمَنُوا**﴾ الحج ٣٨. واتـە: بەڕاستی خوا بەرگری دەکات لە ئیمان داران.

٤) ئیمان دەبێتە مایەی دروست بوونی ژیانێکی خۆش و کامەرانی، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿مَنْ عَمِلَ صَالِحاً مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنـثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُمْ بِأَحْسَنِ مَاكَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ النحل ٩٧. واتە: هەرکەسێك کردەوەی چاك بکات لە پیاو و لە ژن بەمەرجێ برِوادار بێ ئەوا دەیان خەینە ژیانێکی زۆر خۆشەوە و پاداشتیشیان دەدەینەوە بە چاکتر لەوەی کردوویانە.

٥) ئیمان دەبێتە مایەی رۆشنکەرەوەی دڵ.هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَمَنْ يُؤْمِنْ بِاللهِ يَهْدِ قَلْبَهُ﴾ التغابن ١١. واتە: هەرکەسێك بروا بێنێ بە خوا، دڵی رۆشن دەبێتەوە.

٦) ئیمان دەبێتە مایەی خۆشەویستی خوا.هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ الرَّحْمَنُ وُدّاً﴾ مريم ٩٦. واتە: ئەوانەی کە بروایان هێناوە و کردەوەی چاك ئەنجام دەدەن خۆشەویستی خوایان بۆ دروست دەبێ.

٧) خوای گەورە پلەی ئیمان داران بەرزدەکاتەوە: هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿يَرْفَعِ اللهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا العِلْمَ دَرَجَاتٍ﴾ المجادلة ١١. واتە: خوای گەورە پلەی بروادارانی گەر ئێوە و ئەوانەی کە زانست و زانیاریان پێ دراوە بە چەندین قات بەرز دەکاتەوە.

٨) لەکاتی (خۆشی و ناخۆشی)دا ئیمان دار هەر سەرکەتو و بردراوە دەبێ. هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿عَجَباً لأَمْرِ الْمُؤْمِنِ إِنَّ أَمْرَهُ كُلَّهُ خَيْرٌ إِنْ أَصَابَتْهُ سَرَّاءُ شَكَرَ فَكَانَ خَيْراً لَهُ وإِنْ أَصَابَتْهُ ضَرَّاءُ صَبَرَ فَكَانَ خَيْراً لَهُ وَلَيْسَ ذَلِكَ لأَحَدٍ إِلاَّ لِلْمُؤْمِنِ﴾ رواه مسلم. واتە: سەیرم دێ لە کاری برواداران، کە هەموو کارێکیان هەر بە خێر بۆ دەگێردرێ، کاتێ کە دووچاری شتێکی خۆش بوون سوپاسی تیا دەکەن، ئەوەش بۆ وان شتێکی چاکە.وەکاتێ کە دووچاری شتێکی ناخۆش بوون ئارامی لەسەر دەگرن، کە ئەوەش هەر بۆ ئەوان شتێکی چاکە، ئەم خێرانەش بۆ هیچ کەس نانووسرێت تەنها بۆ برواداران نەبێ.

## پ٥٥/ لقەکانی باوەڕ چەندن؟

و: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿الأيمَانُ بِضْعٌ وسَبْعُونَ شُعْبَةً فَأَفْضَلُهَا قَوْلُ لا إِلَهَ إِلاَّ الله. وأَدْنَاهَا إِمَاطَةُ الأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ. وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الأيمَانِ﴾ متفق عليه. واتە: باوەڕ بریتی‌یە لە (٧٣) تا (٧٩) لق، بەرزترینیان گوتنی ﴿لا اله الا الله﴾یە و نزمترینیان لابردنی پەرچێکە لە رێگا، شەرمیش لقێکە لە باوەڕ.

## پ٥٦/ پتەوترین پەتی باوەڕ چی‌یە؟

و: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿أَوْثَقُ عُرَى الأيمَانِ: الْمُوَالاَةُ فِي اللهِ وَالْمُعَادَاةُ فِي اللهِ، وَالْحُبُّ فِي اللهِ، وَالْبُغْضُ فِي اللهِ﴾ رواه الطبراني والطيالسي عن ابن مسعود ورواه احمد وابن ابي شيبة .

(١) براء ابن عازب وهو حسن. واته: پتەوترین لقی باوەڕ، بریتی‌یە لە دۆستایەتی و دوژمنایەتی بۆ خوا وخۆشویستن و ڕق بوونەوە بۆ خوا.

## پ٥٧/ چۆن تامی باوەڕ دەچێژین؟

و: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وجَدَ حَلَاوَةَ الإيمَانِ: أنْ يَكُونَ اللهُ ورَسُولُهُ أحَبَّ إليْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا، وأنْ يُحِبَّ الْمَرْءَ لا يُحِبُّهُ إلاَّ للهِ، وأنْ يَكْرَهَ أنْ يَعُودَ إلى الْكُفْرِ بَعْدَ إذْ أنْقَذَهُ اللهُ كَمَا يَكْرَهُ أنْ يُلْقَى فِي النَّارِ﴾ متفق عليه. واتە: سێ شت هەن لە هەر کەسێك دابێت تامی باوەڕ دەچێژێت ئەویش: خوا و پێغەمبەرت لە هەموو شتێك خۆشتر بوێت، کەسێکت لەبەر خاتری خوا خۆش بووێ و ڕقت لەوە بێ بچیتەوە ناو کوفر دوای ئەوەی خوای گەورە لەو کوفرە ڕزگاری کردووی بە جۆرێك وەکو ئەوە کە پێت ناخۆشە بچیتە ناو ئاگر.

## پ٥٨/ چۆن باوەڕ لە دڵدا کامڵ دەبێ؟

و: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿مَنْ أحَبَّ للهِ وابْغَضَ للهِ وأعْطَى للهِ ومَنَعَ للهِ فَقَدْ إسْتَكْمَلَ الإيمَانَ﴾ متفق عليه. واتە هەرکەسێك خۆشویستن و ڕق بوونەوە و بەخشین و نە بەخشینی بۆ خوا بێت ئەوەدەمە باوەڕەکەی کامڵ بووە.

## پ٥٩/ جیاوازی نێوان (مُؤْمِنُ) و (مُسْلِمْ) چی‌یە؟

و: (مُؤْمِنْ) بەکەسێك دەڵێن کەوا لەدڵەوە ئایین و بەرنامەی خوا بەڕاست بزانێ و بە زمانیش دانی پیابهێنێ و بەکردەوەش بیسەلمێنێ.

بەلام (مُسْلِمْ) بەکەسێك دەڵێن، کە خۆی دابێتە دەست بەرنامەی خوا و مل کەچی شەریعەتی ئیسلام بووبێ، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ:

﴿وقَالَتِ الأعْرَابُ آمَنَّا قُلْ لَمْ تُؤْمِنُوا ولكِنْ قُولُوا أسْلَمْنَا ولَمَّا يَدْخُلِ الإيمَانُ فِي قُلُوبِكُمْ...﴾ الحجرات١٤.

واتە: کۆمەڵێ لە دەشتەکی‌یەکان هاتنە لات و دەیانگوت ئێمە ئیمانمان هێناوە، تۆش لە وەڵامدا پێیان بڵێ: ئیمانی ڕاستەقینەتان نەهێناوە (واتە ڕاست ناکەن) بەلام بڵێن بە ناچاری خۆمان کردووە بە مسوڵمان و گەردەن کەچیمان پێشان داوە، (چونکە) هێشتا ئیمان نەچۆتە ناو دڵە کانتانەوە.

## پ٦٠/ ئایا باوەڕ کەم و زیاد دەبێ؟

و: بەڵێ، بەڵگەش ئەم دوو ئایەتەیە: ﴿لِيَزْدَادُوا إيمَاناً مَعَ إيمَانِهِم﴾ الفتح ٤. واتە: بۆ ئەوەی باوەڕیان لەگەڵ باوەڕی پێشویان زیاتر بێ: ﴿الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُوا لَكُمْ

﴿فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَانـاً...﴾ آل عمران ١٧٣. واتـه: ئـەو کسـانەی کـە خـەڵکی پێیـان گوتـن: وا خەڵکی دەوره‌یان لێداون لێیان بترسن ئەوانیش لەسەر ئەمە بڕوایان زیاتر بوو.

## پ٦١/ بڕوادار بەچی باوەڕی زیاد دەبێ؟

و: گرنگترین هۆیەکانی زیاد بوونی باوەڕ بریتین لە:

١) **زانیاری (العلم)**: هەروەك (جندب بن عبدا لله وابن عمر) دەڵێـن: (تَعَلَّمْنَا الْإِيمَانَ، تَعَلَّمْنَـا الْقُرْآنَ فَزِدْنَا إِيمَانًا). واتە: باوەڕمان وەرگرت و فێری قورئان بووین و ئیمانمان زیاتر بوو. ئادەمیزاد هەرچەند لە ڕێگەی زانیاری بیر لە بوونەوەر بکاتەوە زیاتر گـەورەیی خـوای بـۆ ڕوون دەبێتەوە و بـاوەڕی پـێ زیـاتر دەبـێ، هـەروەك خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿إِنَّمَـا يَخْشَـى اللهَ مِنْ عِبَـادِهِ الْعُلَمَـاءُ﴾ فاطر ٢٨. واتـە: بەڕاسـتی ئەوانـەی کـە زانـان (لـە یەکخواناسین) لە خوا دەترسن.

٢) **کردار (العمل)**: ئـادەمیزاد هـەر چـەند چاکـە بکـات و خـێر و خێرات و نوێـژ و ڕۆژوو بگرێت زیاتر باوەڕی لە دڵدا دادەمەزرێت، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَالَّذِيـنَ آمَـنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَنُدْخِلَنَّهُمْ فِي الصَّـالِحِينَ﴾ العنكبوت ٩. واتـە: ئەوانـەی کـە بڕوایان هێناوە و کاری چاك ئەنجام دەدەن دەیان خەینە ڕیزی پیاو چاکان.

٣) **یادکردن و بیرکردنەوە (الذكر والفكر)**: بە یادکردنەوەی خـوا بـاوەڕ زیـاتر دەچەسـپێ هـەروەك خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿إِنَّمَـا الْمُؤْمِنُـونَ الَّذِيـنَ إِذَا ذُكِرَ اللهُ وَجِلَـتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَـتْ عَلَيْهِـمْ آيَاتُـهُ زَادَتْهُـمْ إِيمَانـاً﴾ الانفال ٢. واتـە: بـڕواداری ڕاسـتەقینە ئەوانـەن کـاتێ یـادی خـوا دەکـەن دڵیـان ڕادەچڵـەکێ وکـاتێ ئایـەتی خوایـان بەسـەردا دەخوێندرێتەوە باوەڕیان زیاد دەکات.

هـەروەها چـەند بیر لـە دروسـت کراوەکـانی خـوا بکەیتـەوە گـەورەیی خـوات زیـاتر بـۆ دەردەکەوێ و باوەڕت لە دڵا دەچەسپێ. هـەروەك خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿وَيَـتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّـنَا مَـا خَلَقْـتَ هَـذَا بَـاطِلاً سُـبْحَانَكَ فَقِنَـا عَـذَابَ النَّـارِ﴾ آل عمران ١٩١. واتە: ئەوانەی خاوەن عەقڵن بیر دەکەنەوە لە دارشتنی ئاسمانەکان و زەوی، ئینجا دەڵێـن: ئەی پەروەردگارمان ئەم دروست کراوەت بە بێ هۆ دروست نەکردووە و پاکی بۆ تۆ ئـەی خوایـە، کەواتە بمانپارێزە لە سزای ئاگر.

## پ٦٢/ دژەکانی باوەڕ (نواقض الإيمان) چـین؟ مسـوڵمان بـەچی کافر دەبێت؟

و: زۆر شت هەن باوەڕی مرۆڤ هەڵدەوەشێنێتەوە گرنگترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

١) نکوڵی کردن لە پەروەردگارێتی خوا.

٢) نکوڵی کردن لە خوایەتی خوا.

٣) نکوڵی کردن لە ناو و سیفەتەکانی خوا.
٤) دژایەتی کردنی قورئان و پێغەمبەر ﷺ.

## پ٦٣/ دژایەتی کردنی قورئان و پێغەمبەر ﷺ چۆن دەبێت؟

و:

١) ڕەخنەگرتن و تیر و توانج هاویشتن لە پێغەمبەر ﷺ.ڕەخنە گرتن و تیرو توانج هاویشتنیش تەنها ئەوە نی‌یە کە بەرامبەر خودی پێغەمبەر بکرێ، بەڵکو ڕەخنە گرتن و تیرو توانج هاویشتن بەرامبەر هەر ڕەفتارێك یان هەر گوفتارێکی پێغەمبەر بکرێت ئەوە بەرامبەر خودی پێغەمبەر کراوە، بۆ نموونە گەر گاڵتە بە سیواکێك یان ریشی مسوڵمانێك بکرێ ئەوە گاڵتە بە سوننەتی پێغەمبەر کراوە. هەروەها خوای گەورە باسیان دەکات و دە فورمووێ: ﴿وَمِنْهُمْ مَنْ يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ حَتَّى إِذَا خَرَجُوا مِنْ عِنْدِكَ قَالُوا لِلَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ مَاذَا قَالَ آنِفاً؟...﴾ محمد ١٦. واتە: لە کافرەکان هی وا هەن لە لای تۆ بە ڕواڵەت زۆر باش گوێ دەگرێ لە تۆ، کاتێ کە لای تۆ دەردەچون ئەیانگووت بەوانەی کە زانست و زانیاریان پێ دراوە(کە مسوڵمانەکانن، بە گاڵتە پێ کردنەوە) ئەوە چی بوو ئێستا گوتی؟

٢) نکوڵی کردن لە هێندێك لەو هەواڵانەی کە پێ‌ی ڕاگەیاندوین. هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا قَالُوا قَدْ سَمِعْنَا لَوْ نَشَاءُ لَقُلْنَا مِثْلَ هَذَا إِنْ هَذَا إِلاَّ أَسَاطِيرُ الأَوَّلِينَ، وإِذْ قَالُوا اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ هَذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِنْدِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِنَ السَّمَاءِ أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ الانفال ٣١- ٣٢. واتە: کاتێ کە ئایەتەکانی ئێمە لە لایەن (پێغەمبەرەوە) بەسەریانا دەخوێندرێتەوە، ئەڵێن: بیستمان و ئەگەر ئێمە بمانەوێ وێنەی ئەم خوێندراوە ئەڵێین، (بەڕاستی) ئەمە هیچ نی‌یە جگە لەوە قسەی پووچە نوسراوەکانی گەلە کۆن و ڕابردووەکانە (وەدەیان گوت) ئەی خوایە ئەگەر ئەم قورئانە هەر ئەو هەق و ڕاستە کە لە لایەن تۆوە هاتووە وەك (موحەممەد دەڵێ) دەی بیبارێنە بەسەرماندا بەردێك کە لە ئاسمان و لای سەروومانەوە هاتێ یان سزایەکی تری سەختی ئێش و ئازاردەرمان بۆ بێنە (تاکو باوەڕی پێ بهێنین!!).

# بەشی پێنجەم

# بەندایەتی (العبادة) و بەشەکانی

## پ٦٤/ بۆچی خوا دروستی کردووین؟

و: بۆ (عیبادەت) واتە: بۆ ئەوەی بیپەرستین؟ هەروەك خوای گەورە دەفەرمووی: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الجِنَّ وَالإِنْسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ﴾ الذاريات ٥٦. واتە: من جنۆکە و ئادەمیزادم دروست نەکردووە تەنها بۆ بەندایەتی من نەبێ...

## پ٦٥/ عیبادەت (العبادة) چی‌یە؟

و: عیبادەت بە مانای ملکەچی و زەلیلی و ژێردەستەیی دێت کە لەم مانا سەرەکی‌یانەی خوارەوە وەردەگیرێ:

١) (العَبْدُ) واتە بەندە.

٢) (العِبَادَةُ) واتە گوێڕایەڵی و ملکەچی.

هەروەك خوای پەروەردگار بە هەردوو ماناوە دەفەرمووێ: ﴿فَقَالُوا أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَابِدُونَ﴾ المؤمنون ٤٧. واتە: بێ‌بڕواکان دەیانگوت: چۆن ئێمە بڕوا بە دوو ئادەمیزاد کە (موسى) و (هارون)ن بێنین، کە تیرەی ئەم دوو پیاوە بەندەی ئێمە و گوێڕایەڵ و ملکەچی ئێمەن؟

هەروەها بە مانای دووەم دەفەرمووێ: ﴿أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَلاَّ تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ﴾ يس ٦٠. واتە: ئایا ئێمە بەڵێنمان لێوەرنەگرتن کە چیتر بە گوێی شەیتان نەکەن، چونکە شەیتان دوژمنی ئاشکرای ئێوەیە؟

## پ٦٦/ جۆرەکانی عیبادەت چین؟

و: سێ جۆر عیبادەت هەن کەوا بریتین لە: عیبادەتی دڵ و ڕەفتار و گوفتار.

## پ٦٧/ عیبادەتی دڵ و جۆرەکانی چین؟

و: ئەو عیبادەتانەن کە لە ڕێگەی دڵەوە ئەنجام دەدرێن، جۆرەکانی بریتین لە:

١) **باوەڕ (الإيمان)**: هەروەك شێخ **(حسن البصري)** دەفەرمووێ: **(الإيمَانُ مَا وَقَرَ فِي القَلْبِ...)** واتە: باوەڕ ئەوەیە کە لە دڵدا جێگیر بێت.

٢) **خۆشەویستی** (المحبة): هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ﴾ البقرة ١٦٥. واتە: ئەوانەی کە بڕوادارن زیاتر خوایان خۆش دەوێ.

٣) **گەڕانەوە لای خوا** (الإنابة): هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَأَنِيبُواْ إِلَى رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُ﴾ الزمر ٥٤، واتە: بگەڕێنەوە لای خوا و خۆتانی بە دەستەوە بدەن.

٤) **پشتی خۆ پێ بەستن** (التوكل): هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَعَلَى اللّهِ فَتَوَكَّلُواْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ المائدة ٢٣، واتە: پشتی خۆتان بە خوا ببەستن ئەگەر بڕوادارن.

٥) **ترسان لە خوا** (الخشية): هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿فَلاَ تَخْشَوُاْ النَّاسَ وَاخْشَوْنِ﴾ المائدة ٤٤، واتە: لە خەڵکی مەترسن و لە من بترسن.

٦) **ئومێد پێ بوون** (الرجاء): هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاء رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلاً صَالِحاً وَلا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَداً﴾ الكهف ١١٠، واتە: هەر کەسێك بە ئومێدی گەیشتنە بە پەروەردگاری، با کردەوەی چاك ئەنجام بدا و هیچ هاوبەشێکی بۆ بڕیار نەدات.

٧) **خواستن** (الرغبة): هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَإِلَى رَبِّكَ فَارْغَبْ﴾ الإنشراح ٨، واتە: هەر لە پەروەردگارت بخوازە.

## پ٦٨/ نیشانەکانی خۆشویستنی خوای گەورە چین؟

و: شتێك کە خوای گەورە پێی خۆش بێ یان خۆشی بێ بوێ تۆش خۆشت بوێ. یان رقی لەوە بێ کە خوای گەورە رقی لێیەتی و دوور کەوتنەوە لەوانەی کە خوای گەورە نەهی لێ کردوون، دۆستایەتی دۆستانی خوا بکا و دوژمنایەتی دوژمنەکانی بکات و شوێنکەوتەی پێغەمبەری ئازیز ﷺ بێت، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللّهَ فَاتَّبِعُونِي﴾ آل عمران ٣١، واتە: بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێ بە دوای من بکەون.

## پ٦٩/ خۆشەویستی (المحبة) دەکرێتە چەند بەش؟

خۆشەویستی دەکرێتە چوار بەش کە بریتین لە:

١) ئەو خۆشەویستی‌یەی کە شیرکە، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللّهِ أَندَاداً يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللّهِ...﴾ البقرة ١٦٥، واتە: خەڵکی وا هەن کە هاوبەشی زۆر بۆ خوا پەیدا دەکەن، خۆشیان دەوێن وەك خۆشەویستی خوا.

٢) خۆشەویستی ناهەق و ڕق بوونەوەی ناهەق: ئەوەیان ڕەوشتی دووڕووەکانە.

٣) خۆشەویستی‌یەکی زگماکی: ئەوەش بریتی‌یە لە خۆشویستنی ماڵ و سامان و منداڵ، (بە مەرجێ سەرقاڵت نەکات لە خوا پەرستی ئەو دەمە دروستە).

٤) خۆشەویستی خوای گەورە و خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ و پاشان مسوڵمانان...

## پ٧٠/ عیبادەتی گوفتار (زمان) و جۆرەکانی چین؟

و: ئەو عیبادەتانەی کە لە ڕێگەی گوفتارەوە ئەنجام دەدرێن بریتین لەم جۆرانەی خوارەوە:

١) **پاڕانەوە (الدعاء)**: هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿الدُّعَاءُ هُوَ العِبَادَةُ﴾ الترمذي، واتە: پاڕانەوە خواپەرستی‌یە.

٢) **سوێندخواردن (الحلف)**: هەروەك پێغەمبەری مەزن ﷺ دەفەرمووێ: ﴿مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللهِ فَقَدْ أَشْرَكَ﴾ الترمذي، واتە: هەر کەسێك سوێند بە غەیری خوا بخوات ئەوا هاوبەشی بۆ خوا داناوە.

٣) **داوای کۆمەك و یارمەتی کردن (الإستغاثة والإستعانة)**: هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿وَإِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِاللهِ﴾ الترمذي، واتە: ئەگەر داوای یارمەتیت کرد لە خوا داوا بکە.

## پ٧١/ عیبادەتی ڕەفتار (کردار) و جۆرەکانی چین؟

و: ئەو عیبادەتەیە کە لە ڕێگەی ڕەفتارەوە ئەنجام دەدرێ، بریتی‌یە لەم جۆرانەی خوارەوە:

١) **نوێژ (الصلاة)**: هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا....﴾ الحج ٧٧، واتە: ئەی بڕوادارینە کڕنوش و سوژدە بۆ خوا ببەن (واتە: نوێژ بکەن).

٢) **بە ڕۆژوو بوون (الصوم)**: هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ﴾ البقرة ١٨٣، واتە: ڕۆژووم لە سەر فەرز کردوون.

٣) سووڕانەوە **(الطواف)**: هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ﴾ الحج ٢٩، واتە: با بە دەوری ڕووگە **(کعبة)**دا بسووڕێنەوە.

٤) **قوربانی‌دان**: هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿لَعَنَ اللهُ مَنْ ذَبَحَ لِغَيْرِ اللهِ﴾ رواه مسلم، واتە: نەفرەتی خوا لەو کەسە بێ کە قوربانی بۆ غەیری خوا سەر دەبڕێ.

٥) **جیهاد و خەباتی چەکدارانە**: هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَجَاهِدُوا فِي اللهِ حَقَّ جِهَادِهِ﴾ الحج ٧٨، واتە: جیهاد بکەن لە پێناو خوا و هەقی خۆی پێ بدەن.

٦) **ماچ کردنی بەردە ڕەشەکە (الحجر الأسود)**: واتە: دروست نی‌یە هیچ شتێك ماچ بکرێ بە ناوی بە گەورە دانان **(تعظیم)**، غەیری بەردە ڕەشەکە نەبێ.

٧) **لەخۆگرتن (نذر)**: هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَمَا أَنْفَقْتُمْ مِنْ نَفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُمْ مِنْ نَذْرٍ فَإِنَّ اللهَ يَعْلَمُهُ﴾ البقرة ٢٧٠، واتە: هەر شتێك ببەخشن یان لەخۆتانی بگرن ئەوا خوای گەورە پێی ئاگادارە. کەواتە بۆ غەیری خوا دروست نی‌یە هیچ شتێك لە خۆت بگریت.

## پ٧٢/ لەخۆگرتن (نذر) چی‌یە؟

و: وەکو ئەوەی بڵێی ئەگەر ئەو کارەم بۆ سەر بگرێ من بەرانێك لە بن پێی فلان کەس سەر دەبڕم، ئەمەیان دروست نی‌یە، بەڵام ئەگەر بڵێی گـەر ئـەم شـتەم بـۆ چـاك بـێ ئـەوا هـەموو سـاڵ بەرانێك دەکەمە خێر، ئەوە ئەم لەخۆگرتنە دروستە، بە مەرجێ کارەکەی بۆخوا بێ.

## پ٧٣/ ئایا خوا بۆ چیتری دروست کردووین؟

و: بـۆ ئـەوەی ببـین بـە جێنشـینی (**خلیفـة**)ی خـوا. هــەروەك خـوای گــەورە دەفــەرمووێ: ﴿...**وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَاءَ الأَرْضِ**﴾ النمل ٦٢، واتە: ئێوەمان کردۆتە جێنشین لە سەر زەوی.

## پ٧٤/ ئایا هەموو کەس بە جێنشین دەشێت؟ چۆن دەتوانین بە کاری جێ نشینی هەڵبستین؟

و: نـــەخێر... هــــەروەك خـــوای گــــەورە دەفـــەرمووێ: ﴿... **لاَيَنَـــالُ عَهْـــدِي الظَّالِمِيْنَ**﴾ البقرة ١٢٤، واتـە: زۆرداران بـەر پـەیمانی جێنشـینی ناکـەون. وە بـە خواپەرسـتی دەتوانـین بەکاری جێ نشینی هەڵبستین، واتە: بۆ ئەوەی بسـەلمێنین کـە جێنشینین ئـەوا دەبـێ بسـەلمێنین کـە خواپەرستین.

## پ٧٥/ چۆن دەسەلمێنین کە خواپەرستین؟

و: ئەگەر خوا لە کارەکانمان ڕازی بێت.

## پ٧٦/ چۆن خوا لە کارەکانمان ڕازی دەبێت؟

و: ئەگەر کارەکانمان لە سەر سێ بنچینە ئەنجام بدرێ کە ئەمانەی خوارەوەن:

١) **نیەت و ئیمان**: واتە کارەکانمان لە سەر بنچینـەی نیـەت و بـاوەڕ (**النیـة والإیمـان**) ئـەنجام بدرێ. هەر کارێك بکـەیت ئەگـەر چـاکیش بێـت، ئەگـەر بـە نیـەتێکی پـاك و لـە سـەر بنچینـەی بـاوەڕەوە ئـەنجام نـەدرێ ئـەوا پوولێکـی قـەڵپ نـاهێنێ هـەروەك پێغەمبـەر ﷺ دەفەرموویێ: ﴿**إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِيِّاتِ**﴾ مسلم، واتە: هـەموو کردەوەیـەك بـە نیـەت ئـەنجام دەدرێ.

٢) **خۆ یەکلاکردنەوە بۆ خوا** (**الإخلاص**): هەر کارو کردەوەیەك کە ئەنجام دەدرێ دەبێ ئەم کارە بۆ خوا بە ڕێ بکرێ.... هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿**فَاعْبُدِ اللهَ مُخْلِصاً لَهُ الدِّيْنَ**﴾ الزمر ٢، واتە: خوای خۆت بپەرستە بە شێوەیەك ملکەچیت هەر بۆ ئەو بێت.

٣) **کارەکە لەسەر ڕێ وشوێنی پێغەمبەر ﷺ ئەنجام بدرێ** (الصواب): پێغەمبەری پێشەوا ﷺ بۆ ئێمە پێشەوا و سەرقافڵەیە بۆیە پێویستە لە کاری ڕۆژانەماندا شوێن ئەو بکەوین، هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿**مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ**﴾ مسلم، واتە: هەرکەسێك کارێك بکات ئەگەر لەسەر ڕێ وشوێنی ئێمە نەبێت ئەوا لێی وەرناگیرێت.

## پ٧٧/ چۆن خوا بپەرستین؟

و: بەم شێوەیەی کە پێغەمبەر ﷺ فێری کردووین بەگوێڕایەڵ بوونی خوای گەورە و پێغەمبەر ﷺ هەروەك وا فەرمانمان پێ دەکات، خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَلاَ تُبْطِلُوا أَعْمَالَكُمْ**﴾ محمد ٣٣، واتە: ئەی بڕوادارینە، گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر ﷺ بن و کارەکانتان (بە شتی خراپ) پووچ مەکەنەوە.

## پ٧٨/ چاکە (الإحسان) لە خواپەرستی (عبادة)دا چییە؟

و: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿**الإِحْسَانُ أَنْ تَعْبُدَ اللهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ**﴾ مسلم، واتە: ئیحسان ئەوەیە کە خوای خۆت وا بپەرستی وەکو ئەوەی کە بیبینی، ئەگەر تۆش ئەو نەبینی ئەوا ئەو تۆ دەبینێ.

# بەشی شەشەم

## ﴿لا إله إلا الله﴾

## و

# بەشەکانی و دژەکانی

### پ٧٩/ چۆن لە ﴿لا إله إلا الله﴾ دەگەیت؟

و: زۆربەی زانیان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کەوا ﴿لا اله الا الله﴾ واتە: (**لامعبود بحق الا الله**) **واتە: هیچ پەرستراوێك نی‌یە تەنها خوا نەبێ.**

(**سید قطب**) ڕەحمەتی خوای لێ بێ بە جۆرێك لە (**لااله الا الله**) گەیشتووە کەدەڵێ: ئێمە بەم جۆرەی خوارەوە لە ﴿لا إله إلا الله﴾ دەگەین کە دەڵێ:

(**لاَ حَاكِمِيَةَ اِلاَّ للهِ، ولاَ شَرِيعَةَ اِلاَّ مِنَ اللهِ، ولاَ سُلْطَانَ لِأَحَدٍ عَلَى أَحَدٍ، لِأَنَّ السُّلْطَانَ كُلُّهُ مِنَ اللهِ**). واتە: هیچ کەس مافی حوکم گێرانی نی‌یە تەنها خوا نەبێ، وە هیچ بەرنامەیەك بە شیاو نازانین بەرنامەی خوا نەبێ، وە هیچ کەس دەسەڵاتی بەسەر کەسی دیکەدا نی‌یە، چونکە دەسەڵات گشتی لای خوایە.

### پ٨٠/ پایە (رکن)ەکانی ﴿لا إله إلا الله﴾ چین؟

و: ﴿لا إله إلا الله﴾ دوو پایەی گرنگی هەیە:

١) لادان (**نفي**) واتە ڕەتکردنەوەی:

أ) هەموو ئەو کەسانەی کە حوکم بە قورئان ناکەن (**آلِهَ**).

ب) هەموو ئەو کەسانەی کە خۆیان بە پەروەردگار (**رَبّ**) دەزانن.

ج) هەموو ئەو کەسانەی کە بە قەد خوا خۆش دەویسترێن و کراون بە هاوبەش (**نِدّ**) بۆ خوای گەورە.

د) هەموو ئەو کەسانەی کە لە سنووری خۆیان دەردەچن (**الطَّواغِيت**).

٢) دانان (**إثبات**) واتە دانانی خوای گەورە لە جێگای ئەوان.

### پ٨١/ گرنگی ﴿لا إله إلا الله﴾ چی‌یە؟

و:

١) ڕزگار کردنی خەڵکی لە بەندایەتی خەڵکی بۆ بەندایەتی خوا.

٢) پیس و پاکی پیٚ جیا دەبێتەوە.
٣) دڵ و دەروونی پیٚ ئاسوودە دەبیٚ.
٤) ئادەمیزاد دەزانیٚ بەرنامەی خۆی لە کیٚ وەردەگریٚ.

## پ٨٢/ مەرجەکانی قبووڵ بوونی ﴿لا إله إلا الله﴾ چین؟

و:

١) زانین بە مانای ﴿لا إله إلا الله﴾، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿فَاعْلَمْ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ﴾ محمد ١٩، واتە: بزانە کە غەیری خوا کەس شیاوی پەرستن نی‌یە.

٢) دڵنیایی (**اليقين**) واتە دڵنیا بیت لە تاك و تەنیایی خوا، هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ لا يَلْقَى اللهَ بِهِمَا عَبْدٌ غَيْرُ شَاكٍّ فِيهِمَا إِلاَّ دَخَلَ الْجَنَّةَ﴾ رواه مسلم، واتە: شایەدی دەدەم کە خوا تەنیایە و هیچ هاوبەشی نی‌یە و منیش رەوانە کراوی خوام، هەر کەسیٚ باوەڕی پێیان هەبیٚ و بیٚ گومان بێت ئەوە دەچێتە بەهەشت.

٣) خۆیەکلاکردنەوە بۆ خوا (**الإخلاص**): پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِي مَنْ قَالَ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ خَالِصاً مِنْ قَلْبِهِ أَوْ نَفْسِهِ﴾ البخاري، واتە: بەختەوەرترین کەس لە رۆژی دوایی بە تکاکردنی من کەسێکە کە بە پاك و خاوێنی دڵ و خۆیەکلاکردنەوەی نەفسی بڵێت: ﴿لا اله الا الله﴾.

٤) خۆشویستن (**المحبة**): واتە ئەو خوایەی لە هەموو کەس خۆشتر بویٚ، بۆیە کاتێك کە خوا باسی بڕواداران دەکات و دەفەرمووێ: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبّاً لِلَّهِ﴾ البقرة ١٦٥، واتە: باوەڕداران خوایان لە هەموو شت خۆشتر دەویٚ.

٥) راست کردن (**الصدق**) دوور بیٚ لە درۆکردن وسڵ کردن لە دووڕوویی، هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿مَا مِنْ أَحَدٍ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ صِدْقاً مِنْ قَلْبِهِ إِلاَّ حَرَّمَهُ اللهُ عَلَى النَّارِ﴾ البخاري، واتە: هیچ کەسێك نی‌یە بە راستی بڵیٚ ﴿لا إله الا الله و محمد رسول الله﴾ ئەوە خوا ئاگری دۆزەخی لیٚ قەدەغە دەکات.

٦) ملکەچی کردن (**الإنقياد**) بۆ فەرمانەکانی خوا هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَأَنِيبُوا إِلَى رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُ﴾ الزمر ٥٤، واتە: بگەڕێنەوە لای خودا و خۆتانی بەدەستەوە بدەن.

٧) وەرگرتنی (**القبول**) ﴿لا إله الا الله﴾ وەکو بەرنامەی ژیان، هەروەك خوای پەروەردگار لە پێناس کردنی بیٚ بڕواکان دەفەرمووێ: ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا قِيلَ لَهُمْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ يَسْتَكْبِرُونَ﴾ الصافات ٣٥، واتە: کاتیٚ کە پیٚ یان دەگوتریٚ (غەیری خوا کەسی تر شیاوی پەرستن نی‌یە)وەری ناگرن و خۆیان بە زل دەزانن...

## پ٨٣/ دژەکانی ﴿لا إله الا الله﴾(نواقض لا اله الا الله) چین؟ یان به چی ﴿لا إله الا الله﴾ هەڵدەوەشێتەوە.

و: بە چوار شت:

١-کوفر ٢-شرك ٣-نیفاق ٤-تاغوت

## پ٨٤/ کوفر چی‌یە؟ چەند جۆری هەیە؟

و: بنچینەی کوفر لە (كَفَرَ) هاتووە کە بە مانای شاردنەوە دێت، واتە: ئەو کسانەی کەهەقیقەتی ئیسلام دەشارنەوە. وە دەشکرێن بە دوو جۆر کە بریتین لە: کوفری هەرە گەورە (الكفرالاكبر) و کوفری هەرە بچووك (الكفر الاصغر).

## پ٨٥/ کوفری گەورەو جۆرەکانی چین؟

و: کوفری گەورە ئەو کوفرەیە کە بە ئەنجامدانی لە ئایینی ئیسلام پێ‌ی دەردەچێت، جۆرەکانیشی بریتین لە:

١) کوفری بە درۆخستن (كفر التكذيب): واتە بە درۆخستنەوەی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِباً أَوْ كَذَّبَ بِالْحَقِّ لَمَّا جَاءَهُ﴾ العنكبوت ٦٨، واتە: کێ لەو کەسە زۆردارترە کە بە درۆ بوختان بە خوا هەڵدەبەستێ و دینی خوا بە درۆ بخاتەوە دوای ئەوەی کە بۆیان هات؟

٢) کوفری خۆ بە گەورە زانین (الإباء والإستكبار): وەکو ئەو کوفرەی کە ئبلیسی نەگریس (شیطان) کردی، هەروەك قورئان دەفەرمووێ: ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ﴾ البقرة ٣٤، واتە: بە فریشتەکانمان گوت: کە سووژدە بۆ ئادەم ببەن، ئەوانیش سووژدەیان برد، تەنها ئیبلیس نەبێ خۆی بە گەورە زانی و کافر بوو.

٣) کوفری گومان بردن بە رۆژی دوایی (كفر الشك بيوم القيامة): هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿يَسْأَلُ أَيَّانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ﴾ القيامة ٦، واتە: بێ بڕواکان بە گاڵتەوە دەیانگوت: کەی ڕۆژی دوایی دادێ ئەگەر ڕاست دەکەن؟ واتە گومانیان لە هاتنی ڕۆژی دوایی هەبوو!

٤) کوفری پشت گوێ خستن (كفر الإعراض) لە وەرگرتنی ئیسلام: هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا عَمَّا أُنذِرُوا مُعْرِضُونَ﴾ الاحقاف ٣، واتە: کافر و بێ بڕواکان کەللە ڕەقن بەو ترسەی کە لە قورئان دەیاندرێتێ.

٥) کوفری دووڕوویی (كفر النفاق): نیفاق واتە بە زمان خۆت بە موسوڵمان دابنێیت و لە دڵەوەش دژی ئایینی ئیسلام بیت، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ آمَنُوا ثُمَّ كَفَرُوا فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ﴾ المنافقون ٣، واتە: لە بەر ئەوەی

ئەوان باوەریان هێناو پاشان کافر بوون ئینجا ئێمەش مۆری خۆمان بە دڵیانا وەنا بێ ئەوەی کە هەست بکەن.

٦) کوفری دڵرەقی (**كفر الجحود**): ئەمە ئەو کوفرەیە کە دان نەنێیت بە روکنەکانی ئیسلام و ئیمان. هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلاَّ الْكَافِرُونَ﴾ العنكبوت ٤٧، واتە: هیچ کەس بە ئایەتەکانی ئێمە دڵرەق نییە تەنها کافرەکان نەبێ.

## پ٨٦/ کوفری بچووك و جۆرەکانی چین؟

و: کوفری بچووك ئەو کوفرەیە کە بە ئەنجامدانی پێی لە ئیسلام دەرناچیت، جۆرەکانی بریتین لە:

١) کوفر بە نیعمەتەکانی خوا (**كفر النعمة**): بچووکترین نیعمەت شوکری لە سەر پێویستە، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِنْ شَكَرْتُمْ لأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِنْ كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ﴾ ابراهيم ٧، واتە: پەروەردگاری ئێوە بانگی راهێشتووە کە ئەگەر شوکری نیعمەتەکانی خوا بکەن، ئەوا خوا نیعمەتەکانتان بۆ زیاد دەکات، بەلأم ئەگەر کوفری لە سەر بکەن ئەو دەمە سزای خوا زۆر توند و تیژە بۆ ئەو کەسە.

٢) کوفری رەفتار (**الكفر العملي**): بریتییە لە هەموو کارێك کە پێی یاخی بیت، وەکو جوێن دان یان شەرکردن لەگەڵ برواداران یان زینا کردن یان ئارەق خواردنەوە...هتد. ئەم جۆرە کوفرە پێی لەئیسلام دەرناچیت، چونکە کوفری بیروباوەر (**إعتقاد**) نییە، هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ وقِتَالُهُ كُفْرٌ﴾ رواه البخاري، واتە: جوێن دان بە موسڵمانان لە ئایین دەرچوونە و شەرکردنیش لەگەڵیان کافربوونە. یان دەفەرمووێ: ﴿لاَ يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وهُوَ مُؤْمِنٌ...﴾ رواه مسلم، واتە: زیناکەر لە کاتی زیناکەیدا بروادار نییە.

٣) ئەو فەرمانرەوایەی کە حوکم بە قورئان ناکات: ئەمەیان ئەو کەسەیە کە دان بە قورئان بنێ، بەلأم لە بەر چەند بەرژەوەندییەك حوکمی پێ ناکات، واتە لە بەر رقەبەرایەتی نەبێ دەنا ئەگەر وانەبێ کافر دەبێ و لە ئایینی ئیسلام دەردەچێت.

## پ٨٧/ دووروویی (النفاق) و جۆرەکانی چین؟

و: زاراوەی (**النفاق**) لە بنچینەوە لە (**نَفَقْ**)ەوە هاتووە واتە کاری ژێر زەمینی، بەو کەسانە دەگوترێ (**منافق**) کە لە سەرەوە خۆیان بە موسڵمان دادەنێن و لە ژێرەوەش بێ بروان. ئەمەیان دوو جۆری هەیە کە بریتین لە دووروویی هەرە گەورە (**النفاق الاكبر**) و دوورووییهەرە بچووك (**النفاق الاصغر**).

## پ٨٨/ دووڕوویی هەرە گەورە (النفـاق الاكبر) یان (النفـاق الإعتقادي)و جۆرەکانی چین؟

و: ئەو جۆرەیە کە ئادەمیزاد پێی لە ئیسلام دەردەچێت، چونکە بە دڵ کافر و بە رواڵەت مسوڵمانە. جۆرەکانیشی بریتین لە:

١) بە درۆخستنی پێغەمبەر ﷺ و ئەو هەواڵانەی کە باسی کردوون.

٢) بوغزاندنی پێغەمبەر ﷺ و ئەو شتانەی کە باسی کردوون.

٣) دڵخۆش بوون بە شکستی ئیسلام و مسوڵمانان و ڕق هەڵسان بە سەرکەوتنی ئیسلام و مسوڵمانان.

## پ٨٩/ دووڕوویی هەرە بچووك (النفـاق الاصغر) یان (النفـاق العملي) و جۆرەکانی چین؟

و: ئەو جۆرەیە کە بە ئەنجام دانی لە ئیسلام دەرناچێت، چونکە بە دڵ مسوڵمانە و بەڵام کرداری مونافیقی هەیە. جۆرەکانیشی بریتین لە:

١)درۆکردن.

٢)بەڵێن شکاندن.

٣)خیانەت کردن لە ڕاسپاردە.

٤)پەیمان شکاندن.

٥)کێشە گەورە کردن.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿آيَـةُ الْمُنَافِقِ ثَـلاَثٌ: إذَا حَـدَّثَ كَـذَبَ، وإذَا وعَـدَ اَخْلَفَ وإذَا اؤْتمِـنَ خَانَ﴾ متفق عليه.

واتە: نیشانەی دوو ڕووان سێ شتن: درۆ دەکات لەکاتی قسە کردنا، وەکاتێ کەبەڵێن دەدات نایگەیەنێتە جێ، وەکاتێك کە ڕاسپاردەی لە لا دادەنێ دەست کاری دەکات... هەروەها دەفەرمووێ: ﴿اَرْبَعَ مَنْ كُنَّ فِيه كَانَ مُنَافِقاً خَالِصاً، ومَنْ كَانَ فِيهِ خَصْلَةً مِنْهُنَّ كَانَتْ فِيه خَصْلَةٌ مِنَ النِّفَاقِ حَتَّىَ يَدَعَهَا: إذَا حَدَّثَ كَذَبَ وإذَا وعَدَ اَخْلَفَ وإذَا عَـاهَدَ غَـدَر، وإذَا خَـاصَمَ فَجَـر﴾ متفق عليه.

واتە: چوار شت هەن کە لە هەر کەسێکدا بێ ئەوا دەبێتە دووڕوو، هەر کەسێك یەك لەم خەسڵەتانەی تێدابێ ئەوە خەسڵەتێکی دووڕوویی تیا هاتۆتە دی، تا ئەو دەمەی کە ئەو خەسڵەتەی لە خۆی دادەماڵێ، (ئەویش) ئەوەیە کاتێ کە قسە دەکات درۆ دەکات، کاتێ کە بەڵێن دەدات دەیشکێنێ و کاتێ کە پەیمان دەدات بە جێی ناگەیەنێ، وە کاتێ کە دووچاری کێشەیەك دەبێ پەنا بۆ قسەی ناشیرن دەبات.

## پ٩٠/ ئایا له حوکمی ئیسلامدا کافر خراترن یان دووڕوو؟

و: دووڕوو خراترن، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ﴾ النساء ١٤٥.

واتە: بێ گومان دووڕووەکان شوێنی هەرە بنەوەی ئاگری دۆزەخیان بەردەکەوێ.

## پ٩١/ تاغوت کێیەو کێ بە تاغوت دەزانی؟

و: تاغوت (الطاغوت) لە بنچینەوە لە (طَغَیَ) هاتووە کە بە مانای (لە حەددی خۆ دەرچوون) دێت، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّا لَمَّا طَغَى الْمَاءُ حَمَلْنَاكُمْ فِي الْجَارِيَةِ﴾ الحاقة ١١. واتە: کاتێ کە ئاوەکە لە حەددی خۆی زیاتر بوو، ئێوەمان لە کەشتییەکە بەرز کردەوە.

هەروەها زۆر جۆرە تاغوت هەن کە سەرەکیترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

١) شەیتان: هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذُوهُ عَدُوًّا﴾ فاطر ٦. واتە: بێ گومان شەیتان دوژمنی ئێوەیە دە ئێوەش بە دوژمنی خۆتانی دابنێن.

٢) ئەو فەرمانڕەوایەی کە حوکمی خوا دەگۆڕێ، هەروەك ئەوانەی کە دەستووری دژ بە ئیسلام دادەنێن، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُمْ مِنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنْ بِهِ اللَّهُ﴾ الشورى ٢١. واتە: ئایا ئەوان شەریکێکیان هەیە لەگەڵ خوا تاکو شەریعەت و بەرنامەیان بۆ دابنێ، کە خوای گەورە ڕێی پێ نەدابێ.

٣) ئەو فەرمانڕەوایەی کە حوکم بە قورئان ناکات: هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ المائدة ٤٤. واتە: ئەو کەسەی کە حوکم بە قورئان نەکات ئەوانە کافر و بێ بڕوان.

٤) ئەو کەسەی کە خۆی بە خوا دادەنێت: هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَمَنْ يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّي إِلَهٌ مِنْ دُونِهِ فَذَلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ....﴾ الانبياء ٢٩.

واتە: هەر کەسێك لەوان بڵێت من خوام جگە لە خوای ڕاستەقینە ئەوا ئێمە پاداشتی بە ئاگری دۆزەخ دەدەینەوە.

٥) ئەو کەسەی دەڵێ من غەیب دەزانم: هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿قُلْ لَا يَعْلَمُ مَنْ فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ﴾ النمل ٦٥. واتە: هەر چی کەس کە لە ئاسمانەکان و زەوی دادەنێن شارەزایی غەیب نین تەنها خوا نەبێ.

## پ٩٢/ شرك و جۆرەكانی چین؟

و: (شرك) واتە: هاوبەش بڕیار دان بۆ خوا، ئینجا داوای لیٚ بکەیت و بیپەرستیت. دوو جۆر ، کیش هەن کە بریتین لە: شرکی هەرە گەورە (الشرك الاكبر) و شرکی هەرە بچووك (الشرك اصغر).

## پ٩٣/ شیرکی هەرە گەورەو جۆرەکانی چین؟

و: ئەو شرکەیە کە بە ئەنجامدانی لە ئیسلام دەچیتە دەر، کە بریتین لە:

١) شرکی پاڕانەوە (شرك الدعاء): واتە پاڕانەوە لـە پێغەمبـەران و پیاوچاکـان بـۆ وەرگرتـنی ڕۆزی و شەفاعەت و چابوونەوە لە نەخۆشی، هەروەك خوای پـەروەردگار فـەرمانمان پـیٚ دەکات و دەفەرمووێ: ﴿وَلاَ تَدْعُ مِنْ دُونِ اللهِ مَا لاَ يَنفَعُكَ وَلاَ يَضُرُّكَ، فَإِنْ فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذاً مِنَ الظَّالِمِينَ﴾ يونس ١٠٦. واتە: لە غەیری خوا مەپاڕێوە کە هیچ سوود و زیانیان لە دەست نی‌یە بۆ تۆ، ئەگەر وات کرد ئەوە بە ڕاستی تۆ هاوبەشت بـۆ خـوا بڕیـار داوە. چونکە (ظلم) لێرە بە مانای (شرك) دێت.

٢) شیرك لە سیفەتەکانی خـوا: واتـە: بـڕوات وابـیٚ کـە پێغەمبـەران و پیاوچاکـان (علمي غيب)یان هەیە. بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَعِنْدَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لاَ يَعْلَمُهَا إِلاَّ هُوَ﴾ الأنعام ٥٩. واتە: زانینی غەیب تەنها لـە لای خوایـە، غـەیری ئـەو هیـچ کەسـی تـر نایزانیٚ.

شایانی باسە کارە موعجیزەکانی پێغەمبەران و کەرامەتی دۆستانی خواش غـەیب زانـین نی‌یە، بەڵکو تێگەیاندنی خوایە لە ڕێگای وەحی یان خستنە نـاو دڵـەوە بـۆ پێغەمبـەران و خستنە ناو دڵی دۆستانەوە، واتە ئەوانیش بە دەست خۆیان نی‌یە. ئەو زانینـە ئـەوە نـەبیٚ هەر کات ئارەزوو بکەن بۆیان بکرێت. داسـتانی وون بوونـی وشـترەکەی پێغەمبـەر ﷺ ڕاستی ئەو قسـەیە دەسەلمێنیٚ، ئەوەتە حەزرەتی (يعقوب) عليه السلام لـە نزیـك خـۆی نـەیزانی چی لەگەڵ یوسف کراوە، بەڵام لە پاش دەیان ساڵ لە میسرەوە بـۆ کـەنعان دەیفـەرموو: ﴿إِنِّي لأَجِدُ رِيحَ يُوسُـفَ لَـوْلاَ أَن تُفَنِّدُونِ﴾ يوسف ٩٤. واتـە: مـن بۆنـی (يوسـف) دەکەم، وادەزانم فێل و فڕیان هەڵومشایەوە (مەبەست لە کورەکانی‌یەتی).

٣) شیرکی خۆشەویستی (شرك المحبة): واتە: خۆشویسـتنی یەکێك یـان پیاوچـاکێك بـە قـەد خوا، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَتَّخِذُ مِنْ دُونِ اللهِ أَنـْدَاداً يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللهِ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبّاً لِلهِ﴾ البقرة ١٦٥. واتـە: خـەڵکی وا هـەن غەیری خوا دەپەرستن وبە قەد خوا خۆشیان دەوێن، بـەڵام بـڕواداران خوایـان لـە هـەموو کەس خۆشتر دەوێ.

٤) شیرکی گوێڕایەڵی (شرك الطاعـة): واتـە: گوێڕایـەڵی کردنـی زانایـان و پیاوچاکـان لـە کاتی یاخی بوونیان، ئەمەش دروست نی‌یە بـۆ هیـچ کەسـێك کـە بـە گوێـی کەسـێك

بکات کەوا ئەم کەسە لە خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ یاخی بووبێت. بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿لاَ طَاعَةَ لِمَخْلُوقٍ فِي مَعْصِيَةِ الخَالِقِ﴾ رواه الامام أحمد.
واتە: گوێڕایەڵی هیچ کەسێك ناکرێ کە ئەو کەسە لە خوا یاخی بووبێت. بەڵکو ﴿إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ﴾ واتە: گوێڕایەڵی لە شتی چاکدا دەکرێ.

٥) شیرکی خوا خستنە نێو قاوغی دروست کراوەکانی (شرك الحلول ووحدة الوجود): واتە: وابزانی کەوا خوا خۆی دەخاتە بیچمی دروست کراوەکانی خۆی. ئەمەش بریتی‌یە لە بیروباوەڕی (ابن عربي الصوفي) کە لە (دمشق) لە گۆڕنرایە کە دەڵێ: (الرَّبُّ عَبْدٌ، والعَبْدُ رَبٌّ، يَالَيْتَ شِعْرِي مَنِ الْمُكَلَّفُ؟). واتە: پەروەردگار بەندەیە، بەندەش پەروەردگارە، ئایا لەو کاتە کێ تەکلیف بارە؟ یان سۆفی‌یەکی تر دەڵێ: (وَمَا الْكَلْبُ والخِنْزِيرُ إِلاَّ إِلَهُنَا، وَمَا اللهُ إِلاَّ رَاهِبٌ فِي كَنِيسَةٍ).
واتە: سەگ و بەراز خوای ئێمەن، بەڵام هەرچی خوایە وا لە ناو کڵێسا گۆشەگیر بووە (نعوذ بالله).

٦) شیرکی ڕەفتار (التصرف): ئەم شرکە بریتی‌یە لە باوەڕ بوون بەوەی کە هێندێك لە پیاوچاکان دەستیان هەیە لە هەڵسووڕاندنی کاروباری گەردوون (الكون). بەڵام خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَمَنْ يُدَبِّرُ الأَمْرَ؟ فَسَيَقُولُونَ اللهُ﴾ یونس ٣١. واتە: کێ کاروبار هەڵدەسووڕێنێ؟ دەڵێن: خوا.

٧) شیرکی ترسان (الخوف): ئەمەشیان بریتی‌یە لە باوەڕ بوون بەوەی کە هێندێك لە پیاوچاکە مردووەکان هۆکارن بۆ ترساندنی خەڵکی... بۆیە قورئان ئاگادارمان دەکاتەوە و دەفەرمووێ: ﴿أَلَيْسَ اللهُ بِكَافٍ عَبْدَهُ؟ وَيُخَوِّفُونَكَ بِالَّذِينَ مِنْ دُونِهِ﴾ الزمر ٣٦.
واتە: ئایا خوا بەس نی‌یە بۆ بەندەکانی خۆی، ئایا تۆ دەترسێنن بە غەیری خوا؟

٨) شیرکی فەرمانڕەوایی (الحاكمية): ئەمەیان بریتی‌یە لەو کەسەی کە دەستوور و بەرنامە دادەنێت دژ بە یاساکانی ئیسلام... هەرکەسێکیش بە گوێیان بکات ئەمیش دووچاری شرك دەبێت.

## پ٩٤/ زیانەکانی شیرکی هەرە گەورە چین؟

و:

١) دەبێتە هۆی ڕووخاندنی کردەوەی چاك: هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ﴾ الزمر ٦٥. واتە: ئەگەر تۆ شیرکت بڕیار دا ئەوا کردەوەکانت پووچ دەبێتەوە.

٢) خوای پەروەردگار لە شیرکی گەورە خۆش نابێت، تەنها بە تۆبە کردن نەبێ: هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ اللهَ لاَيَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ

يَشَاءُ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلالاً بَعِيداً﴾ النساء ١١٦. واتە: خوا لەو کەسانە خۆش نابێ کە هاوبەشیان بۆ دانابێ، بەڵام جگە لەوە خۆش دەبێ، هەر کەسێك هاوبەشی بۆ خوا بڕیار بدات ئەوا لە ناو گومراییدا ڕۆچووە.

## پ٩٥/ شیرکی هەرە بچووك و جۆرەکانی چین؟

و: ئەم جۆرە شیرکە ئادەمیزادی پێ لە ئیسلام دەرناچێت، بەڵام بە گوناهی گەورە (**الكبائر**) دادەنرێ کە بریتین لە:

١) **ڕووپامایی (الرياء)**: واتە: ئەنجامدانی کارێکە بۆ ئەوەی خەڵکی بە هۆیەوە بیناسێ، واتە ئەگەر کارەکەت بۆ خوا نەبێ ئەو دەمە پێی دەگوترێ ڕووپامایی (**الرياء**) لە کارەکانیدا کردووە. هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿**إِنَّ أَخْوَفَ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمْ الشِّرْكُ الْأَصْغَرُ: الرِّيَاءُ، يَقُولُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِذَا جَزِيَ النَّاسُ بِأَعْمَالِهِمْ: إِذْهَبُوا إِلَى الَّذِينَ كُنْتُمْ تُرَاؤُونَ فِي الدُّنْيَا فَانْظُرُوا هَلْ تَجِدُونَ عِنْدَهُمْ جَزَاءً**﴾ صحيح رواه الامام احمد. واتە: گەورەترین شت کە بەهۆیەوە لێتان بترسم شیرکی بچووك (**الرياء**)ە بۆیە ڕۆژی دوایی خوای گەورە لەکاتی پاداشت دانەوەی خەڵکی دا دەفەرمووێ: بڕۆنە لای ئەو کەسانەی کە کارەکانتان بۆ ئەوان دەکرد، دیقەت بدەن ئایا پاداشتتان پێ دەدەن؟

٢) **سوێند خواردن بە غەیری خوا**: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿**مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللهِ فَقَدْ أَشْرَكَ**﴾ صحيح رواه أحمد. واتە: هەر کەسێك سوێند بە غەیری خوا بخوات ئەوا هاوبەشی بۆ خوا بڕیار داوە. بەڵام هێندێ جاران سوێندەکەی لێ دەبێتە شیرکی گەورە گەر وابزانێ ئەم کەسەی کە سوێندی پێ دەخوات بە درۆ بێنت، تووشی ناخۆشی و دەردەسەری دەبێت.

٣) **شیرکی شاراوە (الشرك الخفي)**: شیرکی شاراوە دەربڕینی ووتەیەکە کە زۆر شاراوە و پەنهانە، کەچی بە شیرك بۆت حسێب دەکرێ... بۆ نموونە: ئەگەر بڵێی: (ئەگەر لەبەر خوا **و** فلان کەس نەبوایە) بەکارهێنانی پیتی (**و**)ەکە بۆت دەبێتە شیرك... هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿**لاتقولوا ماشَاءَ اللهُ وشَاءَ فُلانَ، ولكِنْ قُولُوا مَا شَاءَ اللهِ ثُمَّ شَاءَ فُلانَ**﴾ صحيح رواه الامام احمد. واتە: مەڵێ خوا و فلانە کەس دەیانویست، بەڵکو بڵێ خوا **پاشان** فلان کەس دەیویست. چونکە بەکارهێنانی پیتی (و) لەم شوێنەدا بەوە حسێب دەکرێ کە تۆ فلان کەست وەکو خوا حسێب کردووە.

## پ٩٦/ ئەو شیرکە ڕووالەتییانە چین کە لە نێو کۆمەڵگادا بڵاون؟

و: ئەمڕۆ لە جیهان دا زۆر جۆرە شیرك هەن کە هێندێکیان لەوانە بریتین لە:

١) **پاڕانەوە لە غەیری خوا**: (لە پێشدا باسمان کردووە).

٢) **گۆڕی پیاوچاکان بکرێت بە پەرستگا**: لە زۆربەی وولاتان پیاوچاکان لە مزگەوت بە خاك دەسپێردرێن، ئەمەشیان بە (شیرك) حسێب دەكرێت. بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿**لَعَنَ ا للهُ اليَهُودَ والنَّصَارى إتَّخَذوا قُبُورَ أنْبيَائِهِمْ مَسَاجِدَ**﴾ متفق عليه. واتە: نەفرەتی خوا لە جولەكە و دیانەكان بوو بەوەی كە گۆڕی پێغەمبەرەكانیان كردە پەرستگا. واتە: ئەگەر دروست نەبێ گۆڕی پێغەمبەران بكرێتە پەرستگا ئەی چۆن بۆ پیاوچاكان دروستە؟

٣) **لە خۆگرتن بۆ پیاوچاكان**: (لە پێشدا باسمان كرد).

٤) **قوربانی سەربڕین بۆ گۆڕی پێغەمبەران و پیاوچاكان**: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿**لعَنَ ا للهُ مَنْ ذَبَحَ لِغَيرِ ا للهِ**﴾ رواه مسلم. واتە: نەفرەتی خوا لەو كەسە بێ كە قوربانی بۆ غەیری خوا سەر دەبڕێ.

٥) **سووڕانەوە بە دەوری گۆڕی پێغەمبەران و پیاوچاكان لە بەر گەورەیی ئەوان**: چونكە سووڕانەوە **عیبادەتە** ئەمەش دروست نی‌یە بۆ غەیری (**كعبة**) ئەنجام بدرێ، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿**وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ**﴾ الحج ٢٩. واتە: با بە دەوری كەعبەدا بسووڕێنەوە.

٦) **نوێژ كردن رووەو گۆڕ كە حەرامە**: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿**لا تَجْلِسُوا عَلَى القُبورِ ولا تُصَلُّوا إلَيْهَا**﴾ رواه مسلم. واتە: لە سەر گۆڕ دامەنیشن و نوێژی بەرامبەر مەكەن.

٧) **گەشت كردن بۆ شوێنێك بە ناوی پیرۆزی**: ئەمەش دروست نی‌یە هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿**لاَ تُشَدُّ الرِّحَالُ إلاّ الى ثَلاثَةِ مَسَاجِدَ: المَسْجِدُ الحَرَامُ ومَسْجِدِي هَذا والمَسْجِدُ الأقْصَى**﴾ متفق عليه. واتە: سەردانی هیچ شوێنێك ناكرێ بە نیەتی پیرۆزی تەنها بۆ سێ مزگەوت نەبێ كە بریتین لە: (**مسجد الحرام**) لە مەككە و مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ و (**بيت المقدس**) لە قودس.

٨) **حوكم كردن بە غەیری قورئان**: (لە پێشدا باس كراوە).

٩) **گوێڕایەڵی فەرمانڕەوایانی خوانەناس**: (لە پێشدا باس كراوە).

١٠) **پەت كردنە دەست**: رۆژێك پێغەمبەر ﷺ چاوی كەوت بە یەكێك كە پەتی لە دەستی خۆی ئاڵاندبوو، لە بەر لاوازی، ئەویش پێی گوت: ﴿...**ألاَ إنَّهَا لاتَزِيدُكَ إلاَّ وَهْنَاً. إنْبِذْهَا فإنَّكَ لَو مُتَّ بها مَا أفْلَحْتَ أبَداً**﴾ الامام احمد. واتە: ئەم پەت لە دەست كردنەت لاوازیت زیاد دەكات، جا فڕێیدە چونكە گەر بمریت و ئەمەت لە دەستا بێت بە هیچ جۆرێك رزگارت نابێ (لە ئاگر).

١١)**هەڵواسینی مۆروو (التمائم) بۆ لابردنی دەرد و نەخۆشی:** پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:
**﴿مَنْ تعَلَّقَ تَمِيمَةً فَقَدْ أَشْرَكَ﴾** الامام احمد. واتە: هەرکەسێك مۆروو هەڵبواسێ ئەوە هاوبەشی بۆ خوا بڕیار داوە.

١٢)**نووشتەی نا شەرعی (الرُّقَى):** بریتی‌یە لە چەند ووشەیەك كە لە سەردەمی نەفامی دەیاننووسی بە مەبەستی لابردنی دەرد و بەلا و نەخۆشـی، هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **﴿إِنَ الرُّقىَ والتَّمَائِمَ والتِّوَلَةَ شِرْكٌ﴾** رواه احمد وابوداود. واتە: بێ گومان هەڵواسینی مۆروو و نوشتەی ڕەش و سپی هاوبەش دانانە بۆ خوا. بەڵام **(سیوطي)** دەربارەی نوشتەی شەرعی دەڵێ: هێندێك لە زانایان دەڵێن: نووشتە بە چوار مەرج شەرعی‌یە یان حەلاڵە:

أ) بە ئایەتەكانی قورئان یان بە ناوەكانی خوا یان بە سیفەتەكانی خوا بێت.

ب) بە زمانی عەرەبی بێت و مانا بدات.

ج) بڕواشت وابێت كە نووشتە هیچ سوودی نی‌یە، بەڵكو هەموو شت لە ژێر ویستی خودایە.

د) دەبێ ئەم نوشتەیە لە جێگایەكی پاكدا و كابرا لەش پیس نەبێ ئەو دەمە ئەو نووشتەیە بە حەلاڵ دەزانرێت.

١٣)**جادوو (السحر):** جادوو بە هەموو جۆرەكانی‌یەوە هەروەكو شیركە چونكە پشت بەستنە بە جنۆكە و شەیتان و ئەستێرە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: **﴿مَنْ عَقَدَ عُقْدَةً ثُمَّ نَفَثَ فِيهَا فَقَدْ سَحَرَ ومَنْ سَحَرَ فَقَدْ أَشْرَكَ﴾** رواه احمد. واتە: هەركەسێك گرێیەك لێ بدات و پاشان فووی پیا بكات ئەوە جادووی كردووە، هەركەسێكی سیحر بكات ئەوا تووشی كوفر بووە.

پێشەوایان **(مالك و ابو حنيفة و احمد)** ﷺ ڕایان لە سەر ئەوەیە كە جادوو كەر كافرە، هێندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموون: سزای جادووكەر كوشتنە، هەروەك (بەجالەی كوری عەبدە) دەفەرمووێ: (**كَتَبَ إِلَيْنَا عُمَرُ بنُ الخَطَّابِ** ﷺ **اَنْ إِقْتُلُوا كُلَّ ساحِرٍ و سَاحِرَةٍ، قالَ فَقَتَلْنَا ثَلاثَ سَوَاحِرَ) رواه البخاري.** واتە: عومەر ﷺ كاغەزی بۆمان نووسی كە (پیاو یان ژنی) جادووكەر بكوژن، ئێمەش سێ جادووكەرمان كوشت.

١٤)**نوشتەی ڕەش و سپی (التِّوَلَة):** ئەمەشیان جۆرێكە لە نوشتە كە بە مەبەستی شیرین كردنی ئافرەت و پیاوە لە لای یەكتر، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **﴿إِنَّ الرِّقىَ والتَّمائِمَ والتِّوَلَةَ شِرْكٌ﴾** رواه احمد و ابوداود.

١٥)**فاڵچی (الكهانة والعرافة):** فاڵچی ئەو كەسەیە كە لافی ئەوە لێ دەدات كە گوایە غەیب دەزانێ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **﴿مَنْ أَتَى عَرَّافاً فَسأَلَهُ عَنْ شَيءٍ فَصَدَّقَهُ لَمْ**

**تُقْبَلْ لَهُ صَلاةُ أَرْبَعِينَ يَوْماً﴾** رواه مسلم. واتــه: هــەر کەسێك چووە لای فاڵچی‌یەك و داوای شتێکی لێ کرد و پێی بروا کرد، نوێژی چل ڕۆژی لێ وەرناگیرێ.

١٦) **بەهێدووم** (الطيرة): ئەمـەیان جـۆرە داب و نـەریتێکی نەفامی‌یـە کـە کەوتۆتـە نێـو کۆمەڵگاوە، زۆر جۆری هەیە وەکو:

أ) ئەگەر یەکێك بپژمێ بۆ هیچ شوێنێك ناچن.

ب) ئەگەر کەڵەشێر لە ناوەخت بانگ بدات ئەوا باش نی‌یە.

ج) ئەگـەر کونـدە بـەبۆ لـە سـەر ماڵێك بنیشـێ کـارێکی خـراپ ڕوو دەدات. بۆیـە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **﴿مَنْ رَدَّتْهُ الطِّيَرَةُ عَنْ حَاجَتِهِ فَقَدْ أَشْرَكَ﴾** رواه احمد. واتە: ئەگەر یەکێك (بۆ شوێنێك چوو بەڵام) لە بەر شـوومی دەنگێکەوە گەڕایەوە ئەوە هاوبەشی بۆ خوا بڕیار داوە.

## پ٩٧/ ئەو شتانە چین کە نزیکن لە شیرك؟

و: زۆر کردەوە هەن لەکاری (شرك)ەوە نزیکن بۆ نموونە:

١) **بە جۆرێك پێغەمبەرت خۆش بـوێ کـە بیهێنیتـە ڕیـزی خـوا**: پێغەمبـەری پێشـەوا ﷺ یاساغی کردووە کـە لـە سنووری خـۆی زیـاتر بـەرز بکرێتـەوە، بۆیـە دەفـەرمووێ: **﴿لاَ تُطْرُونِي كَمَا أَطْرَتِ النَّصَارَى عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ، إِنَّمَا أَنَا عَبْدٌ، فَقُولُوا عَبْدُ اللهِ وَرَسُولُهُ﴾** متفق عليه. واتـە: بـەرزم مەکەنـەوە هـەروەك دیانـەکان (عیسـای کـوڕی مەریەم)یان بەرز کردەوە، بەڵکو من بەندەی خوام، بۆیە پێم بڵێن بەندەی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ.

٢) **ڕۆچوون لە خۆشەویستی پیاوچاکان**: دیسـان ئەگـەر ئـەم ڕۆچوونـە بـۆ پێغەمبـەر ﷺ دروست نەبێ بۆ هیچ پیاوچاکێك دروست نی‌یە؟!

٣) **بە گەورە دانانی گۆڕ**: لەم ڕووانەی خوارەوە:

أ) **کردنی بە مزگەوت**: هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **﴿أَلا إِنَّ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ كَانُوا يَتَّخِذُونَ قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدْ اَلا فَلاَ تَتَّخِذُوا الْقُبُورَ مَسَاجِدَ فَإِنِّي أَنْهَاكُمْ عَنْ ذَلِكَ﴾** **رواه مسلم.** واتە: لە پێش ئێوە گۆڕی پێغەمبەرەکانی خۆیان دەکردە مزگەوت، بەڵام ئێوە گۆڕەکان مەکەن بە مزگەوت (چونکە) من ڕێی ئەوەتان پێ‌نادەم.

ب) **ڕازاندنەوەو چرا داگیرساندن لە سەری**: هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: **﴿لَعَنَ اللهُ زَائِرَاتِ الْقُبُورِ وَالْمُتَّخِذِينَ عَلَيْهَا الْمَسَاجِدَ وَ السُّرُجَ﴾** رواه اهل السنن وصححه ابن تيمية. واتە: نەفرەتی خوا لەو ئافرەتانە بێت کـە سـەردانی گـۆڕ دەکـەن و دەیکـەن بـە مزگەوت و چرای لەسەر دادەگیرسێنن.

ج) **نوێژ کردن بەرامبەری کە ئەوەش حەرامە**: هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿**لاتَجلِسُوا عَلَى القُبُورِ ولاَ تُصَلُّوا اِلَيهَا**﴾ رواه مسلم. واتە: لەسەر گۆڕ دامەنیشن و نوێژی لە بەرامبەر مەکەن.

د) **خانوو لەسەر دروست کردن و هەڵبەستنی**: هەروەك (جابر) ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: ﴿**نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ تَجْصِيصِ الْقَبْرِ وَاَنْ يُقْعَدَ عَلَيْهِ وَاَنْ يُبْنَى عَلَيْهِ بِنَاءٌ**﴾ مسلم، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە کەوا گۆڕ هەڵبەستری یان لە سەری دانیشێ و خانووی لەسەر دروست بکرێ.

هـ) **نووسین لەسەر گۆڕ**: دیسان لە (جابر) دەگێڕنەوە ﷺ کە ﴿**اَنَّهُ ﷺ نَهَى اَنْ يُجَصَّصَ الْقَبْرَ وَاَنْ يُكْتَبَ عَلَيْهَا**﴾ رواه مسلم. واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵبەستن و نووسین لەسەر گۆڕی قەدەغەکردووە.

و) **بەرز کردنەوەی گۆڕ**: لِحَدِيثِ عَلِي بِنْ اَبِي طَالِب اَنَّ النَّبِيَّ ﷺ ﴿**اَمَرَهُ اَلاَّ يَدَعَ قَبْرًا مُشْرِفًا اِلاَّ سَوَّاهُ**﴾ رواه مسلم. واتە: (**علي کوری أبو طالب**)ﷺ دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردمی فەرمووی هەرچی گۆڕێکت بینی بەرز کرابۆوە تەختی بکە.

لە سونەنی ئەبی داود دا هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە جگە لەگڵ و بەردی گۆڕەکە زیاتر شتی تری تیا بکرێ.

ز) **کردنی گۆڕ بە جەژنگا**: هەروەك پێغەمبەری پێشەوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿**لاتَجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ قُبُوراً ولاتَجْعَلُوا قَبْرِي عِيدًا، وصَلُّوا عَلَيَّ فَاِنَّ صَلاَتَكُمْ تَبْلُغُنِي حَيْثُ كُنْتُمْ**﴾ رواه ابوداود. واتە:ماڵەکانتان مەکەن بە گۆڕ، وەگۆڕی من مەکەن بە جەژنگا بەڵکو(سەڵەوات)م بۆ بنێرن، لە هەرکوێ بن دەمگاتێ. کەواتە: ئەگەر دروست نەبێ گۆڕی پێغەمبەر ﷺ بکرێت بە جەژنگا ئەی کەواتە چۆن دروستە بۆ گۆڕی کەسێکی تر بکرێت بە جەژنگا.

٤) **کردنی دارو بەرد بە مووفەڕك**: بەهیچ جۆرێك دروست نییە دارو بەرد بکرێتە مووفەڕك چونکە ئەم کارە بریتییە لە زەوت کردنی مافی خوا... چونکە مافی خوا پەرستنیەتی، کردنی دارو بەردیش بە مووفەڕك بە پەرستن دادەنرێ.(بەنسبەت ماچ کردنی بەردە ڕەشەکەش شتێکی تایبەتەو ناکرێتە قیاسێکی گشتی).

## پ٩٨/ زیانەکانی شیرك بە گشتی چین؟

و: هاوبەش (**شرك**) بڕیاردان زۆر زیانی هەیە کە گرنگترینیان بریتین لە:

١) **هاوبەش بڕیاردان ئەتکی مرۆڤایەتی دەکات**:

ئادەمیزاد ئازیزترین دروست کراوە لە دروست کراوەکانی خوا، هەر بۆیە خوای پەروەردگار کردویەتی بەجێنشین لە سەر زەوی و هەموو بونەوەریشی بۆ خزمەتی ئەو

دروست کردووه، بەڵام بە هاوبەش بڕیاردان بۆ خوا لە هەمووکەس زەلیلتر دەبێ و وای لێدێ ببێت بەبەندەی هەمووکەسێك... بۆیە خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ السَّمَاءِ فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ، أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ﴾ الحج٣١. واتە: هەرکەسێکی هاوبەش بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوا وەکو ئەوە وایە کە لەئاسمان بەربێتەوە و باڵندە بیرفێنێ، یان (با) یەك بێت لەگەڵ خۆی ڕاپێچێ بدات بۆ شوێنێکی دوور لە ئاوایی.

٢) **هاوبەش بڕیاردان چاوگی ئەفسانە و خورافیاتە:**

بۆ نموونە ئەو کەسەی وابزانێ نوشتەوکشتەك و پەت بەستن لە قۆڵ و فنجان گرتنەوە و... هتد وەسیلەن بۆ چارەسەرکردنی ئادەمیزاد لە بەڵاو دەردەسەری، ئەوا ئەو کەسە ئامادەیە بۆ بڕوا کردنی هەموو جۆرە ئەفسانەیەك.

٣) **هاوبەشی بڕیاردان گەورەترین زوڵمە:**

هاوبەش بڕیاردان زوڵمێکە لە خۆ دەکرێت، چونکە پیاوی هاوبەشدانەر ئامادەیە (تنازل) بکات و خۆی بکات بەبەندەی کەسێکی تری وەك خۆی، هەروەك لوقمانی حەکیم ئامۆژگاری کورەکەی دەکات و دەفەرموێ: ﴿لاَ تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ لقمان ١٣. واتە: هاوبەش بۆ خودا دامەنێ، چونکە بێ گومان هاوبەش دانان گەورەترین زوڵمە.

٤) **هاوبەش دانان هۆیەکە بۆ ترسنۆکی:**

ئەو کەسەی ئەقڵی خۆی گیرۆدەی چەند شتێکی ئەفسانە دەکات، ئینسانێکی ترسنۆکی لێ دەردەچێ....چونکە پشتی خۆی بەچەند خوایەکی دەستکرد دەبەستێ... بۆیە خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿سَنُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ بِمَا أَشْرَكُوا بِاللَّهِ....﴾ آل عمران ١٥١. واتە: ئێمە ترس دەخەینە دڵی بێ بڕواکان بەوەی کەهاوبەش بۆ خودا پەیدا دەکەن.

٥) **هاوبەش بڕیاردان کردەوەی چاکەکان پووچ دەکاتەوە:**

هەروەك خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿وَلَوْ أَشْرَكُوا لَحَبِطَ عَنْهُمْ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ الانعام ٨٨. واتە: ئەگەر هاوبەش بۆ خوا بڕیار بدەن ئەوا ئەو کردەوانەی کە کردوویانە پووچ دەکەینەوە.

٦) **هاوبەش بڕیاردان سەردەکێشی بۆ چوونە ناو دۆزەخ بەهەتا هەتایی:**

خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿إِنَّهُ مَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ، وَمَأْوَاهُ النَّارُ...﴾ المائدة ٧٢. واتە: هەرکەسێکی هاوبەش بۆ خوا بڕیار بدات ئەوا بەهەشتی لێ حەرام دەبێ و شوێنیشی ناو ئاگری دۆزەخ دەبێت.

٧) **هاوبەش دانان کۆمەڵگا پارچە پارچە دەکات:**

هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلا تكونوا مِن المُشْرِكين، من الذين فرّقوا دينهُم....﴾ الروم ٣١-٣٢. واتە: وەكو هاوبەش دانەرەكان مەبن، ئەوانەی ئایینە کەی خۆیانیان پارچە پارچە کرد.

## پ٩٩/ (تَوَسُّل) و جۆرەكانی چین؟

و: (توسل) واتە: بە کارهێنانی جۆرە شێوازێکە بۆ نزیك بوونەوە لە خوا، دووجۆر (توسل) یش هەیە، کە یەکیان دروستە، ئەوی تر دروست نی یە.

## پ١٠٠/ چ جۆرە (توسل) ێك دروستە؟

و:

١) **(توسل) بە باوەڕ**: هەروەك خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿رَبَّنَا إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِياً يُنَادِي لِلإِيمَانِ أَنْ آمِنُوا بِرَبِّكُمْ فَآمَنَّا....﴾ آل عمران ١٩٣. واتە: ئەی پەروەردگار ئێمە گوێ مان لە بانگەوازێك بوو بۆ باوەڕ کە باوەڕ بێنن بە پەروەردگارتانەوە، ئێمەش باوەڕمان هێنا.

٢) **(توسل) بە یەکخواناسی (التوحید)**: وەکو (توسل)ەکەی (یونس) پێغەمبەر ﷺ کاتێ لە ناو سکی نەهەنگ بوو فەرمووی: ﴿فَنَادَى فِي الظُّلُمَاتِ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ، فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَنَجَّيْنَاهُ مِنَ الغَمِّ وَكَذَلِكَ نُنْجِي المُؤْمِنِينَ﴾ الانبياء ٨٧-٨٨. واتە: لە تاریکی یەکان هاواری کرد بەوە کە هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نی یە تەنها بۆ تۆ نەبێت، پاکیو بێ گەردی بۆ تۆ بەڕاستی من ستەمم لە خۆکردووە، ئێمەش وەڵامان داوە و ڕزگارمان کرد لە ناخۆشی، بەو شێوەیە بڕواداران دەرباز دەکەین.

٣) **(توسل) بەناوو سیفەتەکانی خوا**: هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَلِلَّهِ الأَسْمَاءُ الحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَا﴾ الاعراف ١٨٠. واتە: خوای پەروەردگار خاوەن ناوی تەواوە، ئێوەش بەو ناوانە داوای لێ بکەن.

٤) **(توسل) بە سیفەتەکانی خوا**: هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿يَاحَيُّ يَا قَيُّومُ بِرَحْمَتِكَ أَسْتَغِيثُ﴾ الترمذي. واتە: ئەی (حيُّ) ئەی (قيُّوم) کە (دوو سیفەتی خوان) واتە: ئەی خوای زیندوو و هەڵسووڕێنەری کارەکان، بەرەحمەتی خۆت داوای کۆمەکیت لێ دەکەم.... .

٥) **(توسل) بە کردەوەی چاك**: وەکو نوێژو زیکرو و قورئان خوێندن و سەڵەوات دان لە سەر پێغەمبەر وجیهاد کردن و....هتد: هەروەك خوای پەروەردگار دەربارەی زیکری خۆی دەفەرمووێ: ﴿..... واذْكُرُوا اللهَ كَثِيراً لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾الانفال٤٥. واتە: زۆر یادی خوا بکەن بۆ ئەوەی ڕزگاربن.

## پ١٠١/ چ (توسل)ێك دروست نی‌یه‌؟

و:

١) (توسل) به‌ مردوو، یان داوای یارمه‌تی لیٚ کردنیان، خوای گه‌وره‌ ده‌فه‌موویٚ: ﴿وَلاَ تَدْعُ مِنْ دُونِ اللهِ مَالاَ يَنفَعُكَ وَلاَ يَضُرُّكَ﴾ یونس ١٠٦. واته‌: داوا له‌ غه‌یری خوا مه‌که‌ که‌ هیچ سوود و زیانیٚکت پیٚ‌ناگه‌یه‌نن.

٢) (توسل) به‌ که‌سیٚك به‌ ڕواڵه‌ت وا دیار بیٚ که‌ پیاوچاکه‌: بۆنموونه‌: بڵیٚیـت: (ئه‌ی خوای گه‌وره‌ له‌به‌ر خاتری فلاٚنه‌ شیٚخ یان فلاٚنه‌ پیاو چاك یان فلاٚنه‌ سه‌یید وام بۆ بکه‌).

## پ١٠٢/ وه‌رگه‌ڕاو (مرتـد) لـه‌ دیـن چی‌یـه‌ و لـه‌ ئیسـلامدا حوکمـی چۆنه‌؟

و: (مرتد) واته‌ له‌ دین وه‌رگه‌ڕاو، (ردة) واته‌: وه‌رگه‌ران و خۆ پچڕاندنی له‌ ئیسلام به‌ گوفتـار یان به‌ کرده‌وه‌، جابه‌ ڕقه‌کاری بیٚ، یان به‌ گاڵته‌جاری، یان ته‌نها بـه‌بیرو بـاوه‌ڕ بـیٚ، بـه‌و مه‌رجـه‌ی منداڵ یان شیٚت یان زۆرلیٚ کراو نه‌بیٚ. له‌ ئیسلامیش دا (مرتد) زۆر حوکمی هه‌یه‌ هه‌ریه‌کـه‌ و بـه‌ پیٚی بارو دۆخ و شوێن جیٚگای ده‌گۆڕیٚ، بۆنموونه‌:

**یه‌که‌م**: ئه‌گـه‌ر (مرتـد) جـه‌نگی له‌گـه‌ڵ مـسـوڵمانان نـه‌ده‌کرد، پیٚویسـته‌ داوای مـسـوڵمان بوونه‌وه‌ی لیٚ بکریٚ، جا ئه‌گه‌ر شاده‌ی نه‌هیٚناو نه‌بووه‌وه‌ مسوڵمان: ئه‌وا ده‌بـیٚ له‌سـه‌ری بـدریٚ. جا پیاو بیٚ یان ژن، به‌ڵام ئه‌گه‌ر بۆوه‌ مسـوڵمان و شـاده‌ی هیٚنـا ئـه‌وا لیٚی ده‌بوردریٚت و ڕیٚگـای پـیٚ ناگیریٚ. به‌ڵام زۆر له‌زانایانی ئیسلامی فه‌رموویانه‌: ئه‌گه‌ر ئه‌م (مرتد)ه‌ جنیٚوی بـه‌ پیٚغه‌مبـه‌ر دابـیٚ، ئه‌وا په‌شیمان بیٚته‌وه‌ یان په‌شیمان نه‌بیٚته‌وه‌ هه‌ر له‌ گه‌رده‌نی ده‌دریٚ و ده‌بیٚ بکوژریٚ. هیٚندیٚکـی تـر له‌ زانایان ده‌ڵیٚن: ئه‌گه‌ر (مرتد)یه‌که‌ی بۆ (الكفر الخفي) بـوو واتـه‌ کوفـری نادیـار وه‌کـو (کوفـری سیاسی) ئه‌وه‌ش موسڵمان بوونه‌وه‌ی له‌دونیادا لیٚوه‌رناگیریٚ و ده‌بیٚ له‌سـه‌ری بـدریٚ، بـه‌ڵام ده‌بیٚ بزانین که‌وا حوکمی کوشتنی (مرتد)ی به‌شی یه‌کـه‌م کـه‌ بـاس کـرا ده‌بیٚ پیٚشـه‌وای مـسـوڵمانان بڕیاری له‌ سه‌ر بدا، واته‌ هیچ که‌س بۆی نی‌یه‌ له‌ سه‌ری بدات به‌ بیٚ پرسی پیٚشه‌وای مسوڵمانان.

**دووه‌م**: ئه‌گه‌ر کۆمه‌ڵه‌ (مرتد)ێك جـه‌نگیان له‌گـه‌ڵ مـسـوڵمانان کـرد: ئـه‌وا پیٚویسـت ناکـات داوای مـسـوڵمان بوونـه‌وه‌یان لیٚ بکـریٚ و بـۆ هه‌رکه‌سـیٚك دروسـته‌ بیـانکوژیٚ، بـه‌ هه‌رشـیٚوه‌یه‌کی بگونجیٚ، جـا ئه‌گـه‌ر ئـه‌م کۆمه‌ڵـه‌ (مرتـد)ه‌ مـسـوڵمانانیان کوشـت ئینجـا بوونـه‌وه‌ مسـوڵمان، ئـه‌وا هه‌ردروسته‌ له‌ تۆڵه‌ی خویٚنی مـسـوڵمانان بیانکوژنه‌وه‌ و تۆڵه‌ی مولك و سـامانی مسوڵمانانیشـیان لیٚ بکریٚته‌وه‌.

**سیٚیه‌م**: دیله‌ (مرتد)ه‌کان که‌ مسوڵمانیان نه‌کوشـتوون ئـه‌وا داوای مـسـوڵمان بوونـه‌وه‌یان لیٚ ده‌کریٚ و ئه‌گه‌ر بوونه‌ مسوڵمان ئه‌وا لیٚیان ده‌ بوردریٚ. ئه‌گـه‌ر نـا ده‌کوژریٚـن.واتـه‌ ناکریٚنـه‌ کۆیلـه‌ به‌ڵام مناڵه‌کانیان هه‌ر به‌ مسـوڵمان ده‌ژمیٚردریٚن.

**چوارەم**: هەرجۆرە (**مرتد**) ێك هەبێ، گەر مسولمان نەبووەوەو مرد، یان کوژرا، دەبێ موڵك و سامانی بدرێتە (**بیت المال**)ی مسولمانان. هەروەها نابێ بشوورێن و نوێژیشیان لەسەر بکرێ‌و لە گۆڕستانی مسولمانان بنێژرێن.

**پێنجەم**: گفت و گۆی پێك هاتن لەگەڵ هیچ جۆرە (**مرتد**)ێك دروست نی‌یە، هەرچەندە جزیەش بدەن، هەروەها هەر جۆرە (**مرتد**) ێك هەبێ لەدوای سێ (**عدة**) مارەبڕی ژنەکەی دەپچڕێ‌و ژنەکەی دەتوانێ مێردێکی تر بکاتەوە، بەڵام ئەگەر مسولمان بۆوە ئەوا دووبارە لێ‌ی مارە دەکرێتەوە، ئەگەر ژنەکە ویستی وابوو شووی پێ بکاتەوە.

## پ۱۰۳/ حوکمی یاخی بووان (اهل المعاصي) چی‌یە لەئیسلامدا؟

و: یاخی‌بووان لە ئیسلام دەرناچن: هەروەك (**طحاوي**) رەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: ﴿**ولانُكفّرُ أحَداً مِنْ أهْلِ الْقِبْلَةِ بِذنْبِ مَالَمْ يَسْتَحِلَّهُ...**﴾. واتە: ئێمە (ئەهلی سوننەو جماعە) خاوەن ڕووگە بەتاوانێك کافر ناکەین مەگەر ئەو تاوانە بە حەڵاڵ بزانێ.

هەروەها (ئیمامی **نووي**) رەحمەتی خوای لێ بێ، دەڵێ: (**واعلم ان مذهب اهل السنة وما عليه اهل الحق من السلف والخلف، ان من مات موحداً دخل الجنة قطعاً علي كل حال، فان كان سالماً من المعاصي كالصغير والمجنون، والذي اتصل جنونه بالبلوغ والتائب توبةً صحيحةً من الشرك او غيره من المعاصي، اذ لم يحدث معصيةً بعد توبته والموفق الذي لم يبتل بمعصيةٍ اصلاً، فكل هذا الصنف يدخلون الجنة ولا يدخلون النار اصلاً لكنهم يردونها علي الخلاف المعروف في المورود، والصحيح ان المراد به المرور على الصراط، وهو منصوب على ظهر جهنم، ومن سائر المكروه، واما من كانت له معصيةومات من غير توبةٍ، فهو في مشيئة الله تعالى، فان شاء عفا عنه، وادخله جنة اولاً، وجعله قسم الاول، وان شاء عذبه القدرالذي يريده سبحانه وتعالى، ثم يدخله الجنة، فلا يخلد في النار احداً مات على التوحيد ولو عمل من اعمال البر ما عمل**). واتە: بزانە، مەزهەبی ئەهلی سوننەو ئەوانەی کە لەسەرینە وەکو سەلەف و خەلەف، ئەوەیە کە هەرکەسێك بمرێ بە خواناسی ئەوا دەچێتە بەهەشت جا بەهەر شێوەیەك بێ، هەروەها ئەو کەسانەی کە بێ تاوانن، واتە (تاوانیان بۆ نانووسرێ) وەکو منداڵ و شێت، وە ئەو کەسەی پێش ئەوەی بالغ بووبێ شێت بووبێ، (واتە: ئەو کەسەی گوناهی کردبێ پێش شێت بوون) و ئەو کەسەی تەوبەیەکی چاکی کردووەو لە شیرك دانان پەشیمان بووبێتەوەو لەپاش پەشیمان بوونەوەکەی گوناهی نەکردبێ (چونکە پیاوی یارمەتی دراو- مۆفەق لەلای خوا ئەو کەسەیە کە تووشی تاوان نەبێ) ئا ئەوانەی کەباس کران گشتی‌یان دەچنە بەهەشت و ناچنە نێو ئاگر.بەڵام کێشە هەیە لەسەر ئەوە: کەئایا بەسەر پردی(**صراط**)دا ڕەت دەبن یان نا، بەڵام(صحیح) وایە کەبەسەری دا ڕەت دەبن، (خوا پەنامان بدات لەگەڵ هەموو جۆرە تاوانێك) هەرکەسێك تاوانی هەبێ‌و بەبێ پەشیمان بوونەوە بمرێ، ئەوا دەکەوێتە سەر ویستی خوا، ئەگەر خوا بیەوێ لێ‌ی خۆش دەبێ‌و دەیخاتە بەهەشت و لەریزی کۆمەڵی یەکەمیان دادەنێ، پاشان ئەگەر بیەوێ سزای دەدات و ئینجا دەیخاتە بەهەشت، بەڵام کەس بەنەمری لە نێو ئاگر نامێنێتەوە ئەگەر بە خواناسی بمرن،

ئەگەرچی گوناهباریش بن، هەروەك ناچێتە بەهەشت ئەگەر بەكافری مردبێ ئەگەرچی كارێكی چاكیشی كردبێ.

كەواتە: هەركەسێك بەباوەڕدوە بمرێ، بەڕاستی لەدڵی‌یەوە باوەڕی بەهەردوو شایەدی‌یەكەوە هەبێت و بەڕاستی بزانێ، ئەوا دەچێتە بەهەشت و ئەوەندە تاوانەی كە كردووشیەتی لە ڕێگەی ئاگرەوە لێی پاك دەبێتەوە، ئینجا كە پاك بۆوە ئەو دەمە دەچێتە بەهەشت، چونكە بەو گوناهانەی كە كردوویەتی مادام گوناهی وانەبێ كەوا هەردوو شایەدمانی‌یەكەی لێ سڕابێتەوە، نابێتە هۆی ئەوەی كە هەتا هەتایە لە نێو ئاگر بمێنێتەوە، زۆر فەرموودەش هەن لەم بابەتەوە، بۆ نموونە:

١) عن عثمان ﷺ: قال رسول الله ﷺ: ﴿مَنْ مَاتَ وهُوَ يَعْلَمُ أنَّهُ لاإلهَ إلاّ اللّهَ دَخَلَ الْجَنَّةَ﴾ رواه مسلم. واتە: هەركەسێك بمرێ‌و زانیبێتی كە غەیری خوا هیچ كەس شیاوی پەرستن نی‌یە ئەوا دەچێتە بەهەشت.

٢) ﴿يَدْخُلُ اَهْلُ الْجَنَّةِ الْجَنَّةَ واَهْلُ النَّارِ النَّارَ، ثُمَّ يَقُولُ اللهُ تَعَالَى: أخْرِجُوا مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنَ الأيْمَانِ﴾ متفق عليه. واتە: ئەهلی بەهەشت دەچنە بەهەشت ودۆزەخیش دەچنە دۆزەخ، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێ: هەركەسێك تۆزقاڵێك باوەڕی لەدڵ دا بووە لە ئاگر دەریان بێنن.

٣) ﴿اَتَانِي جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلامُ فَبَشَّرَنِي انَّهُ مَنْ مَاتَ مِنْ أُمَّتِكَ لايُشْرِكُ بِاللهِ شَيْئاً دَخَلَ الْجَنَّةَ. قُلْتُ: وانْ زَنَى وانْ سَرَقْ؟، قَالَ وانْ زَنَى وانْ سَرَقْ﴾ متفق عليه. واتە: جبریل عليه السلام هاتە لام و مژدەی پێدام بەوەی كە هەركەسێك لە ئوممەتی تۆ ئەگەر هاوتای بۆ خوا بڕیارنەدات كە مرد دەچێتە بەهەشت، منیش گوتم: ئەگەر زیناو دزیشی كردبێت؟ ئەویش فەرمووی: (بەڵێ) ئەگەر زیناو دزیشی كردبێ.

## پ١٠٤/ تاوان دەكرێتە چەند بەش؟

و: تاوان دەكرێتە دووبەش، كە بریتین لەتاوانە بچووكەكان كە پێیان دەڵێن: **(السَّيِّئَات)** و تاوانە گەورەكان كە پێیان دەڵێن: **(الكبائر)**.

## پ١٠٥/ تاوانە گەورەكان (الكبائر) چین؟

هەر تاوانێك كە لەدونیا حەددی بۆ دانرابێ پێی دەڵێن: (الكبائر) وەك: (زینا، دزی، بوختان، ئارەق خواردنەوە... هتد).

## پ١٠٦/ چۆن گوناهەكان دەسڕێنەوە؟

و: بەواز هێنان لە گوناه و ئەنجام دانی كاری چاك گوناهەكان دەسڕێنەوە، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إنْ تَجْتَنِبُوا كَبَائِرَ مَاتُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنْكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُمْ مُدْخَلاً كَرِيماً﴾ النساء ٣١، واتە: ئەگەر واز بهێنن لە تاوانە گەورەكان و ئەوانەی كە نەهیان لێ كراوە، ئەو

ئێمه ئیمه گوناهەکانتان بۆ دەسڕینەوە دەتانخەینە شوێنێکی چاك لە بەهەشت. یان دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ﴾ هود ١١٤، واتە: کارە چاکەکان تاوانەکان لادەبات.

## پ١٠٧/ چۆن دەتوانین کاری چاك ئەنجام بدەین، تاوەکو گوناهەکانمان پێ بسڕینەوە؟

و: تاوانەکان گشتیان بە تۆبەیەکی تەواو (التوبة النصوح) دەسڕینەوە، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا تُوبُوا إِلَى اللَّهِ تَوْبَةً نَصُوحًا عَسَى رَبُّكُمْ أَنْ يُكَفِّرَ عَنْكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ﴾ التحريم ٨، واتە: ئەی بڕوادارینە بگەڕێنەوە لای خوا بە گەڕانەوەیەکی تەواو، چونکە خوا لە ڕێگەی ئەمەوە لە گوناهەکانتان خۆش دەبێ و دەتانخاتە بەهەشت کە ڕووبارێکی زۆری بەژێر دادەڕوات. یان دەفەرمووێ: ﴿إِلَّا مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا فَأُولَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ﴾ الفرقان ٧٠، واتە: تەنها ئەوانە نەبێ کە پەشیمان دەبنەوەو بڕوا دێنن و کردەوەی چاك ئەنجام دەدەن، ئەوانە خوای گەورە گوناهەکانیان بە چاکە بۆ دەگۆڕێتەوە.

## پ١٠٨/ ئەوشتانەی کە دەبنە هۆی تۆبەکردن وپەشیمان بوونەوە لە گوناه چین؟ یان چ شتێك دەبێتە هۆی پەشیمان بوونەوە لە گوناه؟

و: بە ئەنجامدانی شەش خاڵ دەبێتە هۆی پەشیمان بوونەوە کە ئەمانەی خوارەوەن:

١) **بیر کردنەوە لە مردن و لە حاڵی گیان کێشان:** پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿أَكْثِرُوا ذِكْرَ هَاذِمِ اللَّذَّاتِ﴾ رواه الترمذي، واتە: زۆر بیر لە ڕوخێنەری ئارەزوو و شەهوەتەکان بکەنەوە کەمردنە، یان خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿قُلْ إِنَّ الْمَوْتَ الَّذِي تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُ مُلَاقِيكُمْ﴾ الجمعة ٨، واتە: بڵێ (ئەی موحەممەد) ئەو مردنەی کە ئێوە لەبەری ڕادەکەن پێتان دەگات.

٢) **بیر کردنەوە لە قارو غەزەبی خوا:** چونکە گەر خوا غەزەبی گرت لەبەندەکانی دار و بەرد دەکەونە لەرزین و لە حەژمەتان خۆیان پێ ناگیرێ، (خوا پەنامان بدات). هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ﴾ البروج ١٢، واتە: بەڕاستی تۆڵە سەندنەوەی خوا زۆر توونـدە. یان دەفەرمووێ: ﴿وَكَذَلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَا أَخَذَ الْقُرَى وَهِيَ ظَالِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُ أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾ هود ١٠٢، واتە: ئەوە تۆڵە سەندنەوەی خوایە کاتێ بیەوێ لە شوێنێك کە زوڵمی تیابێ بسەنێ زۆر بەتووندی لێی دەسەنێ.

٣) **بیر کردنەوە لە نیعمەتەکانی خوا:** هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿فَاذْكُرُوا آلَاءَ اللَّهِ وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾ الأعراف ٧٤، واتە: یادی نیعمەتەکانی خوا بکەن و فەسادی لەسەر زەوی مەنێنەوە. یان دەفەرمووێ: ﴿أَلَمْ نَجْعَلْ لَهُ

أ) ﴿مَنْ تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ فَهُوَ مِنهُمْ﴾ رواه أحمد وأبو داود. واتە:هەركەسێك بچێتە سەر شێوەی کۆمەڵێك ئەوە لەوانە.

ب) ﴿مَنْ كَثَّرَ سَوَادَ قَوْمٍ فَهُوَ مِنْهُمْ﴾ رواه أبو يعلى والديلمي. واتە: هەركەسێك ژمارەی کۆمەڵێك زۆر بکات ئەوە لەوانە.

ج) ﴿سَيَكُونُ أُمَرَاءُ فَسَقَةٌ جَوَرَةٌ فَمَنْ صَدَّقَهُمْ بِكِذْبِهِمْ وأَعَانَ عَلَى ظُلْمِهِمْ فَلَيْسَ مِنِّي ولَسْتُ مِنْهُ ولاَ يَرِدُ عَلَى الْحَوْضِ﴾ النسائي والترمذي. واتە: لە داهاتوودا چەند کاربەدەستێکی تاوان بار و ستەمکار دێنە سەرکار جا هەرکەسێك شایەدی بۆ درۆیەکانیان بدا و ئۆباڵیان بۆ بکێشێ و، لەسەر ستەم و زۆریان یاریدەیان بدات، نە لە منەو نە من لەویم نە دەشچێتە سەر ئاوی کەوسەر!!.

**سێیەم: زانایان دەڵێن:**

أ) **(ابن الحجر الهيتمي)** بە رەحمەت بێ فەرموویەتی: کابرایەکی بەرگدروو چوو بۆ لای **(سفيان الثوري)** خوا لێی خۆش بێ، پێی گوت، قوربان من جل و بەرگی سوڵتان دەدرووم، ئایا لە ریزی یارمەتی دەرانی زاڵمان **(اعوان الظلمة)** دەژمێردرێم؟!! سفیان فەرمووی: بەڵکو تۆ خۆت لە ستەمکارانی، بەلاَم یارمەتی دەرانی ستەمکاران **(اعوان الظلمة)** ئەوانەن کە دەرزی و دەزووەکەت پێ دەفرۆشن؟!.

ب) دیسان پرسیار لە **(سفيان)** کرا دەربارەی زۆردارێك کە لە چۆڵایەکدا خەریکی مردنە، ئایا قومە ئاوێکی دەدرێتێ؟ فەرمووی: نەخێر، پێی گوترا ئەی بمرێ؟ فەرمووی لێی گەرێ بابمرێ.

ج) **(ابن تيمية)** بە رەحمەت بێ دەربارەی لەشکری تەتار دەفەرمووێ: ئەگەر منتان بینی لەگەڵ لەشکری تەتاردام و قورئانێکم لە بان سەری خۆم داناوە، ئەگەر منتان گرت یەکسەر بمکوژم، چونکە من ژمارەی لەشکرەکەم زیاد کردووە.(بۆ ئاگاداریش لەشکری تەتار زۆربەیان نوێژکەر و قورئان خوێن و ریشدار و بەرسمێڵ کەر بوون) بەلاَم چونکە یارمەتی (جەنگیز خان)یان دەدا کە پیاوێکی زاڵم و ستەم کاربوو بۆیە دروست نەبوو سەربازیان بۆ بکردبایە.

## پ١٣١/ بۆچی نابێ (ولاء) مان بۆ کافران هەبێ؟

و: لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

١) ﴿وَدُّوا مَا عَنِتُّمْ﴾ آل عمران ١١٨. واتە: بێ بڕواکان پێیان خۆشە کە تووشی ناخۆشی و چەرمەسەری ببن.

٢) ﴿قَدْ بَدَتِ الْبَغْضَاءُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ وَمَا تُخْفِي صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ﴾ آل عمران ١١٩. واتە: رق و کینەکانیان بەرامبەر بە ئێوە ئاشکرا بوو، ئەوەیش کە لە دڵیانە زۆر رقێکی گەورەترە بەرامبەر بە ئێوە.

٣) ﴿هَا أَنتُمْ أُوْلاءِ تُحِبُّونَهُمْ وَلاَيُحِبُّونَكُمْ﴾ آل عمران. ١١٨ واته: ئێوه کۆمەڵێکین ئەوانتان خۆش دەوێ بەڵام ئەوان ئێوەیان خۆش ناوێ.

٤) ﴿وَإِذَا لَقُوكُمْ قَالُواْ آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْاْ عَضُّواْ عَلَيْكُمُ الأَنَامِلَ مِنَ الْغَيْظِ﴾ آل عمران ١١٩. واته: کاتێ دەگەنە لای ئێوە (بەدرۆ) دەڵێن ئێمە باوەڕمان هێناوە، بەڵام کاتێ لەلای ئێوە دەڕۆن لە ڕقان پەنجەتان لێ دەکرۆژن.

٥) ﴿إِن تَمْسَسْكُمْ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ وَإِن تُصِبْكُمْ سَيِّئَةٌ يَفْرَحُواْ بِهَا﴾ آل عمران ١٢٠. واته: ئەگەر شتێکی چاکتان پێ‌گەیشت لە داخا نێو چاوانیان ڕەش هەڵدەگەڕێ، بەڵام ئەگەر دووچاری شتێکی ناخۆش بوون دڵیان پێ خۆش دەبێ.

٦) ﴿وَلاَيَزَالُونَ يُقَاتِلُونَكُمْ حَتَّى يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ﴾ البقرة ٢١٧. واته: بەردەوام شەڕتان لەگەڵ دەکەن، تا هەڵتان گەڕێننەوە لە ئایینەکەتان.

٧) ﴿لاَيَرْقُبُواْ فِيكُمْ إِلاًّ وَلاَ ذِمَّةً﴾ التوبة ٨. واته: هیچ تێبینییەك ناکەن لەو پەیمان و بەڵێنەی کە لەگەڵ ئێوەیاندا بەستووە.

## پ١٣٢/ دوا ڕۆژی ئەو کەسانە چییە کە دۆستایەتی (الولاء) بۆ خوانەناسان دەردەبڕن؟

و:

**یەکەم:** خوای گەورە دەفەرمووێ:

١) ﴿يَا وَيْلَتَى لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلاَنًا خَلِيلاً لَقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ الذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَاءَنِي وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِلإِنسَانِ خَذُولاً﴾ الفرقان ٢٨-٢٩. واته: ئەی قوڕ بەسەرخۆم بریا فلانە کەسم نەکردبا بە هاوڕێی خۆم، بەڕاستی منی گومڕا کرد لە یادی خوا دوای ئەوەی کە فەرمانم پێ‌کرابوو کە یادی خوا بکەم.

٢) ﴿الأَخِلاَّءُ يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلاَّ الْمُتَّقِينَ﴾ الزخرف ٦٧. واته: لە ڕۆژی دوایی هاوڕێیان هێندێك دوژمنی هێندێکیانن، تەنها پارێزکاران نەبن لە گوناه.

٣) ﴿هَذَا فَوْجٌ مُّقْتَحِمٌ مَّعَكُمْ لاَ مَرْحَبًا بِهِمْ إِنَّهُمْ صَالُوا النَّارِ، قَالُوا بَلْ أَنتُمْ لاَمَرْحَبًا بِكُمْ أَنتُمْ قَدَّمْتُمُوهُ لَنَا فَبِئْسَ الْقَرَارُ، قَالُوا رَبَّنَا مَن قَدَّمَ لَنَا هَذَا فَزِدْهُ عَذَابًا ضِعْفًا فِي النَّارِ﴾ ص ٥٩-٦١. واته: وا پۆل پۆل دەهێنرێنە ناو ئاگر.. (هەواڵی هێنانی پۆلی دووەم دەدرێتە پۆلی یەکەم، جا ئایەتەکە دەڵێ): ئەمەش دەستەیەکە لەگەڵ ئێوە دێن (بۆ ناو دۆزەخ، واته: بە زاڵ و سەرۆکەکان دەگوترێ، ئەوانیش وەڵام دەدەنەوە و دەڵێن): هەی بەخێر نێن، ئەوانە بەهۆی کردەوەکانیان بۆ ناو ئاگر دێن (پۆلی دووەمیش دەڵێن): بەڵکو ئێوە بە خێر نێن، ئێوە ئێمەتان تووشی ئەم سزایە کردووە کە قەرارگەیەکی ناهەموارە (ئنجا هەموو پێکەوە دەڵێن): خوایە هەرچی ئەو سزایەی بۆ ئێمە پێش خست (بووە هۆی ئەوەی ئێمە تووشی ببین) دوو چەندانە سزایەکی بۆ زاد بکە لەم ئاگرە.

**دووەم:** پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ:

١) ﴿أَلْمـرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ﴾ رواه مسلم. واتە: ئادەمیزاد لە دونیا لـە گـەڵ کـێ دابـێ و کـێ ی خۆش بووێ لە دوا ڕۆژا لەگەڵ ئەو حەشر دەکرێ.

٢) ﴿الرَّجُلُ عَلَى دِيـنِ خَلِيلِهِ﴾ رواه أبو داود. واتە:پیاو لەسەر ئایینی هاوڕێکەیەتی.

## پ١٣٣/ دوا ڕۆژی ئەو کەسانە چی‌یە کە دۆستایەتی‌یان بۆ خـوا دەربڕیوە؟

و: خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿أَلاَ إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللهِ لاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَهُمْ يَحْزَنُونَ، أَلَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ﴾ يونس٦٢-٦٣. واتە: بەڕاستی دۆستەکانی خوا ئەوانەن کە نەترسیان لەسـەرە و نە خەمباریشن، ئەوانیش ئەو کەسانەن کە بڕوایان هێناوە و بـە تـەنها لـە خـوا دەترسـن و پارێزکـار دەبن.

هـەروەها پێغەمبـەری خـواش ﷺ دەفـەرمووێ: ﴿إِنَّ مِـنْ عِبَـادِ اللهِ لأُنَاسـاً مَـاهُمْ بِأَنْبِيَاء وَلاشُهَدَاء، وَيَغْبِطُهُمُ الأَنْبِياءُ والشُّـهَدَاءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، قَالُوا: يا رَسُولَ اللهِ تُخبِرُنا مَنْ هُمْ؟ قَالَ: هُمْ قَومٌ تَحابُّوا بِروحِ اللهِ...﴾ رواه الترمذي. واتە: بەندەکانی خـوا چـەند کەسـێکن کـە نەپێغەمبەران و نە شەهیدانن، بەڵکو لەم ڕۆژە دا پێغەمبەران وشـەهیدان خۆزگـەیان پـێ دەخـوازن، ئەوانیش گوتیان: ئەوانـە کێـن ئـەی پێغەمبـەری خـوا؟ ئـەویش فـەرمووی: ئەوانـە کەسـانێکن کـە لەبەرخاتری خوا یەکتریان خۆش دەوێ.

هەروەها دەفەرمووێ خوای پەروەردگار لە ڕۆژی دوایی دەفەرمووێ: ﴿أَلْمُتَحَابُّونَ فِي جَلالِـي لَهُم مَنَابِرُ مِنْ نُورٍ يَغْبِطُهُمُ النَّبِيُّونَ وَالشُّهَدَاء) رواه الترمذي. واتە: ئەوانەی لە پێنـاو مـن یـەکتریان خۆش دەوێ بۆیان هەیە لـە چـەند مـافوورێکی دروەشـاوە و پڕشـنگدار کـە پێغەمبـەران و شـەهیدان دەورەیان لێ‌ئەدەن.

## پ١٣٤/ شێوازەکانی ڕازی بوون بە کوفر چین؟

و:

١) **بەکافر لە قەڵەم نەدانی کافرەکان:** چ بێ‌باوەڕ (**ملحد**) و چ پاشگەز بوو (**مرتـد**) و چ هاو بەش پەیداکەر (**مشـرك**) بێـت. یـان گومـانی لـە کوفـری کـافرێك هـەبێت ئەمـەش دەقێکی شەرعی‌یە کە دەڵێ: (مَنْ شَكَّ فِي كُفْرِ كَافِرٍ فَهُوَ كَافِرٌ). واتـە: (هـەر کەسـێکی گومانی لە کوفری کافرێك هەبێ کافرە) یان ئەگەر ئەکێك بە بەڵگە دیار بوو کە کـافرە، ئەوا دروست نی‌یە تۆ بە کافری نەزانیت.

٢) **دۆستایەتی کردنی کافران و ڕازی بوون بە ڕێبازەکانیان:** (هەرکەسێك کافران بکـات بە دۆست و هاوڕێی خۆی و ڕێبازەکانی پێ بەکەڵك بێ، ئـەوا بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کە بە کوفر ڕازی‌یە.

## پ١٣٥/ شێوازەکانی ڕازی نەبوون بەئیسلام چین؟

و: شێوازەکانی بریتین لە:

١) **گاڵتەکردن بە شتێکی زانراو لە ئیسلام:** وەك گاڵتەکردن بــە خـوا و بــە پێغەمبەر و بە کتێبە پیرۆزەکـان و بـە بـڕواداران... یـان بـە چـەند دروشمێکـی ئیسـلامی، وەك ڕیشـی مسوڵمانان یان سواکێك یان فۆتەی ئافرەتێك...هتد. هەروەك خوای گەورە دەفـەرمووێ: ﴿وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ، لاَتَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ﴾ التوبة ٦٥-٦٦. واتـە: ئەگەر پرسـیاریان لێبکەیت، دەڵێن ئێمە گەمە و گاڵتە دەکـەین، تـۆش پێیـان بڵـێ: چـۆن ئێـوە گاڵتـە بـە خوا و ئایەتەکانیو پێغەمبەرەکەی دەکەن، هیچ بیانوویەك مەهێننەوە، چونکە (تازە) کافر بوونەوە لە دوای ئەوەی باوەڕتان هێنا بوو.

٢) **ڕق هەڵسان و تووڕە بوون لە کـاتێ کـە بـاسی ئیسلام و خـوا پەرستی دەکـرێ یـان کەباسی پێغەمبەر ﷺ دەکـرێ:** هـەروەك خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلاَّ الْكَافِرُونَ﴾ العنکبوت ٤٧. واتە: هیچ کەسـێك دڵـی ڕەق نـابێ بـە ئایەتـەکانی خوا تەنها کافرەکان نەبێ. یان دەفەرمووێ: ﴿وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ تَعْرِفُ فِي وُجُوهِ الَّذِينَ كَفَرُوا الْمُنكَرَ﴾ الحج ٧٢. واتە: کاتێك کەئایەتە ڕوونەکانی خوایـان بـۆ دەخوێنیتەوە، یەکسەر نێوچاوانی کافرەکان لە تاوانباریان بە دیار دەکەوێ.

## پ١٣٦/ دوژمن و ناحەزان بە شێوەیەکی سەرەکی کێن؟

و: بە شێوەیەکی سەرەکی دوژمن وناحەزانی خوا و ڕێباز و کۆمەڵەکەی دوو پێڕن:

**یەکەم: بێ بڕوایان (الکافرون):** کە بە خراپترین گیان دار و جانـەوەر لـە قەڵـەم دەدرێـن، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ شَرَّ الدَّوَابِّ عِندَ اللهِ الَّذِينَ كَفَرُوا فَهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ﴾ الانفال ٥٥. واتە: خراپترین گیانەوەر لە لای خوا ئەوانەن کە بێباوەڕن و بڕوا بە خوا ناهێنن..

**ئینجا کافرانیش لە نێو خۆیاندا چەند جۆرێکن:**

أ) **خاوەن کتێبەکان** (اهل الکتاب): کە جوولەکە (یهود) و دیان (نصرانـي)ن کـە خـوای دادگەر لە بارەیانەوە فەرموویەتی: ﴿وَقَالَتِ الْيَهُودُ عُزَيْرٌ ابْنُ اللهِ وَقَالَتِ النَّصَارَى الْمَسِيحُ ابْنُ اللهِ ذَلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَاهِهِمْ يُضَاهِئُونَ قَوْلَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِن قَبْلُ قَاتَلَهُمُ اللهُ أَنَّى يُؤْفَكُونَ﴾ التوبة ٣٠. واتە: هێندێ لە جوولەکەکان دەیانگوت (عوزەیر) کوڕی خوایە و دیانەکانیش دەیانگوت مەسیح (عیسی) کوڕی خوایە، ئەمە قسـەیەکە لـە نێو خۆیاندا باوە، ئەم گوتەیەش هەمان گوتەی گاور و جولەکـەکانی پێشـووە، خـوا بیـان کوژێ چۆن دوور دەخرێنەوە لەڕێگەی ڕاست.

ب) **هاو بەش پەیدا کەران** (المشرکون): وەك دەفـەرمووێ: إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا أُولَئِكَ هُمْ شَرُّ الْبَرِيَّةِ﴾البینة ٦

واتە: ئەوانەی کە بێ بڕوان لە خاوەن کتێب و بت پەرستەکان لە ئاگری دۆزەخدا تیا ئەمێننەوە بەئێجگاری ئەمانە خراپ ترینی هەموو دروست کراوێکن.

ج) **ئاگرپەرست و ئەستێرە پەرستەکان (المجوس والسائبون)**: هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ هَادُوا وَالصَّابِئِينَ وَالنَّصَارَىٰ وَالْمَجُوسَ وَالَّذِينَ أَشْرَكُوا إِنَّ اللَّهَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ الحج ١٧. واتە: ئەوانەی کە بڕوادارن و ئەوانە کە جوولەکە و ئەستێرە پەرست و گاورو و ئاگر پەرستن ئەوانەیش کە هاوبەشیان بۆ خوا داناوە، لە ڕۆژی دوایی خوای گەورە حوکمیان لە نێوان دا دەکا وجیاوازیان لەنێوان دا دەکات بەسەرخستنی ئەوانەی لە سەر هەقن و ڕێگای ڕاستیان گرتووە بەسەر ئەوانەی کە ڕێگای چەوتیان داوەتە بەر.

د) **خوا نەناسەکان (الملاحدة، الزنادقة)**: ئەمانەش ئەوانەن، کە هەر ئەسڵەن بڕوایان بەهیچ شتێك نی‌یە و خواش ناناسن و بێ دینن کە فیرعەون و نەمروود لەم جۆرە بوو ون، هەروەك خوای گەورە لە بارەیانی فەرمووە: ﴿أَفَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُ هَوَاهُ وَأَضَلَّهُ اللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِ وَقَلْبِهِ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِ غِشَاوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِن بَعْدِ اللَّهِ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ وَقَالُوا مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ﴾ الجاثیة ٢٣-٢٤. واتە: ئایا ئەی محمد بینیت حاڵی ئەوکەسانەی کە وازی هێنا لە پەرستنی خوا و ئارەزووی خۆی کردۆتە خوا و لە ئەنجامدا خوای گەورە گومڕای کرد لەسەر زانستی ئەو کەسە (واتە: ئەو ئینسانەی کە لە ئیسلام شارەزا بوو بەڵام دوای ئیسلام نەکەوتبوو ئارەزووی خۆی کردبووە خوای خۆی) وە خوای گەورە مۆری خۆی نا بە گوێ و دڵیەوە و پەردەی خستە سەر چاوی‌یەوە تا هیچ ئامۆژگاریەك کاری تێ‌نەکات، ئایا کێ هەیە کە ڕێنمایی بکات دوای ئەوەی کە خوا گومڕای کرد، ئایا (پەند)تان وەرگرت؟ وە ئەمانە دەیانگوت: هیچ ژیانێك نی‌یە غەیری ژیانی دونیا، هێندێکمان دەمرین و هێندێکمان دەژین. بەتەنها ڕۆژگار ئێمە بەهیلاك ئەدات (ئەگەر نا هیچ دەستێکی خوای تیا نی‌یە) بەڕاستی ئەمانە هیچ زانیاری‌یەکیان دەربارەی (مردن و ژیان نی‌یە) بەڵکو (ئەوەی کە دەیڵێن) گشتی خەیاڵ و گومانە.

هـ) **هەڵگەڕاوەکان (المرتدون)**: ئەمانەش کەسانێکن کەسەردەمێك موسڵمان بوون، یان خۆیان وا پیشان داوە کە موسوڵمانن بەڵام دوایی پاش گەمز بوونەوە و بە هۆی گوتە و دەربڕینێك یان کردەوە و ڕەفتارێکی کافرانەوە لە ئایین دەرچوون. هەروەك خوای گەورە لە بارەیانی فەرمووە: ﴿إِنَّ الَّذِينَ ارْتَدُّوا عَلَىٰ أَدْبَارِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْهُدَى الشَّيْطَانُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَىٰ لَهُمْ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لِلَّذِينَ كَرِهُوا مَا نَزَّلَ اللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ الْأَمْرِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ﴾ محمد ٢٥،٢٦ واتە: ئەو کەسانەی کە پاشەو پاش بەرەو بێ‌بڕوایی دەگەڕێنەوە دوای ئەوەی کە ڕێگای ڕاستیان بۆ ڕوون بۆوە، ئەوانە شەیتان سەری لێ‌شێواندوون و کارە خراپەکانی بۆ ئاسان کردووە، بەم جۆرە لەبەر

ئەوەی دەیانگوت بەو کەسانەی ڕقیان لە قورئانی پیرۆزە ئێمە لە هەندێك کاردا بە گوێتان دەکەین، بەڕاستی خوا شارەزایە بە نهێنییەکانیان.

**دووەم: دووڕووەکان (المنافقون):** مونافیقەکان پیسترین جۆری دوژمن و ناحەزانی خوان، هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ وَلَنْ تَجِدَ لَهُمْ نَصِيراً﴾ النساء ١٤٥ ـ واتە: بێگومان مونافیقەکان لە پلەی بنەوەی ئاگری دۆزەخن و هیچ یارمەتی دەریشیان بۆ شك نایەی.

**کەواتە: دەتوانین بڵێین دوژمن و ناحەزانی ئیسلام و مسوڵمانان بەگشتی ئەمانەن:**

**ا) مونافیقەکان.**

**ب) جوولەکەکان.**

**ج) دیانەکان.**

**د) هاوبەش پەیداکەرەکان.**

**ه) زەندیق و بێ دین و خوانەناس و مادده پەرستەکان.**

**و) مەجووسییەکان.**

**ز) سائبەکان.**

ح) **هەڵگەڕاوەکان:** کە لە وولاتی ئێمە و سەرتاسەری جیهانی ئیسلامیش هەر کام لە کۆمۆنیستەکان و مارکسیەکان و ناسۆناڵیستەکان و دیموکراسییەکان، کە بە زاراوەی ئەمڕۆ سەرجەمَ (لائیك) و (سیکۆلاریست) یان (عەلمانی)یان پێدەگوترێ، کەم و زۆر دەچنە خانەی هەڵگەڕاوەکان (**المرتدون**) چونکە خاڵی هاوبەش (**القاسم المشترك**)ی هەموو ئەو ڕێرو تاقمانە بریتییە لە ڕازی نەبوونیان بەوە کە ئیسلام بەرنامەی هەمە لایەنی ژیانی تاك و کۆمەڵ بێ، بەڵام بە مەرجێك ناکەونە بەر حوکمی هەڵگەڕاوەکان ئەگەر بە نەفامی یان بێ ئاگاییان بە ناچاری و ترس ئەم لایەنانەیان گرتبێ. وە هەڵوێستیشمان بەرامبەریان بە تەنها لە جوغزی وەڵامی پرسیاری (١٤٣) دەبێ. لە ڕووی هەڵس و کەوت و دۆستایەتی کردنیانەوەش حوکمەکەی بە پێی پرسیاری ١٢٨ خاڵی یەکەم دەبێ.

## پ١٢٧/ کۆمەڵی خوا (حزب الله) و کۆمەڵی شەیتان (حزب الشیطان) کێن؟

و: سەرەتا ووشەی (حیزب) بە کۆمەڵە کەسێك دەگوترێ کە دڵ و کردەوەکانیان وێك بچن.

خوای پەروەردگار لە قورئان دا ووشەی (**حزب الله**)ی سێ جاران هێناوە، جارێکیان لە سورەتی (**المائدة**) و دوو جاریش لە سورەتی (**المجادلة**). بەم شێوەی خوارەوە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَنْ يَرْتَدَّ مِنْكُمْ عَنْ دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَائِمٍ ذَلِكَ فَضْلُ اللهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ وَاللهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا الَّذِينَ يُقِيمُونَ

الصَّلاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ رَاكِعُونَ وَمَنْ يَتَوَلَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا فَإِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الغَالِبُونَ﴾ المائدة ٥٤-٥٦. واته: ئەی بڕوادارینە هەرکامێکتان لە ئایینەکەی هەڵگەڕێتەوە، ئەوە خوا کۆمەڵێك دەرەخسێنێ (بۆ بوژاندنەوە و بەڕێوەبردنی بەرنامەکەی) کە خۆشی دەوێن و خۆشیان دەوێ، لە ڕاست بڕواداران نەرم و گەردن کەچن، لەسەر کافران ڕەق و بەدەمارن، لە ڕێی خوادا تێدەکۆشن و لەسەر کۆنەی هیچ سەرکۆنەکەرێك باکیان نی یە، ئەوە بەخششی خوایە دەیدات بە هەرکەسێك کە بیەوێ، وە خوا فراوانە (لە دەستەڵات و بەزەیی و هەموو سفەتێکی پەسندا) و زانایە، بێگومان پشتیوانتان بەس خوا و پێغەمبەرەکەی و ئەوانەن کە بڕوایان هێناوە، ئەوانەش نوێژێ بەرپا دەکەن و زەکاتێ دەدەن و زۆر کڕنووش دەبەن. وە هەر کەسێك دۆستایەتی خوا و پێغەمبەرەکەی و ئەوانە بکات کە بڕوایان هێناوە ئەوا کۆمەڵی خودا (حزب الله) یە و بێگومان بەس کۆمەڵی خوداش زاڵ و سەر کەوتوون.

هەروەها دەفەرمووێ: ﴿لاتَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُوْلَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الإِيمَانَ وَأَيَّدَهُمْ بِرُوحٍ مِنْهُ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ أُوْلَئِكَ حِزْبُ اللَّهِ أَلا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ المجادلة ٢٢. واتە: هیچ کۆمەڵێك دەست ناکەوێ کە بەڕاستی بڕوایان بە خودا و ڕۆژی دوایی هێنا بێ و دۆستایەتی کەسانێك بکەن کە دوژمنایەتی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکەن، با ئەو کەسانە باوکیان یان ڕۆڵەیان یان برایان یان تیرە و نەتەوەیان بن، ئەوانە (خوای پەروەردگار) بڕوای لە دڵدا چەسپاندوون و بە ڕووحێك لە لایەن خۆیەوە پشگیری کردوون و دڵی بە هێز کردوون و دەیان باتە چەند باغێکەوە کە ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن تیایدا دەمێننەوە، خوا لێیان ڕازی یە و ئەوان لێی ڕازین، بەڕاستی (هەر) ئەوانەن کۆمەڵی خوا، بێگومان (هەر) کۆمەڵی خوا سەر فرازن..

**کەواتە:**

**سەرجەمی دروشم و نیشانە و خەسڵەتە سەرەکی یەکانی کۆمەڵی خوا بریتین لە:**

١) بڕوا بوون بە خوا و بە ڕۆژی دوایی.
٢) خوا خۆشی دەوێن و خوایان خۆش دەوێ.
٣) نەرم و نیانی و میهرەبانی بەرامبەر بڕواداران.
٤) ڕەقی و توند و تیژی لە ئاقار کافراندا.
٥) تێکۆشان و ڕەنج دان لە ڕێی خوادا.
٦) بێ باکی لە تانە و تەشەری سەرکۆنەکەران.
٧) پشت بەستن بە خوا و پێغەمبەر ﷺ و بڕواداران.
٨) نوێژ کردن و زەکاتدان.
٩) سەرکەوتن و سەرفرازی.
١٠) گەیشتن بە بەهەشت و ڕەزامەندی خوا.

بەڵام کۆمەڵی شەیتان، ئەو کەسانەن کەوا: خوا و پێغەمبەری خوا بە درۆ دەزانن و دوژمنایەتی ئایین و بەرنامەی خوا دەکەن و دۆستایەتی دوژمنانی خوا دەکەن و حوکم بە بەرنامەی مرۆڤ کرد دەکەن و شوێنی کەوتەی هەوا و ئارەزوو و نەفسن. هەرچی کوفر و دوو ڕوویی هەیە لە دڵەکانیان کەڵەکەی کردووە، لەگەڵ ئەوەش خۆیان بە چاك نیشان دەدەن، بەڵام ڕاست ناکەن و بەڵکو درۆ دەکەن... هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ تَوَلَّوْا قَوْمًا غَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مَا هُمْ مِنْكُمْ وَلَا مِنْهُمْ وَيَحْلِفُونَ عَلَى الْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ، أَعَدَّ اللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا إِنَّهُمْ سَاءَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ، اتَّخَذُوا أَيْمَانَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ فَلَهُمْ عَذَابٌ مُهِينٌ، لَنْ تُغْنِيَ عَنْهُمْ أَمْوَالُهُمْ وَلَا أَوْلَادُهُمْ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ، يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَى شَيْءٍ أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْكَاذِبُونَ، اسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ الشَّيْطَانُ فَأَنْسَاهُمْ ذِكْرَ اللَّهِ أُولَئِكَ حِزْبُ الشَّيْطَانِ، أَلَا إِنَّ حِزْبَ الشَّيْطَانِ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾ المجادلة ١٤-١٥. واتە: ئایا بۆ سەرنجێك نادەیت بەلای ئەوانەی کە دۆستایەتی ئەکەن لەگەڵ گەلێك کە خوای گەورە خەشمی لێگرتوون؟ ئەوانە نە لە ئێومن نە لەوانن، وە سوێند ئەخۆن بە درۆ لە کاتێکا کە خۆیان ئەزانن (درۆ ئەکەن) خوا سزای سەختی بۆ ئامادە کردووین، بەڕاستی ئەوەی ئەوان دەیانکرد کارێکی خراپ بوو سوێندەکانیان کرد بە قەڵغان و جڵەوگیری خەڵکیان کرد لە ڕێی خودا، ئینجا بۆ ئەوان هەیە سزای ڕیسواکەر، ماڵ و منداڵیان بەهیچ جۆرێك بە کەڵکیان نایەن لە سزای خوا، ئەوانە یار و هاودەمی ئاگرن، تیایا ئەمێننەوە بە ئێجگاری، لە ڕۆژێکا کە خوا هەموویان زیندوو ئەکاتەوە و سوێندی بۆ ئەخۆن هەروەك سوێند ئەخۆن بۆ ئێوە (لە جیهانا) وە وادەزانن کە شتێکیان دەست خستووە، با بزانن کە بەڕاستی هەر ئەوانن درۆزنی ڕاستەقینە، شەیتان زاڵ بووە بەسەریانا بە جۆرێك کە یادی خوای لەبیر بردوونەتەوە بێ گومان ئەوانە کۆمەڵی شەیتانن، بابزانن کە بەڕاستی هەر کۆمەڵی شەیتان زیان بارە.

## پ١٣٨/ سروشتی دوژمنایەتی کۆمەڵی شەیتان لەگەڵ کۆمەڵی خوا چۆنە؟ یان بە پێچەوانەوە؟

و: کۆمەڵی شەیتان زۆر شێواز بەکار دەهێنن بۆ دەربڕینی دوژمنایەتی لەگەڵ کۆمەڵی خوا، بۆ نموونە: خوای گەورە دەفەرمووێ:

١) ﴿زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا وَيَسْخَرُونَ مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ اتَّقَوْا فَوْقَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ...﴾ البقرة ٢١٢. واتە: ژیانی دونیا ڕازێندراوەتەوە بۆ بێبڕوایان، کە گاڵتە دەکەن بە بڕواداران (بەڵام پایەی) پارێزگاران لە گوناه گەلێ بەرزترە لە ڕۆژی دوایی دا...

٢) ﴿قَالَ الْمَلَأُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ قَوْمِهِ إِنَّا لَنَرَاكَ فِي سَفَاهَةٍ وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ الْكَاذِبِينَ﴾ الاعراف ٦٦. واتە: کۆمەڵێك لە دەسەڵاتدارانی گەلی **(عاد)** بە **(هود)**یان گوت: بەڕاستی زۆر بەبێ ئەقڵت تێدەگەین، گومان دەبەین کە تۆ ڕاست ناکەیت و درۆ بکەیت.

٣) ﴿إِنَّ الَّذِينَ أَجْرَمُوا كَانُوا مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا يَضْحَكُونَ، وَإِذَا مَرُّوا بِهِمْ يَتَغَامَزُونَ، وَإِذَا انْقَلَبُوا إِلَى أَهْلِهِمُ انْقَلَبُوا فَكِهِينَ وَإِذَا رَأَوْهُمْ قَالُوا إِنَّ هَؤُلاءِ لَضَالُّونَ﴾ المطففين ٢٩-٣٢. واتە: بێگومان ئەوانەی بەدکار بوون پێ‌دەکەنن بەوانەی کە بڕوایان هێنابوو، وەکاتێك کە بەلایاندا ڕۆیشتبان چاویان لێ‌داشەگرتن، وەکاتێکیش کە ئەم بەدکارانە بگەڕابانەوە بۆ لای کەس و کاریان بەشادمانی دەگەڕانەوە، کاتێکیش کە چاویان پێ‌بکەوتبان دەیانگوت: ئەمانە گومڕان...

## پ١٣٩/ ئەو هۆیانە چین کەوای لە کۆمەڵی شەیتان کردووە تا وەکو دوژمنایەتی کۆمەڵی خوا بکەن؟

و: چوار خاڵ هەن کە وای لە کۆمەڵی شەیتان کردووە کە دوژمنایەتی کۆمەڵی خوا بکەن، ئەوانیش بریتین لە:

١) **خۆ بەگەورە زانین** (الكِبْر): کۆمەڵی شەیتان خۆیان بە گەورەتر دەزانن لە ئەهلی حەق، هەتا خۆیان لە پێغەمبەریش ﷺ بە زلتر دەزانن.. هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِ آيَاتُنَا وَلَّى مُسْتَكْبِراً كَأَنْ لَمْ يَسْمَعْهَا كَأَنَّ فِي أُذُنَيْهِ وَقْراً فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ لقمان ٧. واتە: کاتێ ئایەتەکانی خوای بەسەردا دەخوێنرێ، یەکسەر زۆر بە فیز و گەورەییەوە پشتی خۆی تێ دەکا، وەکو ئەوەی کە هەر گوێی لێ نییە، قورسایی لە گوێ‌کانی پەستراوە، کەواتە تۆش مژدەی پێ‌بدە بەسزایەکی ناخۆش (لە تۆڵەی ئەوە).

٢) **خۆش ویستنی دونیا بەسەر ناخیرەت**: هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ذَلِكَ بِأَنَّهُمُ اسْتَحَبُّوا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا عَلَى الآخِرَةِ وَأَنَّ اللهَ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ﴾ النحل ١٠٧. واتە: بەم شێوە ئەوان ژیانی دونیایان خۆشتر دەوێ لە ژیانی ئاخیرەت خوای گەورەش بە هیچ جۆرێك ڕێنمایی بێ‌بڕوایان ناکات.

٣) **ئێرەیی** (الحَسَد): کۆمەڵی شەیتان چەندی بنێ‌ی حەسوودن و ڕقیان لە کۆمەڵی خوایە، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُمْ مِنْ بَعْدِ إِيمَانِكُمْ كُفَّاراً حَسَداً مِنْ عِنْدِ أَنْفُسِهِمْ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْحَقُّ...﴾ البقرة ١٠٩. واتە: زۆر لە خاوەن کتێبەکان حەز دەکەن کە بتانگەڕێننەوە سەر بێ‌بڕوایی دوای بڕوا هێنانتان، لەبەر حەسەدێك کە لە سروشتیانەوەیە (ئەمەش) دوای ئەوەی کە ڕاستییەکەیان بۆ دەرکەوت.

٤) **بالا دەستی و خاوەن هێز و توانا**: ئەمەشیان تایبەتە بە تاغوت و خوێنمژان کە لە ڕێگەی توانا و دەسەڵاتەکانیان زوڵم لە کۆمەڵی خوا دەکەن، بە تایبەت ئەو مسوڵمانانەی کە جێگای مەترسین بۆ وان، هەروەك کاتی خۆی هاوەڵانی چاڵەکە (**اصحاب الاخدود**)یان خستە نیو چاڵێکی ئاگر بەس چونکە بڕوایان بە خوای تاك وتەنیا هێنا بوو.

هەروەك خوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿وَمَا نَقَمُوا مِنْهُمْ إِلاَّ أَنْ يُؤْمِنُوا بِاللهِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ﴾ البروج ٨. واتە: تۆڵەیان لێنەسەندن تەنها لەبەر ئەوەنەبێ کە بڕوایان هێنابوو بـە خوای دەسـەلاتدارو سوپاسکراو.

بەلام دوژمنایەتی کۆمەڵی خوا لەگەل کۆمەلی شەیتان بەشێکە لە بیروباوەڕی ئیسلامی، یـان لە ووشەی یەك خوا ناسی کە بریتی‌یە لە ﴿لا إلـه إلا الله﴾هـەروەك خـوای گـەورە باسـی ئیبراهم الطَّيِّكُلاَّ دەکات و دەفەرمووێ: ﴿إِنَّا بُرَءآءُ مِنْكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّى تُؤْمِنُوا بِاللهِ وَحْدَهُ﴾ الممتحنة ٤. واتە: ئێمە بـەرین لە ئێوە و لەو شـتانەی کـە ئێـوە لـە غـەیری خـوا دەیپەرسـتن، بەڕاسـتی ئێمـە لێتـان ڕازی نـین و تـازە دوژمنایەتی لە نێوان ئێمە و ئێوەدا سەری هەلدا (کۆتایشی نایە) تاوەکو بڕوا بە خـوای تـاك و تـەنیا نەهێنن.

## پ١٤٠/ ئایا دەربڕینی دوژمنایەتی لە قۆناغی مەککەدا چۆن بوو؟

و: قۆناغی مەککـە واتـە قۆناغی خـۆ پـەروەردەکردن و خـۆ ڕاهێنـان لـە ئـازار، ئـەم قۆناغـە قۆناغێك بـوو کـە مـسـوڵمانان تیایدا لاواز و کـەم ئـەژمارو ژێـر دەسـتە و لاواز بـوون، بـە جۆرێـك نەدەوێران کە بـە ئـازادی و سەربەسـتی خـوای خۆیـان بپەرسـتن... لـەوە دەترسـان کـە دوژمـن لـە پەنارا بیان ڕفێنێ و شوون بزریان بکەن.. بەلام هاوشـان لەگـەل ئـەم حالەتـە نالەبارە هەڵوێـستێکی بوێرو ئازایانەیان هەبوو لە ئاقار دوژمنان.. هەروەك خوای گەورە لە مەککە پێی فـەرموون: ﴿قُلْ يَاأَيُّهَا الْكَافِرُونَ لا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ وَلا أَنْتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ وَلا أَنَا عَابِدٌ مَا عَبَدْتُمْ وَلا أَنْتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ﴾ الكافرون. واتە: ئـەی (محمد) بلـێ بـەبێ بڕواکـان: ئەوەی کە ئێوە دەیپەرستن من نایپەرستم، وە ئێوەش ئەو خوایەی ناپەرستن کـەمن دەیپەرسـتم، ئـەو بەندایەتی‌یە ناکەم کە ئێوە دەیکەن. وە ئێـوەش ئـەو بەندایەتی‌یـە ناکـەن کـە مـن دەیکـەم، کەواتـە ئایین و بەرنامەی خۆتان بۆ خۆتان و هی خۆشم بۆ خۆم. یان دەفەرمووێ: ﴿وَإِنْ كَذَّبُوكَ فَقُلْ لِي عَمَلِي وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ أَنْتُمْ بَرِيئُونَ مِمَّا أَعْمَلُ وَأَنَا بَرِيءٌ مِمَّا تَعْمَلُونَ﴾ يونس ٤١. واتـە: ئەگـەر بێبڕواکان تۆیان بە درۆزانی تۆش پێیان بلێ: کەواتـە کـاری خـۆم بـۆ خـۆم، هـی خۆشـتان بـۆ خۆتان، ئێوە بەرین لەو کارەی کە من دەیکەم، وە منیش بەریم لەوکارەی کە ئێوە دەیکەن.

## پ١٤١/ ئایا دەربڕینی دوژمنایەتی بەرامبەر بێبڕواکان لـە قۆنـاغی مەدینەدا چۆن بوو؟

و: کۆمەلگای مەدینە بۆ دەربڕینی دوژمنایەتی دەکرێت بە سێ بەش:

**یەکەم: هاوتا دانەرەکان (المشركون):**

شێوازەکانی دوژمنایەتی دەربڕین بۆ هاوتاپەرستەکان بەم شێوەی خوارەوە بوو:

**١) دوای ئەوەی کە حکومەتی ئیسلامی لە مەدینە دروست بوو:**

لەم حاڵەتەدا خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿بَرَاءَةٌ مِنَ اللهِ وَرَسُولِهِ إِلَى الَّذِينَ عَاهَدْتُمْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ التوبة١. واتە: خوا و پێغەمبەریش لەو هاوتاپەرستانەی کە پەیمانیان لەگەڵ ئێوە بەستووە (شکاندوویانە) بەرییە و لێیان دوورە. یان دەفەرمووێ: ﴿وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَافَّةً﴾ التوبة ٣٦. واتە: شەڕی هاوتاپەرستەکان بکەن بە هەموو هێزتان، هەروەك ئەوان شەڕی ئێوە دەکەن بە هەموو هێزیان.

٢) ڕێ پێنەدانیان بۆ سەردانی کردنی کەعبەی پیرۆز:

هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلَا يَقْرَبُوا الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَذَا...﴾ التوبة٢٨. واتە: ئەی بڕوادارینە هاوتاپەرستەکان پیس و چڵکنن و نابێ نزیکی کەعبەی پیرۆز بکەونەوە لە دوای ئەم ساڵەوە. (واتە ساڵی ٩ی کۆچی).

٣) ڕێنەدان بەژن و ژن خواستن لەگەڵ ئەم هاوتا پەرستانە:

هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ اللهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ لَا هُنَّ حِلٌّ لَهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ...﴾ الممتحنة ١٠. واتە: ئەی بڕوادارینە ئەگەر ئافرەتانی مسوڵمان کۆچیان کردوو هاتنە لاتان ئێوە تاقییان بکەنەوە، خوا ئاگادارە بە ئیمانەکەیان، ئەگەر زانیتان بەڕاستی بڕوایان هێناوە مەیانگەڕێننەوە لای بێبڕواکان، چونکە نە ئافرەتانی بڕوادار بۆ بێبڕواکان حەڵاڵن نە ئەوانیش بۆ وان حەڵاڵن.

٤) ڕێنەدانی مسوڵمانان بەمانەوەیان لە نێو هاوتا پەرستەکان:

هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿أَنَا بَرِيءٌ مِنْ مُسْلِمٍ يُقِيمُ بَيْنَ أَظْهُرِ الْمُشْرِكِينَ﴾ رواه ابوداود. واتە: من بەریم لەو مسوڵمانەی کەوا لە نێو هاوتاپەرستان بمێنێتەوە.

## دووەم: خاوەن کتێبە ئاسمانییەکان (أهل الكتاب):

هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللهِ وَاللهُ شَهِيدٌ عَلَى مَا تَعْمَلُونَ﴾ آل عمران ٩٨. واتە: بڵێ ئەی خاوەن کتێبەکان ئەوە بۆچی بڕوا بە ئایەتەکانی خوا ناکەن؟ خوا شایەدە بەو کردەوانەی کە دەیکەن.

## سێیەم: دوو ڕووەکان (المنافقون):

خوای پەروەردگار دەربارەی دووڕووەکان دەفەرمووێ: ﴿هُمُ الْعَدُوُّ فَاحْذَرْهُمْ﴾ المنافقون ٤. واتە: دووڕووەکان دوژمنی ڕاستەقینەن ئاگاداریان بن. بۆیە مسوڵمانان زۆر دوژمنایەتی خۆیان بۆ دەردەبڕن.. ئەویش بە چەند شێوازێك بوو کە بریتی بوون لە:

١) جیهاد کردن و غەرەزکێشان و دەبەریەك ڕاچوون لەگەڵیان: هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ جَاهِدِ الْكُفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ وَاغْلُظْ عَلَيْهِمْ...﴾ التوبة

٧٣. واته: ئـەی پێغەمبـەری خـوا جیهـاد بکـە لەگـەڵ بێبـڕوا و دووڕووەکـان و توونـد بـە لەسەریان.

٢) **نابێ لەکاتی مردنیـان نوێژیـان لەسەر بکـرێ و سـەردانی گۆڕیـان بکـرێ:** هـەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَلاَ تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِنْهُمْ مَاتَ أَبَـدًا وَلاَ تَقُمْ عَلَى قَـبْرِهِ، إِنَّهُمْ كَفَرُوا بِاللهِ وَرَسُولِهِ وَمَاتُوا وَهُمْ فَاسِـقُونَ﴾ التوبة ٨٤. واتـە: بـە هیـچ جۆرێـك نوێژیان لەسەر مەکەن کە مردن، وە لەسەر گۆڕیشیان مەوەستە، چونکە ئەوان نـە بڕوایـان بە خوا و نە بە پێغەمبەر نەبووە و بەبێ دینی مردوون.

٣) **هیچ عوزریان لێوەرناگیرێ لەکاتێ کە لە جیهـاد بـەپاش کـەوتن:** هـەروەك خـوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿فَإِنْ رَجَعَكَ اللهُ إِلَى طَائِفَةٍ مِنْهُمْ فَاسْتَئْذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ فَقُلْ لَنْ تَخْرُجُوا مَعِيَ أَبَـدًا وَلَنْ تُقَاتِلُوا مَعِيَ عَدُوًّا إِنَّكُمْ رَضِيتُمْ بِالْقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَاقْعُدُوا مَعَ الْخَالِفِينَ﴾ التوبة ٨٣. واتـە: کـە گەڕایتـەوە لای کۆمـەڵێك لـە دووڕووەکـان، دیـن و ئیزنت لێوەردەگرن کە لەگەڵ ئێوە بەشداری جیهاد بکەن، تۆش پێیان بڵێ: جارێکی تر لەگەڵ من دەرمەچوون و بەشداری شەڕمان لەگەڵدا مەکەن. چونکە ئێـوە لـە پێشـدا ڕازی بوون بەوەی کە دابنیشن و جیهاد نەکەن، کەواتە ئێستاش دابنیشن و لەگەڵ ئەوانەی کـە لە جیهاد بە پاش کەوتوون.

٤) **نابێ داوای لێخۆش بوونیان بۆ بکەیت:** هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿اِسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لاَ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِنْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَنْ يَغْفِرَ اللهُ لَهُمْ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا بِاللهِ وَرَسُولِهِ وَاللهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾ التوبة ٨٠. واتـە: ئەگـەر داوای لێخۆش بوونیان بۆ بکەیت یان نەکەیت، ئەگەر هـەفتا جـار داوای لێخـۆش بوونیـان بـۆ بکەیت ئەوا خوای گەورە بە هیچ جۆرێك لێیان خۆش نابێت چونکە ئەوانە بێبڕوا بوون بەرامبەر بە خوا و بە پێغەمبەر، خوای گەورەش ڕێنمایی کۆمەڵی بێدینان ناکات.

# کۆچ کردن (الهجرة)

## پ١٤٢/ کۆچ کردن چی‌یه؟

و: کۆچ کردن پەیوەندی‌یەکی پتەوی هەیە بەمەسەلەی (**الولاء والبراء**).(**ابن القیم**) دەڵێ: کۆچ کردن دووجۆرە، کە بریتی‌یە لە (کۆچ کردن بەلەش لە شوێنێك بۆ شوێنێك، کۆچ کردن بۆ خوا).

بەڵام کۆچ کردن بۆ خوا کۆچ کردنی ڕاستەقینەیە...

کۆچ کردنی دابەش بووە بۆ دوو بەش:

- مانەوە لە نێو (**دار الکفر**) و حوکمەکەی.
- کۆچ کردن لە نێو (**دار الکفر**) بۆ (**دار الاسلام**).

### مانەوە لە نێو (دار الکفر) و حوکمەکەی:

دار الکفر[1]:

بەم شوێنە دەڵێن کەوا بێ بڕوایان حوکمی تیا دەگێڕن و بەرنامەی غەیری خوای تیا پیادە دەکەن، ئەگەر چی خەڵکەکەشی مسوڵمان بن.

دار الإسلام:

بەم شوێنە دەڵێن کەوا بڕواداران حوکمی تیا دەگێڕن و بەرنامەی خوای تیا پیادەدەکەن، ئەگەر چی خەڵکێکی خوا نەناسیشی تیا بێ.

ئیسلام ئایینێکی بەرێز و بە پێزە، بۆیە ڕازی نابێ کەوا بێ بڕوایان زەلیلی بکەن و ئەتکی شەریعەتەکەی بکەن. کەواتە مانەوە لە نێو (**دار الکفر**) کارێکی ناشەرعی و ناپسندە لە ئیسلامدا، بۆیە هەر کاتێك شوێنێك بوو بە (**دار الکفر**) ئەوا کۆچ کردن لەم شوێنە فەرز دەبێت لەسەر مسوڵمانان... هەروەك خوای گەورە دەربارەی ئەو کەسانەی کەوا کاتی خۆی لە مەککە مابوونەوە و کۆچیان نەکرد بۆ مەدینە فەرمووی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلائِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنْتُمْ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الأَرْضِ قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا فَأُولَئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَسَاءَتْ مَصِيراً، إِلاَّ الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ لاَيَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلاَيَهْتَدُونَ سَبِيلاً﴾ النساء ٩٧-٩٩. (لە پێشدا مانای ئەم ئایەتە لێك دراوەتەوە).

---

[1] ئەمە ڕای زانایانی هاوچەرخە، بەڵام هێندێ کەس پێیان وایە کە (دارالکفر) بە شوێنێك دەڵێن کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئیسلامی تیا پەیڕەو نەکرابێ، بەڵام بەڕای بەندە ئەم بۆچوونەی سەرەوە چاکترو لە جێ ترە، واتە ڕای زانایانی (هاوچەرخ) م پێ پەسندترە.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿مَنْ جَامَعَ الْمُشْرِكَ وسَكَنَ مَعَهُ فَإِنَّهُ مِثْلُهُ﴾ رواه ابوداود. واتە: هەرکەسێك لەگەڵ موشریك كۆ ببێتەوە و بەیەكەوە نیشتەجێ بن ئەوا لەگەڵ موشریكەكان حیسێبی بۆ دەكرێ.

هەروەها (حسن بن سالح) دەڵێ: (إِذَا لَحِقَ الرَّجُلُ بِدَارِ الْحَرْبِ وَلَمْ يَرْتَدَّ عَنِ الإِسْلامِ فَهُوَ مُرْتَدٌّ بِتَرْكِهِ دَارَ الإِسْلامِ) احكام القران للجصاص. واتە: هەر كەسێك پەیوەندی بكات بە (دار الحـرب) كە (دار الكفر)یشی پێ‌دەڵێن ئەگەر لەئیسلامیش هەڵنەگەڕابێتەوە هەر (مرتد)ە بە هۆی ئەوەی كە وازی هێنایە لە (دار الاسلام). بەڵام ئەو كەسانەی كە لە (دار الحـرب) دەمێننەوە هێندێك لە زانایان دەیكەنە سێ بەش:

**یەكەم**: ماڵەتەوە لە نێو (دار الحرب) بە ئارەزو و وویستی خۆت و ڕازی بیت بەو شتانەی كە تیایەتی...

ئەوا لەو حاڵەتە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاتَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ﴾ المائدة ٥١. واتە: ئەی بڕوادارینە جولەكە و دیانەكان مەكەن بە دۆستی خۆتان كەوا هێندێكیان دۆستی هێندێكیانن، هەركەسێك لە ئێوە دۆستایەتیان لەگەڵدا بكات لەوانە.

**دووەم**: مانەوە لە ناویان لە پێناو ماڵ و منداڵ و دونیا، بەڵام ئایینی خۆی لەلایان ئاشكرا نەكردبێ و یارمەتی موسوڵمانانیش نەدات...

ئەوا لەم حاڵەتە ئەم ئینسانە كافر نابێت بەڵام پێ‌ی دەگوترێ یاخی (عاصي) ئەوەیش بەهۆی ئەوەی كە لەنێویان دەرناچێ و كۆچ بۆ شوێنێكی تر ناكات. چونكە شەریعەتی ئیسلام دەڵێ: ئەگەر لە شوێنێك ئازاد نەبوویت لەوەی كە خۆتی تیا ئاشكرا بكەیت كە موسوڵمانی، ئەوا دەبێ ئەو شوێنە جێ‌بهێڵیت و ئەگەر (دار الاسلام)ت بە چنگ نەكەوت، ئەوا بۆ شوێنێكی وا دەبێت كۆچ بكەیت.. كە ئەم شوێنە لە شوێنی پێشوو چاكتر بێ لە ڕووی ئیسلامەتی..

**سێیەم**: مانەوە لەنێو (دار الحرب) بەو مەرجەی كە:

١) توانای ئەوەت هەبێ كە هەق بە (كفر) بڵێیت و لێیان نەترسیت: هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿قُلْ يَاأَيُّهَا الْكَافِرُونَ...﴾ الكافرون. (لە پێشتر لێك دراوەتەوە)

٢) مانەوە لە حاڵەتی لاواز (مستضعف)ی: واتە مانەوەی پیاوی پەككەوتە و ئافرەت و منداڵ، ئەواتەی كە توانای كۆچ كردنیان نی‌یە... هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِلاَّ الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ لايَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلايَهْتَدُونَ سَبِيلاً﴾ النساء ٩٨. واتە: تەنها لاوازەكان نەبن لە پیاو و ئافرەت و منداڵ، كەوا ناتوانن كۆچ بكەن و ڕێگایان نی‌یە تیایا دەربچن.

## كۆچ كردن لە (دار الكفر) بۆ (دار الاسلام):

كاتێك كە حاڵەتی (دار الكفر) بوو ئەوا دوژمنانی ئیسلام لە موسوڵمانان ناگەڕێن تاوەكو بە ئازادی خوای خۆیان بپەرستن، بۆیە تەنگیان پێ‌هەڵدەچنن تا ئەو دەمەی كە لە ئایینی ئیسلام هەڵیان

دەگێڕنەوە. هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُمْ مِنْ أَرْضِنَا أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا...﴾ ابراهيم ١٣. واتە: بێبڕواکان بە پێغەمبەرەکانی خۆیان دەگوت: ئێمە لەسەر خاکی خۆمان دەرتان دەکەین، یا دەبێ بگەڕێنەوە سەر ئایینی خۆمان.

دەتوانین کۆچ کردن بکەین بە چەند بەشێك لەوانە:

١) کۆچ کردن لە (**دار الحرب**) بۆ (**دار الاسلام**)..

٢) دەرچوون لە خاکێك کە بیدعەی تیا زۆر بێ، هەروەك ئیمامی مالك (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: (**لايَحِلُّ لأحَدٍ أنْ يُقِيمَ بِبَلَدٍ سُبَّ فِيهَا سَلَفٌ**) (احكام القرآن) لابن العربي. واتە: دروست نییە بۆ کەسێك لە شارێك بمێنێتەوە کەوا تیایا جوێن بە سەلەف بدرێ.

٣) دەرچوون لە شوێنێك کە حەرامی زۆر تیا بڵاو بووبێتەوە.

٤) ڕاکردن لەبەر زەبر و زەنگی دوژمنان لە ترسی ئەوەی نەوەك دووچاری ئازارێکی زۆر ببێتەوە، هەروەك ئیبراهیم ﷺ کاتی خۆی فەرمووی: ﴿إِنِّي مُهَاجِرٌ إِلَى رَبِّي﴾ العنكبوت ٢٦. واتە: من کۆچ دەکەم بۆ لای پەروەردگارم.

٥) ڕاکردن لە ترسی نەخۆشی (**طاعون** و کۆلێرا و مەلاریا... هتد).

٦) ڕاکردن لە ترسی ماڵ و ناموس.. واتە لە شوێنێك کە لەماڵ و منداڵت دڵنیا نەبوویت کە بە پەروەردەیەکی ئیسلامی پەروەردەیان بکەیت، ئەوا دەبێ ئەم شوێنە جێبهێڵیت.. یان لەوە ترسایت کە ئەتکی شەرەف و ناموستی تیا بکرێ، بەهەمان شێوە دەبێ ئەم شوێنە چۆڵ بکەیت.

## پ١٤٣/ خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُمْ مِنْ دِيَارِكُمْ أَنْ تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ الممتحنة ٨. واتە: خوای گەورە ڕێی لێنەگرتوون کەوا چاکە بکەن و دادگەربن لەگەڵ ئەو کەسانەی کەوا شەڕتان لەگەڵ ناکەن لەسەر دین دەریشتان ناکەن لە نێو خاك و نیشتمانی خۆتان، چونکە خودا دادگەرانی خۆش دەوێ. ئایا ئەم ئایەتە چی دەگەیەنێ؟

و: ئەم ئایەتە وادەگەیەنێ کە ئەگەر دوژمنانی ئیسلام یان بێبڕواکان ئەگەر شەڕیان نەفرۆشت بە موسڵمانان و کڕو بێدەنگ هیچ زیانێکیان بۆ موسڵمانان نەبوو ئەوا لە ئیسلامدا ڕێگا ناگیرێ لەموسڵمانان کەوا هەڵوێستیان نەرم بێ لەگەڵ ئەم جۆرە بێبڕوایانە.

کەواتە لەم حاڵەتە دا هەڵوێستمان بەرامبەر بێبڕوایان لە زۆربەی کاروبارەکانی ژیان بە چاکی دەبێ بۆ نموونە:

- ١) **لە کاتی کڕین و فرۆشتن**: ئیسلام ڕێگا ناگرێ لە موسڵمانان کەکڕین و فرۆشتن لەگەڵ بێبڕواکان بکەن. هەروەك (**إبْنُ بَطَّال**) دەڵێ: کڕین و فرۆشتن لەگەڵ بێبڕواکان

دروسته، تەنها ئەو شته نەبێ كه ببێته هۆی بەهێز كردنی (بێبڕوایان) **فتح الباري**.
هەروەها كاتی خۆی (أبوبكر) ڕەزای خوای لێبێ دەچوو بۆ شام كه ئەو دەمه (دار الحرب) بوو، كاروباری بازرگانی لەگەڵ ئەنجام دەدان.

٢) **سەر لێدان له نەخۆشەكانیان**: دروسته مسوڵمانان كەوا سەربدەن له نەخۆشی ئەو بێبڕوایانەی كه باس كران، هەروەك دەگێڕنەوه كەوا گەنجێكی جووله‌كه نەخۆش بوو، پێغەمبەریش ﷺ چوو سەری لێداو پێی فەرموو مسوڵمان به، لەو دەمەی باوكی گەنجەكه لەلایان دانیشتبوو پێی گوت: بەگوێی بكه، ئەویش بەگوێی پێغەمبەری ﷺ كردوو شایەدی هێنا و بووه مسوڵمان، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ﴿**الْحَمْدُ للهِ الَّذِي أَنْقَذَهُ مِنَ النَّارِ**﴾ رواه البخاري. واته: سوپاس بۆ ئەو خوایەی كه ڕزگاری كرد له ئاگر.

٣) **سەلام لێكردنیان**: زانایان ناكۆكن لەسەر ئەم مەسەلەیه كه ئیبراهیم ﷺ، كاتی خۆی بەباوكی گوت مسوڵمان به، ئەویش داواكەی ڕەت كردەوه و (ئیبراهیم)یش پێی فەرموو ﴿**سَلَامٌ عَلَيْكَ**﴾ مریم ٤٧.
بەڵام زۆربەی زانایان دەڵێن مەبەست لەم مەسەلەیه سەلامەتی و ئەمینی بوو له چنگ ئیبراهیم، واته ئیبراهیم پێی گوت له من ئەمین به.

٤) **دەست پێش خەر نەبوون له سەلام كردن:** هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿**لاتَبْدَؤُا اليَهُودَ ولا النَصَارَى بالسَّلامِ**﴾ رواه مسلم. واته: دەست پێش خەر مەبن لەسەلام كردن لەگەڵ جووله‌كه و دیانەكان. یان دەفەرمووێ: ﴿**إذَا سَلَّمَ عَلَيْكُمْ أَهْلُ الْكِتَابِ فَقُولُوا: وعَلَيْكُمْ**﴾ البخاري. واته: ئەگەر یەك له خاوەن كتێبەكان سەلامی لێ كردن ئێوەش بڵێن: ﴿**وَعَلَيْكُمْ**﴾.

# بەشی هەشتەم

# حاكمیەتی خوا (الحاكمیة)

## پ١٤٤/ حاكمیەتی خوا مانای چی‌یە؟

و: خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ للهِ أَمَرَ أَلاَّ تَعْبُدُوا إِلاَّ إِيَّاهُ﴾ یوسف ٤٠. واتە: حوكم گێران تەنها مافی خوایە، فەرمانی كردووە كە هیچ شتێك نەپەرستیێ خۆی نەبێ. هەروەك: سید قطب (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ: (**تایبەتمەندترین تایبەتمەندی خوایەتی بریتی‌یە لە حاكمیەتی خوا**). واتە: خوا ئادەمیزادی بۆ ئەوە دروست كردووە تاوەكو تەنها خوا بپەرستێ، خواش بە چاكی ناپەرسترێ تەنها لە جوغزی حاكمیەتی خواوە نەبێ. كەواتە ئەگەر كەسێك بیەوێ بەچاكی خوا بپەرستێ با هەوڵی ئەوە بدات لە هەموو لایەكی ژیانەوە حوكم بە ئایینی خوا بكات.

**كەواتە**: هەركەسێك لەحوكم و ئادابی ئیسلامی دەربچێت و پێ‌ی ڕازی نەبێ بەبێ چەندو چۆن لە ئایینی خوا دەردەچێ و كافر دەبێت. هەروەها ئەو كەسەی حوكم بەئایینی خواناكاو بەشەریعەتی خوا هەڵنەستێ ئەوە ئیمان دار نی‌یە، وە ئەوەی بەحوكمی خوا ڕازی نەبێ ئەوە موسوڵمان نی‌یە ئەگەر چی درووشمی بەندایەتیشی بەرز كردبێتەوە...

## پ١٤٥/ خوای گەورە چ دەفەرمووێ دەربارەی حاكمیەتی خۆی؟

و: زۆر ئایەت هەن كەدەربارەی حاكمیەتی خوا دەدوێن لەوانە:

١) ﴿فَلاَ وَرَبِّكَ لاَيُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ﴾ النساء ٦٥. واتە: سوێند بەخوای تۆ (ئەی موحەممەد) بڕوای نی‌یە ئەو كەسەی كە تۆ نەكات بە دادوەر(حاكم) لە هەر كێشەیەك كە لە نێوانیان دا دروست دەبێ.

٢) ﴿أَلاَ لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ﴾ الاعراف ٥٤. واتە: مافی وەدی هێنان و حوكم كردن تەنها بۆ خواوەیە.

٣) ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ المائدة ٤٤. واتە: هەركەسێك حوكم بەقورئان نەكات كافرە.

## پ١٤٦/ زانا و پێشەوایانی ئیسلامی چی دەڵێن دەربارەی حاكمیەتی خوا؟

و: زانایان زۆر قسەیان دەربارەی حاكمیەتی خواوە كردووە لەوانە:

١) (**سيد قطب**) بەرەحمەت بێ: دەڵێ: ئەگەر ئەم ئایینە بچوێنین بە دراوێك ئەوا دەبینین لە ڕووی یەکەمی نووسراوە ﴿لا الـه الا الله﴾و ڕووی دووەم لێی نووسراوە (**حاکمیەتی خوا**)، کەواتە: **خوا بەیەك زانین و حاکمیەتی خوا دووڕووی یەك هەقیقەتن**.

٢) (**ابن تیمیة**) بەرەحمەت بێ دەڵێ: هەرکەسێك نەزمەرێك حەلاڵ بکات ئەوا بەگوتەی تێکرای زانایان کافر دەبێت، هەروەك لەتە ناتێك حەرام بکا دیسان بە گوتەی تێکرای زانایان کافر دەبێت.

٣) شەهید (**د.عبدا لله عزام**) بەرەحمەت بێ دەڵێ: ﴿لا الـه الا الله﴾ واتە حوکم کردن بە قورئان، هەرکەسێك حوکم بە قورئان نەکات واتە: خوایەتی خوای ڕەت کردۆتەوە.

هەروەها دەڵێ: ئەوەی لە ژیانی‌دا بەردەوام ئارەقی‌خواردبێتەوە ئەوە کافر نابێ، بەڵام ئەوەی تەنها جارێك بڵێ (ئارەق خواردنەوە) دروستە، ئەگەر لەژیانی‌شی‌دا ئارەقیشی نەخواردبێتەوە ئەوە کافر دەبێ و تەڵاقیشی دەکەوێ، ئەویش بەمەرجێ ئەگەر پەشیمان نەبێتەوە و تەوبەی لەدوا نەکات.

## پ١٤٧/ مێژووی ئیسلامی چی دەڵێت دەربارەی حاکمیەتی خوا؟

و: زۆر نموونە هەن لە مێژووی ئیسلامدا دەربارەی حاکمیەتی خوا، ئێمە تەنها یەك نموونە دەهێنینەوە: ئەویش لە (**ابن عباس**) ڕەزای خوای لێ‌بێ گێڕدراوەتەوە:

ڕۆژێکیان جولەکەو دووڕوو (**منافق**) ێك لەسەر بابەتێك تێك گیر دەبن، ئەوانیش کێشەکە دەگەیننە لای پێغەمبەر ﷺ ئەویش حوکمەکەی داوە بە جولەکەکە، بەڵام دووڕووەکە بەم حوکمە ڕازی نەبوو، بۆیە گوتی: حەزم لێیە سەرێك بدەین لە (ابو بکر) (ڕەزای خوای لێ‌بێ) و بزانین ئەو چ دەڵێ، بەڵام کاتێ کەچوونە لای، ئەویش وەك پێغەمبەر هەمان حوکمی دا، بەڵام کابرای دووڕوو هەر دڵی دانەمرکا بۆیە گوتی، حەزم لێیە سەرێکیش دەین لە (**عومەری کوڕی خەتتاب**) (ڕەزای خوای لێ‌بێ) کاتێ کە هاتنە لای (**ئیمامی عومەر**) و کابرای جوولەکە گوتی ئەی (عومەر) ئێمە چووینە لای پێغەمبەرو ﷺ حوکمێکی‌دا بەڵام ئەم پیاوە دڵی ئاوی نەخواردەوە و بۆیە گوتی: بچینە لای (ابو بکر) کاتێ کەچووین ئەویش هەمان حوکمی‌دا بەڵام هەر دڵی دانەمرکا، ئێستاش هاتینە لای تۆ دەمانەوێ بزانین حوکمی تۆ چی‌یە؟

(**عومەری کوڕی خەتتاب**) یش (ڕەزای خوای لێ‌بێ) فەرمووی پێغەمبەری خوا حوکمی‌دا ڕازی نەبوو؟ گوتی بەڵێ، پاشان گوتی (ابو بکر) یش حوکمی دا هەر ڕازی نەبوو؟ دیسان گوتی بەڵێ: گوتی دەنا ڕاوەستن ئێستا دێمەوە.... چووە ژوورەوە شمشێرێکی لەگەڵ خۆی هێنا و دای لە ملی کابرای (منافق) و گوتی ئەمە حوکمی عومەرە. **کەواتە: هەر کەسێك کە بەحوکمی خوا ڕازی نەبێ، حوکمەکەی شمشێری ئیمامی عومەرە**. (القرطبي ٥/ ٢٦٤)

## پ١٤٨/ جۆرەکانی حوکم لەئیسلامدا چین؟

و: ئیسلام دەبێ لەهەموو بوارێکەوە بکرێتە حاکم، چونکە بەرنامەو یاسای ژیانە بۆ ئینسان...بۆنموونە:

١) **حوکم لەبواری بیروو باوەڕدا:** هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَأَنْ اعْبُدُونِي هَذَا صِرَاطٌ مُسْتَقِيمٌ﴾ يس ٦١. واتە: (ئایا پەیمانم لێ وەرنەگرتن) کەوا من بپەرستن و ئەمە ڕێگای ڕاستە؟

٢) **حوکم لەبواری بەندایەتی:** هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي﴾ متفق عليه. واتە: نوێژ بکەن وەکو کە (من)تان دەبینی نوێژم دەکرد.

٣) **حوکم لە مامەڵەو کڕین و فرۆشتن:** هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ﴾ المطففين ٣.١. واتە: وای بۆ تەرازوو بازان، ئەوانەی کەوا لە ماڵی ئینسان شتێك پێوانە بکەن بۆخۆیان بە زیادەوە پێوانەی دەکەن، وە کاتێکیش لە ماڵی خۆیان پێوانە بکەن کەمیان دەدەنێ.

٤) **حوکم لە حەدوو تۆڵە سەندن:** ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ وَالعَيْنَ بِالعَيْنِ، وَالأَنْفَ بِالأَنْفِ، وَالأُذُنَ بِالأُذُنِ وَالسِّنَّ بِالسِّنِّ وَالجُرُوحَ قِصَاصٌ...﴾المائدة ٤٥. واتە: لەسەرمان نووسیون لە کتێبی خوا کەوا هەرکەسێ کەسێ بکوژێ دەکوژرێتەوە و ئەوەی چاوی کوێر کات کوێر دەکرێتەوە، لووت بەلووت و گوێ بە گوێ و ددان بە ددان و لە برینەکانیش تۆڵە دەسەنرێ وەکو خۆی.

٥) **حوکمی خوا لەبواری یاسا دانان:** هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُمْ مِنَ الدِّينِ مَالَمْ يَأْذَنْ بِهِ اللهُ﴾ الشورى ٢١. واتە: ئایا هاوبەشیان بۆ خوا داناوە کەوا یاساو بەرنامەی ژیانیان بۆ دادەنێن بە شێوەیەك کە خودا ئیزنی لەسەر نییە و پێی نارازییە؟

## پ١٤٩/ حوکمی خوا چییە بۆ ئەو کەسانەی کەوا حوکم بەقورئان ناکەن؟

و: حوکمی خوا لەکەسێکەوە بۆ کەسێك دەگۆڕێت: بۆ نموونە:

١) **فەرمان ڕەوای یەکەم لەووڵات:** ئەو فەرماندەیە ئەگەر حوکم بەقورئان نەکاو پێشی ڕازی نەبێ و بشزانێ کەوا پێی گوناهبار دەبێ ئەوا کافرەو لە ئایین دەردەچێ.

٢) **ئەوانەی کە یاسا دادەنێن:** حوکمی ئەوانەش هەمان حوکمی فەرماندەکەیە ئەگەر چی هەموو دەقەکانی یاسا لەگەڵ شەریعەتی خوا یەك بگرنەوە بەس تەنها یەك یاسا نەبێ کە دژە لەگەڵ دەقێکی شەریعەت، ئەوجا هەر کافر دەبێت.

٣) **نوێنەری گەل:** ئەگەر هەریەکێك لەم نوێنەرانە کە (**توقیع**) بکات لەسەر یەك یاسا کە دژبێ لەگەڵ شەریعەتی خوا ئەوا کافر دەبێت، بۆنموونە:

ئەگەر (**تەوقیع**) بکات لەسەر ئەوە کە ئارەق خواردنەوە حەڵاڵە کەبۆخۆی حەرامە، یان خڕبوونەوە لە مزگەوت بەنیەتی قورئان خوێندن بە حەرام بزانێ یان (**توقیع**) بکەن لەسەر ئەوە کە پیاوو ئافرەت لەبواری میراتەوە دەبێ وەك یەك بن، ئەوا پێی کافر دەبن و لە ئیسلام دەردەچن.

٤) **مسوڵمانانی بە گشتی:** گەلی مسوڵمان پێویستە هەموو ئەو جۆرە یاسایانەی کە بە پێچەوانەی ئیسلام و یاسای ئیسلام دەردەچن ڕەتی بکەنەوە ئەگەر بە دڵیش بێ، هەرکەسێك حوکم بەم جۆرە یاسا دەستکردانە بکات وەکو ئەوە وایە کەلە نوێژێکی بەیانیا لە دوای مەلایەك نوێژ دەکات. کەچی(مەلا)یەکە لەجیاتی دوو ڕکات سێ ڕکات نوێژیان بۆ بکات.

مامۆستا (**المودودي**) دەڵێ: (ئەگەر هەرچی هەقمان هەیە بەزایە بچێت هێشتا چاکترە لەوەی کە بچینە لای ئەم جۆرە حاکمانەو حوکمیان پێ بکەین)...

هەرکەسێکی لەریزی تاغوتەکان بوەستێ و بۆ تەختی حوکمڕانێتیان هەڵبژێرێ‌و بشزانێ کە ئەم تاغوتە حوکم بە قورئان ناکات و یاسای دەست کردی مرۆڤ پیادە دەکات، جا ئەگەر لەبەر بەرژەوەندی دونیا یان لەبەر بەرژەوەندی تاکە کەسی‌یەوە بێ، ئەوا لە ئیسلام دەردەچێ و بە چاوی مسوڵمان سەیر ناکرێن...بەڵام ئەگەر ئەم جەماوەرە مسوڵمانە بەنەفامی ئەم تاغوتانەیان هەڵبژاردبێ، ئەوا هیوا وایە کەبە بەر عوزر بکەون، بەڵام زانایان دەڵێن: ئەو جۆرە کەسانە هیچ عوزرێکیان لێ وەرناگیرێ، لەکاتێکدا کە بۆخۆیان دەنگ بدەن بەم جۆرە تاغوتانە...

٥) **قازییەکان:** قازی ئەگەر یاسایەکی ناشەرعی جێ‌بەجێ بکات، بەڵام لەدڵەوە حەزی لەوە نەبێت کە ئەو یاسایە جێ بەجێ بکات، بەڵکو پێی خۆش بێت کە یاسای ئیسلامی جێ بەجێ بکات نەك یاسای غەیرە ئیسلامی، ئەوا ئەم قازییە لەئیسلام دەرناچێ‌و ئەودەمە دەکەوێتە بەر حوکمی(**فسق**) واتە (**فاسق**) دەبێ بەڵام کارەکەی‌و مووچەکەی لێ حەرامەو نابێ بیکات...

٦) **پارێزەران:** حوکمیان هەمان حوکمی قازییەکانە: بەڵام ئەگەر چەند مەرجێکیان تێدا هاتنە دی ئەوا زانایان دەڵێن: کاردکەیان دروستە. مەرجەکانیش بریتین لە:

- **ئەو کێشانەی کەئەو پێی هەڵدەستێ نابێ لەگەڵ شەریعەتی خوا تێك بگیرێ.**
- **نابێ بەرگری لەزۆردار بکات.**
- **نابێ لەکێشەیەك ( داوا ) بەرز بکاتەوە وگومانی ئەوەش ببات کەخاوەن کێشەکە زۆر لێ کراوە.**

پ١٥٠/ فەرمانڕەوا جۆراوجۆرەکان (اصناف الحکام) دەکرێنە چەند

بەش و لە ئیسلامدا حوکمیان چی‌یە؟

و: فەرمانڕەوایان دابەش دەکرێن بۆ چوار بەش:

**یەکەم: فەرمانڕەوای مسوڵمانی دادپەروەر:**

فەرمانڕەوای مسوڵمان ئەو کەسەیە کەئایین و بەرنامەی خوا پەیڕەو دەکات و شەریعەتی خوا جێ بەجێ دەکات و بە دادگەری کارەکان ڕادەپەڕێنێت، ئەمانە ئەو کەسانەن کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْمُقْسِطِينَ عَلَى مَنَابِرِ مِنْ نُورٍ﴾ رواه مسلم. واتە: دادپەروەران (لەبەهەشت) لەسەر مینبەرێکی ڕۆشن و پرشنگدار دان.

ئەم جۆرە فەرمانڕەوایانە گوێ ڕایەڵ بوونیان بۆ پێویستە، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿أَطِيعُوا اللهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الأَمْرِ مِنكُمْ﴾النساء ٥٩. واتە: گوێ ڕایەڵی خواو گوێ ڕایەڵی پێغەمبەرو ئەو فەرمانڕەوایانە بکەن کە لەخۆتانن.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللهَ، وَمَنْ يَعْصِنِي فَقَدْ عَصَى اللهَ، وَمَنْ يُطِعِ أَمِيرِي فَقَدْ أَطَاعَنِي، وَمَنْ يَعْصِ أَمِيرِي فَقَدْ عَصَانِي﴾ متفق عليه. واتە: هەرکەسێك گوێ ڕایەڵی من بکات، ئەوا گوێ ڕایەڵی خوای کردووە، هەرکەسێك لەمن یاخی بێ، ئەوا لەخوا یاخی بووە، وەهەرکەسێك گوێ ڕایەڵی فەرمانڕەوای من بکات، ئەوا گوێ ڕایەڵی منی کردووە، هەرکەسێکیش لەفەرمانڕەوای من یاخی بێ ئەوا لەمن یاخی بووە.

یان دەفەرمووێ: ﴿مَنْ خَرَجَ مِنَ الطَّاعَةِ وفَارَقَ الجمَاعَةَ، فَمَاتَ مَيْتَةً جَاهِلِيَّةً﴾ رواه مسلم. واتە: هەرکەسێك لە گوێ ڕایەڵی(کاربەدەستی مسوڵمان) دەربچێ‌و لەکۆمەڵەی (مسوڵمانان) دابڕێ، (کاتێ کە) مرد، ئەوا بەمردنێکی نەفامی مردووە.

**دووەم: فەرمانڕەوای زۆردارو فاسق:**

ئەمانە ئەو کەسانەن کە گوناهبارو تاوانبارن، هەربۆیە ئەم ناوەیان لێ نراوە، گوناهەکانیشیان بۆ نموونە بریتی‌یە لە: (ئارەق خواردنەوە، داوێن پیسی‌و لێ دانی جەلدە بە ناهەق، یان حوکم نەکردن بەبەرنامەی خوا لەبەر بەرژەوەندی تایبەتی خۆی نەك لەبەر ڕق لێ بوونەوەی) فەرموودەو گوتەش زۆرن لەم بابەتەوە، بۆنموونە:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ:

١) ﴿إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ بَعْدِي أَثَرَةً وَأُمُوراً تُنْكِرُونَها، قَالُوا: فَمَا تَأْمُرُنَا يَارَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: أَدُّوا إِلَيْهِمْ حَقَّهُمْ واسْأَلُوا اللهَ حَقَّكُمْ﴾ متفق عليه. واتە: ئێوە لەدوای من چەند کارێکی خۆپەرستی‌و نا شیاو دەبینن و ڕقتان لێ‌یەتی، ئەوانیش فەرموویان: فەرمانی چیمان پێ دەکەیت لەم کاتە دا ئەی پێغەمبەری خوا؟ ئەویش فەرمووی ئێوە حەقی ئەوان بدەن و واتە: گوێ ڕایەڵیتان بۆیان هەبێ حەقی خۆشتان لە خوا داوا بکەن.

٢) ﴿مَنْ كَرِهَ مِنْ أَمِيرِهِ شَيْئاً فَلْيَصْبِرْ فَإِنَّ مَنْ خَرَجَ مِنَ السُّلْطَانِ شِبْراً مَاتَ مَيْتَةً جَاهِلِيَّةً﴾ متفق عليه. واتە: هەرکەسێك شتێکی لە فەرمانڕەواکەی پێ ناخۆش بوو بادان بەخۆی

دابگرێ، چونکە هەرکەسێك بستێك لە فەرمانی کار بەدەستەکەی خۆی دەرچێ، ئەوا مردووە بە مردنێکی نەفامی.

٣) ﴿عَلَى الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ السَّمْعُ والطَّاعَةُ فِيمَا اَحَبَّ وكَرِهَ إلاّ اَنْ يُؤْمَرَ بِمَعْصِيةٍ فَلاَ سَمْعَ ولاَ طَاعةَ﴾ متفق عليه. واتە: لەسەر موسڵمان پێویستە کە گوێ رایەڵی یەکی چاکی (بۆ پێشەواکەی خۆی) هەبێ لەشتێك کە پێی خۆش بێ یان نا، تەنها ئەوە نەبێ کەفەرمانێکی نابەجێ و گوناهی پێ سپێررا، ئەوانابێ گوێ رایەڵیت بۆی هەبێ.

هەروەها زانایان دەڵێن:

أ) (ابن كثير)، (بەرەحمەت بێ) دەڵێ: (ئەگەر پێشەوا فاسق بوو لانادرێ لە کاربەدەستی) چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿إلاّ اَنْ تَرَوْا كُفْراً بَوَاحاً عِنْدَكُمْ مِنَ ا للهِ فِيهِ بُرْهَانٌ﴾ تفسير القران العظيم (١/ ٧٢). واتە: تەنها ئەو کاتە نەبێ کە کوفرێکی ئاشکرای تیا بینرا، کە لەلای خوا بەڵگەی لەسەر هەبوو.

ب) القرطبي (بەرەحمەت بێ) دەڵێ: (..والفاسق لايجوز حكمه) واتە: فاسق نابێ بکرێتە کار بەدەست.

ج) الدكتور محمود حلمي (بەرەحمەت بێ) دەڵێ: (ان الامام ينعزل بالفسق والجور).واتە: کاربەدەست لا دەچێت بە(فسق)و بە زوڵم.

د) ئیمامی (نووي)ش (بەرەحمەت بێ) هەمان رای (ابن كثير)ی هەیە.

**پوختەی قسان**: لەرای زانیان ئەم خاڵانەی خوارەوە هەڵدەهێنجرێ:

١) بەهیچ جۆرێك پیاوی فاسق نابێ بکرێتە کاربەدەست (ئەگەر یەکێکی دادپەروەرو چاك لە ئارادا هەبوو).

٢) ئەگەر فەرمانرەوایەکە، یەکەم جار خواناس و داد پەروەر بوو، بەڵام پاشان دەستی کرد بەزوڵم و بێ دینی، ئەوا:

- هێندێك لەزانایان دەڵێن: دەرناکرێ و لەسەر کارەکەی خۆی بەردەوام دەبێ.
- هێندێکیش لە زانایان دەڵێن: فەرمانەکەی لێ هەڵدەوشێتەوە نەك لا بدرێ.

٣) بۆ بەر هەڵستی کردنی، زانایان سێ رایان هەیە:

أ) هێندێك دەڵێن: نابێ بەرهەڵستی بکرێ، نەبادا بە بەرهەڵستی کردنی فیتنەو ئاشوب روویدات، ئەمەشیان رای جەماوەری موسڵمانانە، بەڵکو (ابو بكر بن مجاهد) دەڵێ: کۆرا (اجماع) ی زانایانی لەسەرە.

ب) هێندێك دەڵێن: دەبێ بەرهەڵستی بکرێ، تاوەکو لە فەرمانرەوایی لادەدرێ.

ج) هێندێك دەڵێن: سەرنجی دەدەینێ بەیەك لە دووشتان، کە ئەویش بریتین لە: (ئایا بەرهەڵستی نەکردنی زیانی زیاترە، یان بەرهەڵستی کردنی؟) ئەگەر بەبەرهەڵستی کردنی فیتنەو ئاشوبەکە گەورەتربوو ئەوا نابێ بەرهەڵستی بکرێ، ئەنا ئەگەر وانەبوو، ئەوا دەبێ بەرهەڵستی بکرێت.

٤) ئەگەر ئەو کەسەی لەدژی فەرمانڕەواکە وەستا، کە بۆخۆی لە فەرمانڕەواکە چاکتر بوو، ئەوا بۆخۆی لەم حاڵەتەدا بە (باغي) دانانرێت.
٥) زانایان گشتی‌یان لەسەر ئەوەن، کەوا فەرمانڕەوای مسوڵمان وەکو هەموو خەڵك ئەگەر گوناهی کرد بەپێی شەرع تۆڵەی لێ دەسەنرێ، وە ئەگەر حەددی کەوتە سەر، دەبێ حەددی لێ دەربکرێ، بەڵام ئیمام (ابو حنیفة) بەرەحمەت بێ ڕای لەگەڵ ئەمە دانی‌یە.

**سێیەم: فەرمانڕەوای داهێنەر (الحاکم المبتدع):**

(بیدعە) واتە: هێنانە کایەی شتێك کە نە خوا و نە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیان پێ نەکرد بێت، جا ئەم شتە چ گوتەیی بێ چ ڕەفتاری، یان هێنانە کایەی یاسایەکی نوێ کە لە ئیسلامدا زیاد کرابێ، وەکو ئەم قسە زیادەی کە (مأمون و معتصم و واثق) خەلیفەکانی عەبباسی دەیان کرد دەربارەی قورئان کە دەیانگوت: (مخلوق)ە.

زانایان قسەیان زۆرە لەم بابەتەوە، بۆنموونە:

١ـ (ابن الحجر العسقلاني) بەرەحمەت بێ دەڵێ: (**وَقَدْ اَجْمَعُوا عَلَى اَنَّهُ أَيْ الْخَلِيفَةُ اِذَا دَعَا اِلَى كُفْرٍ اَوْ بِدْعَةٍ اِنَّهُ يُقَامُ عَلَيْهِ**)، واتە: کۆڕای زانایان لەسەر ئەوەیە کەوا خەلیفەی مسوڵمانان ئەگەر بانگەوازی بۆ کوفر یان بیدعە کرد ئەوا دەبێ لەدژی بوەستن.

٢ـ(**ئیمامی نووي**) بەرەحمەت بێ، دەڵێ: ئەگەر پێشەوای مسوڵمانان کوفرێکی کرد یان شەریعەتی خوای گۆڕی یان بیدعەیەکی نایەوە ئەوا کارەکەی لێ دەسەنرێتەوە وگوێ ڕایەڵی ناکرێ، پێویست دەبێ لەسەر مسوڵمانان کەوا لەدژی بووەستن و پێشەوایەکی دادپەروەریش (ئەگەر هەبوو) لەجێگای دابنێن، (ئەگەر توانرا).

**پوختەی قسان:** دەربارەی کاربەدەستی داهێنەر ئەوەیە:

أ) جەماوەری مسوڵمانان گشتی‌یان لەسەر ئەوەن کەوا پێشەوایەتی نادرێتە دەستی داهێنەران، وە ئەگەر ئەم فەرمانڕەوایە یەکەم جار داد پەروەرو خواناس بوو، بەڵام دوایی بیدعەی نایەوە ئەوا دەبێ، لەسەرکارەکەی لابدرێو بەپێی توانا لە دژی بووەستیت.
ب) بەڵام ئیمام (احمد) بەرەحمەت بێ ڕای نی‌یە لەسەر ئەوەی کەوا گوێ ڕایەڵی بۆ نەکەیت و لە فەرمانی دەربچیت.
ج) بەڵام زۆر لەزانایانی (بصرة) دەڵێن: بیدعە ڕێگە لەوە ناگرێ کە کەسێك بکرێتە سەرۆك و بەردەوام بێت تیایدا.
د) بەڵام ئەگەر بیدعەیەکی بەسەرداهات کەبووە هۆی ئەوەی کە کوفرێکی ئاشکرای لێ بپشکوێتەوە ئەوا حوکمی کار بەدەستەکە لەو دەمەدا حوکمی کافرەکانە.

**چوارەم: فەرمانڕەوای بێ بڕوا (الحاکم الکافر):**

واتە: ئەم فەرمانڕەوایەی کە کافرو بێ بڕوایە:

ئیمامی (النووي) دەڵێ: (**قَالَ الْقَاضِي عِيَاض: اَجْمَعَ الْعُلَمَاءُ عَلَى أَنَّ الْإِمَامَةَ لَاتَنْعَقِدُ لِكَافِرٍ، وعَلَى أَنَّهُ لَوْطَرَأَ عَلَيْهِ الْكُفْرُ اِنْعَزَلَ..**). واتە: قازی (عیاض) دەڵێ: زانایان یەك دەنگن

لەسەر ئەوە کە پیاوی بێ بڕوا ناکرێتە کاربەدەست و پێشەوا، ئەگەر یەکەم جار چاك بوو بەڵام لەدوایی کافر بوو، ئەوا لەسەر کارەکە لادەدرێت.

هەروەها (الشوكاني) بەڕەحمەت بێ، دەڵێ: (بەگوێ کردنی کاربەدەستانی ئیسلامی پێویستەو نابێ لە فەرمانیّ دەربچیت، تەنها ئەگەر ئەم پێشەوایە لەفەرمانی خواو پێغەمبەر ﷺ دەرچوو، ئەو دەمە دەبێ لەدژی ڕابووەستیت و نەیکەیت بە کاربەدەست و پێشەوای خۆت.

**پوختەی قسان:** دەربارەی کاربەدەستی بێ بڕواو کافر ئەوەیە:

(جەماوەری مسوڵمانان لەسەر ئەوەن کە کار نادرێتە دەست بێ بڕوایان، وە ئەگەر پێشەوای مسوڵمانان یەکەم جار بڕوادار بوو، بەڵام دوایی کافر بۆوە، ئەوا لەسەر مسوڵمانان پێویستە گوێ ڕایەڵی بۆ نەکەن و شەڕی لەگەڵدا بکەن تا لادەچێت، ئینجا لە جێی ئەو پیاوێکی مسوڵمان و دادگەر جێگیر بکەن و بیکەن بە کار بەدەست و پێشەوای خۆیان).

## پ١٥١/ ئایا چۆن حاکمیەتی خوا دەچەسپێ؟

و: بە تێکۆشان و جیهاد کردن لەڕێگەی خوا حاکمیەتی خوا دەچەسپێ، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لَاتَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ﴾الأنفال٣٩. واتە: شەڕیان لەگەڵدا بکەن تاوەکو شیرك و بێ بڕوایی نەمێنێ و ئایین و فەرمانڕەوایەتی تەنها بۆ مافی خوا بێ.

❁ ❁ ❁

# بەشی نۆیەم

# تێکۆشان لە ڕێگەی خوادا

## الجهاد في سبيل الله

### پ١٥٢/ جیهاد مانای چی‌یە؟

و: جیهاد لە ڕووی زمانەوانی‌یەوە بەمانای سەرف کردنی هێز و توانا دێت چ لە ڕووی گوتـە (**قول**)ەوە چ لە ڕووی کردار (**فعل**) ەوە. وە لە ڕووی شەریعەتەوە بەمانای جەنگ کردن لەگەڵ بێ بڕوا و پاشگەز و هەڵگەڕاوەکان و....هتد دێت، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَجَاهِدُوا فِي اللهِ حَقَّ جِهَادِهِ﴾ الحج ٧٨. واتە: جەنگ بکەن لە پێناوی خوا بەم شێوەی کە شایاتیەتی.

### پ١٥٣/ حوکمی جیهاد لە پێناوی خوا چی‌یە؟

و: جیهـاد لـە پێناوی خـوا فـەرزی کیفایەیـە بەمـەرجێ، ئەگـەر هێندێـك پێـی ی هەڵسـان و پێویستی بە ئەوانی تر نەکات، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنْفِرُوا كَافَّةً﴾التوبة١٢٢. واتە: بۆ بڕواداران نەهاتووە هـەر هـەموویان ڕاپـەڕن وجیهـاد بکـەن. ئـەوە ئەگـەر جیهاد فەرزی کیفایە بوو...بەڵام جیهاد دەبێتە فەرزی عەین بەم مەرجانەی خوارەوە:

١ـ **اذا التقى الزحفان و تقابل الصفان حرم على من حضر الانصراف.** واتە: ئەگەر دوو سوپا (سوپای‌کوفرو ئیمان)گەیشتنە یەك و بەرامبەر یەکتر وەستان ئەوا دروست نی‌یە بـۆ کەسێك لـەوێ بێ پشتی خۆی لێ هەڵکا و جیهاد نەکات.

هەروەك پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەفـەرمووێ: (یـەك لـە شـتە بـەهیلاك دەرەکـان بریتی‌یـە لـە ڕاکردن لە ڕۆژی شەڕ)یان خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا زَحْفًا فَلَا تُوَلُّوهُمُ الْأَدْبَارَ﴾ الانفال١٥. واتە: ئەی بڕوادارینەکاتێ کە گەیشتن بە بێ بڕواکان هێرشیان بکەنە سەرو پشتیان تێ‌مەکەن.

**٢ـ اذا نزل الكفار ببلد تعين على اهلـه قتـالهم و دفعهـم.** واتـە: ئەگـەر کافرەکـان هاتنـە نـاو شاری مسوڵمانان، ئەوا لە سەر ئەهلی ئەم شارە جیهاد دەبێتە فەرزی عەینی بۆ ڕووبەڕووبوونەوە و بەرەنگاری‌کردنیان. هەروەك خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قَاتِلُوا الَّذِينَ يَلُونَكُمْ مِنَ الْكُفَّارِ وَلْيَجِدُوا فِيكُمْ غِلْظَةً﴾التوبة١٢٣. واتە: ئەی بڕوادارینـە شـەڕبکەن لەگـەڵ ئـەو کافرانەی لێتان نزیکن و با توندو تیژیتان تێدا ببینن.

٣- اذا استنفر الامام قوماً لزمهم النفير. واتە: ئەگەر پێشەوای کۆمەڵێکی مسوڵمان داوای ڕاپەڕینی لێ کردن، ئەوا لەم دەمە ڕاپەڕینەکە فەرز دەبێت بە فەرزی (عەین)، هەروەك پێغەمبەری پێشەواﷺ دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا إِسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا.....﴾ مسلم، البخاری. واتە: ئەگەر داوای ڕاپەڕینیان لێ کردن ئێوەش ڕاپەڕن.

کەواتە: جیهاد لە بنچینەدا فەرزی عەینە، بۆیە پێویستە لە سەر مسوڵمانان بە هەر جۆرێك بێت و بە پێی توانا جیهاد بکەن، هەروەك پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێ: ﴿جَاهِدُوا الْمُشْرِكِينَ بِأَلْسِنَتِكُمْ وأَنْفُسِكُمْ وأَمْوالِكُمْ وأَيْدِيْكُمْ﴾ صحیح رواه احمد. واتە: جیهاد بکەن لەگەڵ هاوەڵ پەرستەکان بە (زمان وگیان و ماڵ و دەست)ەکانتان.

## پ١٥٤/ جیهاد چەند جۆری هەیە؟

و: جیهاد دەکرێت بە چوار بەش:

١. **جیهادی دەروون:**

واتە: بەرەنگار بوونەوە لەگەڵ هەواو ئارەزووە پیس و چەپەڵەکانی دەروون وخۆ زاڵکردن بەسەریانا... هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَى﴾ النازعات ٤٠. واتە: جڵەوگیری نەفسی خۆی کردبێ لە ئارەزوو بازی.

٢. **جیهادی شەیتان:**

واتە:بەرەنگار بوونەوەی فروفێڵی شەیتان و خۆنەخستنە بەر ویستە فریو دەرەکانی شەیتان، هەروەك خوای گەورە لە باسی شەیتانا دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذُوهُ عَدُوّاً....﴾فاطر ٦. واتە: بە ڕاستی و بەبێ گومان شەیتان دوژمنی ئێوەیە، دەئێوەش بە دوژمنی خۆتانی بزانن.

٣. **جیهادی کافرو دووڕووەکان:**

ئەمەشیان بریتیە لە ڕوو بەڕوو بوونەوەی کافرو دوو ڕووەکان. بۆ تێك وپێك شکاندنی هێزە بەزۆر داسەپێنەرەکانی کوفر.... هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ جَاهِدِ الْكُفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ وَاغْلُظْ عَلَيْهِمْ...﴾التوبة ٧٣. واتە: ئەی پێغەمبەری خواﷺ جیهاد بکە لە گەڵ کافرو دووڕووەکان و توندو تیژ بە لە سەریان.

٤. **جیهاد لەگەڵ گوناهبارو زۆردارو خاوەن بیدعەکان:**

مسوڵمان دەبێ هەمیشە ڕووبەڕووی تاوان و سەر پێچی ببێتەوە تاوەکو خەڵکی مل کەچی ئایین و بەرنامەی خوا ببن هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَراً فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ وذَلِكَ أَضْعَفُ الإِيمَانِ﴾ رواه مسلم. واتە: ئەگەر هەر کەسێك لە ئێوە خراپەیەکی بینی با بە دەست بیگۆڕێ، ئەگەر نا بە زمان بیگۆڕێت... ئەگەر بە زمانیش نەی توانی بیگۆڕێ ئەوا با بە دڵ پێی ناخۆش بێ، بەڵام ئەمەی دوایی لاواز ترین باوەڕ دەردەخا...

## پ١٥٥/ بۆچی دەبێ جیهاد بکەین؟

و: گرنگترین هۆ بۆ جیهاد کردن بریتیە لە:

١) **بە جیهاد کردن بێ بڕوایی لا دەچێ و یەکخواناسی و حاکمیەتی خوا دەچەسپێ:** هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ...﴾ الانفال ٣٩. واتە: شەڕیان لە گەڵدا بکەن تاوەکو شیرك و بێ بڕوایی نەمێنێ و ئایین و مل کەچایەتی تەنها بۆ خوا بمێنێ..

٢) **بۆ بەرپەرچ دانەوەی دەست درێژی دوژمنان و پاراستنی شەریعەتی خوا:** هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾ البقرة١٩٤. واتە: گەر هەر کەسێك دەست درێژیان کردنە سەر، ئێوەش دەست درێژیان بۆ بکەن بە وێنەی دەست درێژی‌یەکانی ئەوان بۆ سەر ئێوە.

٣) **لەترسی ئاگر:** خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِلَّا تَنفِرُوا يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَيَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ..﴾التوبة ٣٩. **واتە:** ئەگەر ئێوە ڕانەپەڕن بۆجیهاد و خەبات کردن دژ بە دوژمنانی ئیسلام و مسوڵمانان، خوای گەورە سزاتان دەدات، سزایەکی سەخت و کاریگەر وە لە جیاتی ئێوە گەلێکی دیکە لە نەوەی ئێوە نەبێت دەکات بەکار گوزاری ئایینی پیرۆزی ئیسلام.

٤) **وەلام دانەوەی بانگەوازی خوای پەروەردگار:** خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿انْفِرُوا خِفَافًا وَثِقَالًا وَجَاهِدُوا بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ التوبة ٤١. واتە: ڕاپەڕن بۆ جیهاد، سواربن یان پیادە، گەنج بن یان پیر، هەڵگری چەکی قورس بن یان سووك لە هەر حاڵێکدابن بە بێ وەستان هەڵمەت بەرن. جیهاد بکەن بە ماڵ وسامان و گیانتان بەخت بکەن لە پێناوی ڕێگەی خوا دا، ئەو جیهاد کردنە بۆتان باشترە ئەگەر بزانن، چونکە سەر بەرزی هەر دوو جیهان دەبن...

٥) **بۆ پاراستنی چەوساوەکانی سەر ڕووی زەوی و ڕزگار کردنیان:** خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَمَا لَكُمْ لَا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا﴾ النساء ٧٥. واتە: ئەوە چیتانە بۆ ناجەنگێن لە ڕێگەی خوادا (بۆ بەرز کردنەوەی دروشمی ﴿لا الـه الا الله محمد رسول الله﴾ وە لە پێناوی چەوساوان و زۆر لێ کراوان و ژێر دەستاندا) لە پیاوان و ئافرەتان و منالاّندا ئەوانەی کە بە دەنگە کپە زولاڵەکانیان دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان دەربازمان بکە لەم ئاواییە کە خەڵکەکەی زۆردار و ستەمکارن... وە لە لایەن خۆتەوە یەکێکمان بۆ بڕەخسێنە کە سەرمان بخات.

٦) **جیهاد کردن پارێزگاری دروشمەکانی ئایینی ئیسلام دەکات:** خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَلَوْلَا دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَامِعُ وَبِيَعٌ وَ

صَلَوَاتٌ وَمَسَاجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا اسْمُ اللَّهِ كَثِيراً﴾ الحج.٤٠. واته: ئەگەر خواى گەورە هێندێ کەسی خراپکار بە دەستی موجاهیدان لەناو نەبردبا و پاڵی پێوە نەنابا، ئەوا پەرستگا و گۆشەنیگای گاور و جوولەکە و دێر و کەنیسەکان و مزگەوتەکانی مسوڵمانان دەڕووخێنران و کاول دەکران، کە یادی خودایان زۆر تێدا دەکرا و پەرستنیشیان تێدا ئەنجام دەدرا.

## پ١٥٦/ فەزڵی جیهاد لە ئیسلامدا چی‌یە؟

و: لەئیسلامدا جیهاد گەورەترین و چاکترین کردەوەیە لە لای خوا. هەروەك لە پێغەمبەری خوایان ﷺ پرسی: ﴿أيُّ العَمَلِ أفْضَلُ؟ قَالَ الإيمان با لله. والجِهَادُ في سَبِيلِهِ﴾متفق عليه. واته: چ کردەوەیەك لەهەموو کردەوەیەك چاکترە (لە لای خوا)؟ ئەویش فەرمووی: بروا هێنان بە خوا و تێکۆشان لە پێناوی.

بۆ حاڵی‌بوون لەم پرسیارە چەند خاڵێك بە نموونە دەهێنینەوە:

١ـ **سەنگەرنشینی**: هەروەك (ابو هريرة) رەزای خوای لێبێ دەفەرمووێ: (**لإنْ أُرَابِطَ لَيْلَةً في سَبِيلِ الله أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ انْ أُوافِقَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ عِنْدَ الْحَجَرِ الأَسْوَدِ**) رسالة العمدة في إعداد العدة، واته: سەنگەرنشینی یەك شەوم لە ڕێگەی خوا پێ خۆشترە لە شەونوێژی (**ليلة القدر**) لە بن باڵی کەعبەدا.

٢ـ **ئێشك گرتن** (الحراسة) **لە پێناوی خوا**: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿**عَيْنَانِ لا تَمَسُّهُمَا النَّارُ: عَيْنٌ بَكَتْ مِنْ خَشْيَةِ الله وعَيْنٌ بَاتَتْ تَحْرُسُ في سَبِيلِ الله**﴾ صحيح الترمذي. واته: دووچاو ئاگریان تاگاتێ، چاوێك لە ترسی خوا گریابێ، چاوێکیش لە پێناوی خوا ئێشکی گرتبێ.

٣) **هیچ بەندایەتی‌یەك پێش جیهاد ناکەوێ**: قِيلَ يَا رَسُولَ الله مَا يَعْدِلُ الْجِهَادَ في سَبِيلِ الله؟ قَالَ: ﴿لا تَسْتَطِيعُونَهُ﴾ فَأَعَادُوا عَلَيْهِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاثاً كُلُّ ذَلِكَ يَقُولُ: ﴿لا تَسْتَطِيعُونَهُ﴾، ثُمَّ قَالَ: ﴿مَثَلُ الْمُجَاهِدِ في سَبِيلِ الله كَمَثَلِ الصَّائِمِ الْقَائِمِ الْقَانِتِ بِآيَاتِ الله لا يَفْتُرُ مِنْ صَلاةٍ وَلا صِيَامٍ حَتَّى يَرْجِعَ الْمُجَاهِدُ في سَبِيلِ الله﴾ متفق عليه. وهذا لفظ مسلم. واته: لە پێغەمبەری خوایان پرسی: چ شتێك هەیە خێری بە ئەندازەی جیهاد کردن بێ؟ فەرمووی: (پێتان ناکرێ واتە نی‌یە) دووبارەو سێ‌بارە پرسیارەکەیان لێ کردەوە و هەموو جارێ دەیفەرموو: (پێتان ناکرێ) پاشان فەرمووی: (نموونەی ئەو کەسەی جیهاد دەکات لەپێناوی خوادا وەکو ئەوکەسەیەکە هەردەم بەڕۆژووە و شەو نوێژ دەکات، لە خوێندنی قورئانی پیرۆز دەست هەڵناگرێ و چرکەیەکیش لە نوێژ کردن و ڕۆژووگرتن غافل نابێ تا وەکو کابرای موجاهید دەگەڕێتەوە.

٤ـ **زامداری لە ڕێگەی خوادا**: ﴿**مَا مِنْ مَكْلُومٍ يُكْلَمُ في سَبِيلِ الله إلاَّ جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وكَلْمُهُ يَدْمَى: اللَّوْنُ لَوْنُ الدَّمِ والرِّيحُ رِيحُ الْمِسْكِ**﴾ رواه البخاري. واته: هەر کەسێك لە پێناوی خوا زامدار بێ، ئەوا ڕۆژی دوایی بە لەشی خویناوی‌یەوە دێتەوە بەر دەستی خوا خوێنەکەی ڕەنگی خوێنی‌یە بۆنەکەی بۆنی میسکە.

٥ ـ **شەهید ئاواتە خوازە کە دە جاران لە ڕێگەی خوا شەهید بێتەوە:** پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرمووێ: ﴿...الشَّهِيدُ يَتَمَنَّى أَنْ يَرْجِعَ إِلى الدُّنْيَا فَيُقْتَلُ عَشْرَ مَرَّاتٍ لِمَا يَرَى مِنَ الْكَرَامَةِ﴾ رواه البخاري. واتە: شەهید ئاواتە خوازە کە بگەڕێتەوە دونیا دە جاری تر شەهید بێتەوە لەبەر گەورەیی و ڕێزی شەهادەت.

٦ـ **شەهید هەست بەئازاری مردن ناکات:** پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿الشَّهِيدُ لا يَجِدُ مِنْ الْقَتْلِ إلاّ كَمَا يَجِدُ أَحَدُكُمْ الْقُرْصَةَ يَقْرِصُهَا﴾ رواه البخاري. واتە: شەهید ئازار نابینێ تەنها بەقەد ئازاری نقورچەیەك لە لەشی نەبێ.

٧ـ **جیهاد هەموو گوناهێك دەسڕێ:** پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿يُغْفَرُ لِلشَّهِيدِ كُلُّ ذَنْبٍ إلاّ الدَّيْنُ﴾ رواه مسلم. واتە: هەمووگوناهێکی شەهید (بە شەهیدی) لا دەچێت تەنها قەرز نەبێت[1].

٨) **موجاهید چاکترین کەسە لە لای خوا:** قِيلَ لِلنَّبِيِّ ﷺ أَيُّ النَّاسِ أَفْضَلُ؟ فَقَالَ: ﴿مُؤْمِنٌ يُجَاهِدُ بِنَفْسِهِ ومَالِهِ فِي سَبِيلِ ا للهِ﴾ متفق عليه. واتە: لە پێغەمبەریان پرسی ﷺ: چ کەسێك لە هەموو کەسێك چاکترە؟ ئەویش فەرمووی بڕوادارێك جیهاد بکات بە گیان و بە ماڵی خۆی لە ڕێگەی خوادا.

٩ـ **لوتکەی بەرزی ئیسلام جیهاد کردنە:** پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿رَأْسُ الأَمْرِ الإِسْلامُ وعَمُودُهُ الصَّلاةُ وذُرْوَةُ سَنَامِهِ الجِهَادُ﴾ صحيح الترمذي. واتە: سەری هەمووکارێك ئیسلامە، وەکۆڵەگەی ئیسلامیش نوێژە، لوتکە هەرە بەرزەکەشی جیهادکردنە لە ڕێگەی خوا.

١٠ـ **تیر (یان گوللە) هاویشتن لە ڕێگەی خوا:** پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿مَنْ رَمَى بِسَهْمٍ فِي سَبِيلِ ا للهِ فَهُوَ لَهُ عَدْلُ مُحَرَّرَةٍ﴾ صحيح الترمذي. واتە: هەر کەسێك تیرێك (یان گوللەیەك) لە ڕێگەی خوا بهاوێژێ وەك ئەوە وایە کە کۆیلەیەکی ڕزگار کردبێ.

## پ١٥٧/ حوکمی ئەو کەسەی کە جیهاد نەکات چییە؟

و: لە ئیسلامدا حوکمی زۆر توند هەیە بۆ ئەو کەسانە کە جیهاد ناکەن، بۆ نموونە:

١ـ پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿مَنْ مَاتَ ولَمْ يَغزُ ولَمْ يُحَدِّثْ بِهِ نَفْسَهُ مَاتَ عَلَى شُعْبَةٍ مِنَ النِّفَاقِ﴾ رواه مسلم. واتە: هەر کەسێك بمرێ و جیهادی نەکردبێ و خۆشی بۆجیهاد ئامادە نەکردبێ (لەدڵی خۆی دا) ئەوا لەسەر لقێکی دووڕوویی مردووە.

٢ـ هەروەها دەفەرمووێ: ﴿إِذَا تَبَايَعْتُمْ بالعينةِ. وأَخَذْتُمْ أَذْنَابَ البَقَرِ ورَضِيْتُمْ بالزَّرْعِ وتَرَكْتُمْ الجِهَادَ سَلَّطَا للهُ عَلَيْكُمْ ذُلاً لايَنْزِعُهُ حَتَّى تَرْجِعُوا إِلى دِيْنِكُمْ﴾ صحيح رواه احمد. واتە: ئەگەر دەستتان کرد بەکڕین و فرۆشتن و دەستتان گرت بەکلکی مانگاکانتان و خووتان

---

[1] واتە ئەو کەسەی هەیبێ و نەیدابێتەوە.

گرت بە کشتوکاڵەکانتان و وازیشتان هێنا لە جیهاد کردن لە ڕێگەی خوا، ئەوا خوا سەرشۆڕیتان دەهێنێتەوە سەر، لاشی نابات تاوەکو دەگەڕێنەوە سەر دین (جیهاد)ەکەتان،

٣ـ هەروەها دەفەرمووێ: ﴿مَنْ لَقِيَ اللهَ بِغَيْرِ أَثَرٍ مِنْ جِهَادٍ، لَقِيَ اللهَ وفِيهِ ثُلْمَةٌ﴾ رواه الترمذي. واتە: هەر کەسێك بێتەوە بەر دەستی خوا، بێ ئەوەی شوێنەوارێکی جیهادی بە لەشی یەوە بێ ئەوا بە لەکەداری یەوە گەیشتۆتەوە بەر دەستی خوا.

❁ ❁ ❁

## بەشی دەیەم

# باوەڕ بە فریشتەکان

### پ١٥٨/ باوەڕ بوون بە فریشتەکان یانی چی؟

و/ واتە باوەڕ بوون بە بوونیان بەبیٚ هیچ گومانێك.

### پ١٥٩/ فریشتەکان کێن و لە چی دروست کراون و ژمارەیان چەندە؟

و/ ئەو کارمەندانەن کە بەکار و فەرمانەکانی خوای پەروەردگار هەڵدەستن بەبیٚ لاملی لیٚ‌کردن، وە لە (نور) دروست کراون، هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿خُلِقَتِ الْمَلَائِكَةُ مِنْ نُورٍ....﴾ مسلم، واتە: فریشتەکان لە ڕووناکایی دروست کراون و هیچ کەسیش لە غەیری خوا نازانیٚ کە ژمارەیان چەندە هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ....﴾ المدثر ٣١، واتە: هیچ کەسێك بە لەشکری خوا نازانیٚ تەنها بۆخۆی نەبیٚ.

### پ١٦٠/ ئیش و کاری فریشتەکان چین؟

ئیش و کاریان گەلیٚ زۆرە کە بەم جۆرەی خوارەوەیە:

١) **خوا بەپاك ڕاگرتن (تسبیح):** هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَتَرَى الْمَلَائِكَةَ حَافِّينَ مِنْ حَوْلِ الْعَرْشِ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ﴾ الزمر ٧٥، واتە: فریشتەکان دەبینرێن لە دەوروبەری **(عرش)** دان و تەسبیحاتی پەروەردگاریان دەکەن.

٢) **هەڵگری بارەگای خوا (عرش الرحمن):** هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَةٌ﴾ الحاقة ١٧،واتە: لەڕۆژی دوایی لە سەرەوەی فریشتەکان، هەشت فریشتە بارەگای خوا هەڵدەگرن.

٣) **سڵاو کردن لە ئەهلی بەهەشت:** هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَالْمَلَائِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِمْ مِنْ كُلِّ بَابٍ، سَلَامٌ عَلَيْكُمْ بِمَا صَبَرْتُمْ....﴾ الرعد ٢٣-٢٤، واتە: فریشتەکان لەهەموو دەرگاکان لیٚیان دێنە ژوورەوەو سڵاویان لیٚ دەکەن و دەڵێن: سڵاوتان لیٚ بیٚ بەو ئارامی‌یەی کە گرتووتانە.

٤) **ئازاردانی ئەهلی دۆزەخ:** هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنْفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ

شِدَادٌ....﴾ التحريم ٦، واته: ئەی بڕواداریـنـه خۆتـان و مـاڵ و منالّـتـان لـه ئـاگرێك قورتـار بكەن، كه سووتەمەنی‌یەكەی بریتی‌یە لە بەرد و ئادەمیزاد، دوای ئەوە چەند فریشتەیەكی زۆر توونـد و تیژیان بەسەرەوەیە.

د) **هێنانه خوارەوەی (وەحی)**: ئەم فریشتەیە پێـی دەڵێـن (**جبریل**) ﷺ هـەروەك خـوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَ إِنَّهُ لَتَنْزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ، نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الأَمِينُ﴾ الشعراء ١٩٢،١٩٣، واته: ئەم قورئانـه نـێردراوی پـەروەردگاری جیهانـه کـه لەرێگـەی (جـبریل)ی ئەمین هاتۆته خوارەوە.

٦) **نووسینی كردەوەكان**: هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿أَمْ يَحْسَبُونَ أَنَّا لا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَ نَجْوَاهُم بَلَى وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ﴾ الزخرف ٧٩-٨٠، واتـه: ئایـا واحسـێب دەكەن كە ئێمە گوێمان لە نهێنی‌و چرپەكانیان نـەبێ، بـەڵێ: بەڕاسـتی ئێمـە نـێردراوی خۆمان هەیە كە هەرچی شتێك بكەن (لە دونیا) ئەوان دەینووسن.

٧) **دامەزراندنی بڕواداران**: هەروەكو خوای‌پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلائِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا......﴾ الانفال ١٢ واتـه: بەڕاسـتی خـوای پەروەردگار فریشتەكانی بۆ ڕەوان كردن تاپێ یان بڵێن(من لە گەڵ ئێوە دام كەواتە ئێوەش بڕواداران بە هێز بكەن).

٨) **گیان كێشـان**: ئەمەشـیان فریشـتەیەك پێـی هەڵدسـتێ كـە پێـی دەڵـێن: (**ملك الموت**) هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿قُلْ يَتَوَفَّاكُم مَلَكُ الْمَوْتِ...﴾ السجدة ١١. واتـه: پێ یان بڵێ ئەی(**محمد**): كەوا (**ملك الموت**) گیانتان دەكێشێ.

٩) **پیاكردنی گیان بەئادەمیزاد**: هەروەك پێغەمبەری پێشەوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقَةُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوماً نُطْفَةً ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِكَ ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِكَ ثُمَّ يُرْسَلُ إِلَيهِ الْمَلَكُ فَيُنْفِخُ فِيهِ الرُّوحَ وَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ، بِكَتْبِ رِزْقِهِ، وَأَجَلِهِ وَعَمَلِهِ وَشَقِيٌّ أَوسَعِيد﴾ رواه البخاري. واتـه: هەریەك لـە ئێـوە لـەنێو سـكی دایكی دا شێوەی دروست كردنەكانی بـە(٤٠) رۆژ كۆدەبێتـەوە، كـە یەكـەم جـار(ئـاوە) ئینجا دەبێتە (**علقة**) ئینجا دەبێتە خوێن پارە (**مضغـة**) ئینجـا فریشـتەیەك دێـت گیـان بـەو كەسـەدا دەكاوێنجـا چـوار شـتی بـۆ دەنوسـێ كـە (بریتـین) لــە ڕۆزی و كــاتی مردنی وبەدبەختی و خۆش بەختی لە كردارەكانی.

١٠) **چـاودێری كردنـی ئـادەمیزاد و كارەكـانی**: هـەروەك خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿لَهُ مُعَقِّبَاتٌ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ يَحْفَظُونَهُ مِنْ أَمْرِ اللهِ﴾ الرعد ١١.واتـه: بـۆ ئـادەمیزاد چـەند فریشـتەیەك هـەن كـە چـاودێرن بەسـەر كارەكـانی پێشـوو و دواوەیـان، كەدەشیان پارێزن بە فەرمانی خوا.

١١) **پرسیاری نێـو گـۆڕ**: ئەمەشـیان دوو فریشـتە پـێ ی هەڵدەسـتن كـە (**نكیر** و **منكـر**)ن. هەروەك پێغەمبەر ﷺ بە عائشەی فەرموو: ﴿إِنَّ صَوتَ مُنْكَرٍ ونَكِيرٍ فِي أَسمَاعِ الْمُؤمِنِينَ

كَالْأُثْمَدِ فِي العَيْن...﴾ الشرح الصدور/ل ٣٤٥، واته: ئەی عائیشە دەنگی (**نكير و منكر**) لەبەر گوێی ئیمانداران سووکە وەکو کلی چاو.

## پ١٦١/ ئایا لەلای خوادا ئادەمیزاد پلەدارترە یان فریشتەکان؟

و: ئادەمیزاد لە لای خوا پایەدار ترە لە فریشتەکان بە چەند خاڵێك کە ئەمانەی خوارەوەن:

١) خوای گەورە کاتێك ئـادەمی دروسـت کـرد ڕووی کـردە فریشـتەکان و پـیێ فـەرموون سوژدەی بۆ بەرن.

٢) خوای گەورە بە ڕەواتری بینی کەوا ئادەمیزاد ببێتە جێ نیشینی ئەو دروست کراوانەی کە لە پێش خۆی هەبوو ون، نەك فریشتەکان.

٣) ئادەم کاتی خۆی فێری زۆر شت کراوە، بەڵام فریشتەکانی فێر نـەکردبوون، وەك خـوای گەورە دەفـەرمووێ: ﴿وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْمَاءَ كُلَّهَا...﴾ البقرة ١٣١. واتـە: ئـادەم فـێری هەموو ناوەکان کرا، بەڵام فریشتەکان ناوەکانیان نەزانی.

٤) ئادەمیزاد ئازادە لەوە کە خوا پەرست بێ یان خوا نـەناس، بـەڵام فریشـتەکان بەتـەنها بـۆ خوا پەرستی دروست کراون و ناتوانن ڕەتی بکەنەوە.

٥) ئادەمیزاد توانای ڕابواردنی هەیە بەڵام فریشتەکان نییانە.

## پ١٦٢/ ئایا فریشتەکان کردەوەکانی دڵ دەنوسن؟

و: **بەڵێ**: هەروەك خوای گەورە لە فەرموودەیەکی قودسـیدا دەفـەرمووێ: ﴿**إِذَا هَمَّ عَبْدِي بِحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا فَاكْتُبُوهَا لَهُ حَسَنَةً، فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا عَشْرًا**﴾ **متفق عليه**.واتـە: ئەگـەر بەندەیەکی خۆم نیەتی کارێکی چاکی هەبوو بەڵام نەی کرد، ئەوا خێری بۆ بنووسن، وە ئەگـەر ئەنجامی دا ئەوا دە خێری بۆ بنووسن.

## پ١٦٣/ ئایـا فریشـــتەکان تـــاوان دەکـــەن؟یـــان مەســـەلەی (هاروت وماروت) کە دەڵێن کاتی خۆی خەڵکیان فێری (سحر) کـردووە، کەچی هەر کەسێك (سحر) بکات لـە دینی خـوا دەردەچێت، ئایا ئەمـە بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی کە فریشتەکانیش تاوان دەکەن؟

و: نەخێر، فریشەکان بە هیچ جۆرێك ناتوانن تاوان وسەرپێچی بکەن. هەروەك خوای گـەورە دەفەرمووێ: ﴿لَا يَعْصُونَ اللهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَـفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾ التحریم ٦. واتە: فریشتەکان یاخی نابن لە فەرمانی خوا، وە هەرچی کارێك کە پێیان دەسپێردرێ زوو جێبەجێی دەکەن.

بەڵام ئەم قـسەیەی کە دەربارەی (هاروت و ماروت) دەیکەن، هیچ ڕاستییەکی نییە، بـەڵکو کاتی خۆی جولەکەکان درۆیەکیان هەڵبەستبوو کە گوایە دوو فریشتە کە ناویان (هاروت مـاروت) بوو خەڵکیان فێری جادوو (سحر) کردووە، ئینجا گوتوویانە ئێمە بۆ ئەوە هاتووین تـاوەکو کەسێك

فێری جادوو بکەین ئینجا تاقی بکەینەوە تا بزانین. کامیان جادووەکە دەکەن تا بەکافری حسێب بکەین و ئەو کەسەش فێر دەبێ و نایکات بە بڕواداری بهێنینەوە. قورئان ئەم قسەیە بە درۆ دەخاتەوە هەروەك دەفەرمووێ: ﴿وَمَا أُنزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّى يَقُولَا إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِ بَيْنَ الْمَرْءِ وَزَوْجِهِ وَمَا هُمْ بِضَارِّينَ بِهِ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ...﴾ البقرة ١٠٢. واتە: هیچ جۆرە جادوویەك نە نێرراوەتە خوارەوە لە بابل بۆ سەر هاروت و ماروت (کە گوایە دوو فریشتە بوون)، وە (ئەمانە) کەسیان فێر نەکردووە تا پێیان بڵێن: ئێمە هەر تاقی کەرەوەی (ئادەمی)ن کەواتە بێ بڕوا مەبە، ئینجا فێری جادووی وا ببن لێیانەوە کە ژن و مێردی پێ لە یەك بکەن، ئەوان بەم جادووە ناتوانن زیان بەکەس بگەیەنن مەگەر بە خواستی خوا.

## پ١٦٤/ ئەی بۆچی (ابلیس) لە فەرمانی خوا یاخی بوو؟

و: ڕاستە، بەڵام خۆ ئیبلیس فریشتە نەبوو، بەڵکو لە جنۆکەکان بوو، واتە لە ڕەگەزی فریشتەکان نەبوو، هەروەك بۆ خۆی دەڵێ: ﴿خَلَقْتَنِي مِنْ نَارٍ وَخَلَقْتَهُ مِنْ طِينٍ﴾ ص٧٦.

واتە: منت لە ئاگر دروست کردووە و ئەوت لە قوڕ دروست کردووە، لە پێشدا دیارکەوت کەوا فریشتە لە (نور) دروست کراون نەك لە ئاگر.

## پ١٦٥/ گرنگی باوەڕ بوون بە فریشتەکان چییە؟

و: گرنگی باوەڕ هێنان بە فریشتەکان بریتین لە:

١) دەزانین خوا زۆر گەورەیە و بە هێز و دەسەڵاتە، چونکە گەورەتی بە دیهێنرا و (مخلوق) لەگەورەیی (خالق)ە.

٢) سوپاس کردنی خوا لەسەر ئەوەی کە بایەخ بە نەوەی ئادەم دەدا، وەکو ئەوە دەبینی هێندێ فریشتە عایدی ئەوەیە مرۆڤ دەپارێزێ، هێندێکیان کردەوەکانی مرۆڤ دەنووسن، جگە لەوانەش گەلێ بەرژەوەندی تری مرۆڤی تێدایە.

٣) خۆشی ویستنی فریشتەکان لەسەر ئەوە کە هەڵدەستن بەبەندایەتی کردنی خوا...

# بەشی یازدەیەم

# حەقیقەتی جنۆکە و شەیتان

## پ١٦٦/ جنۆکە (جنّ) کێن؟

و: جۆرێکن لە دروست کراوەکانی خوا، کەوا لە (ئاگر) دروست بوونە، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَخَلَقَ الْجَانَّ مِنْ مَارِجٍ مِنْ نَارٍ﴾ الرحمن ١٥. واتە: جنۆکە لە بڵێسە و دوکەڵی ئاگر دروست کراون.

## پ١٦٧/ بۆ چی دروست کراون؟

و: بۆ خوا پەرستی هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ الذاریات ٥٦.

واتە: ئێمە جنۆکە و ئادەمیزادمان بۆ هیچ شتێ دروست نەکردووە تەنها بۆ خواپەرستی نەبێ.

## پ١٦٨/ ئایا ئادەمیزاد پێش تر دروست کراون یان جنۆکە؟

و: جنۆکە لە پێش تر دروست کراون، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ صَلْصَالٍ مِنْ حَمَإٍ مَسْنُونٍ، وَالْجَانَّ خَلَقْنَاهُ مِنْ قَبْلُ مِنْ نَارِ السَّمُومِ﴾ الحجر٢٦-٢٧. واتە: بێگومان ئێمە ئادەمیزادمان لە قورێکی ووشك دروست کردووە، وە جنۆکەشمان لە پێش ئادەمیزاد لە ئاگرێکی دوکەڵدار دروست کردووە.

## پ١٦٩/ چۆن دەزانی کەوا جنۆکە هەیە؟

و: خوای گەورە جگە لەوەی کە سورەتێکی بەناو کردوون دەش فەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ الذاریات ٥٦. (لە پێش دا تەفسیر کراوە)

## پ١٧٠/ ئایا جنۆکە لە غەیب دەزانن؟

و: نەخێر هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿عَالِمُ الْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَى غَيْبِهِ أَحَدًا إِلَّا مَنِ ارْتَضَى مِنْ رَسُولٍ فَإِنَّهُ يَسْلُكُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ رَصَدًا﴾ الجن ٢٦-٢٧. واتە: هەر خوایە ئاگادارە بە نهێنییەکان و کەسیش ئاگادار ناکا بەسەر نهێنی خۆیا، مەگەر پێغەمبەرێکی هەڵبژێردرا و نەبێ، بێگومان خوا چاو دێری خۆی کە (فریشتەکانە) لەبەردەم و پشتی ئەم پێغەمبەرە

داناوه، واته خوا كه پێغەمبەرێكی نارد، یەكێكی وا هەڵدەبژێرێ كه بتوانێ ئەم بارە گرانە هەڵگرێ بە تەواوی.

## پ١٧١/ پەیوەندی جنۆكە بە ئادەمیزاد چییە؟

و: پەیوەندی هەیە لە نێوان جنۆكە و ئادەمیزاد، بەڵام ئەم پەیوەندییە تایبەتە و لە ئادەمیزادێك بۆ ئادەمیزادێكی تر جیایە، جنۆكە لەگەڵ ئێمە دادەنیشێ و نان و ئاو دەخوات، جنۆكە كافری هەیە و بڕواداری هەیە، ئەوانەی كافر بوونە خۆیان لە ڕێگەی (**وسوسە**)وە بەسەر ئادەمیزاد دەسەپێنن، هێندێك جاران جنۆكە چەند زانیارییەك لە فریشتەكان دەدزن و دەیخەنە گوێی فاڵچی و جادووكەرەكانەوە، بۆیە هێندێ جار كەوا فاڵچی قسەیەك دەكات و ڕاست دەردەچێ ئەوە هی ئەوەیە، بەڵام مەرج نییە هەموو قسەیەكیان ڕاست دەربچێ، بەڵكو لە پەنای ڕاستییەك سەد درۆیان وەگەڵ دەخەن بەم جۆرە گەمە لەگەڵ مێشكی پیاوو ژنە ئادەمیزادەكان دەكەن، تا بڵاو دەبێتەوە كەوا جنۆكە دەستی هەیە لە سوود و زیان گەیاندن بە ئادەمیزاد.

## پ١٧٢/ شەیتانەكان (الشیاطین) كێن؟

و: (الشَّیَاطِین) كۆی (**شیطان**)ە كه لە بنچینەوە لە (**شَطَنَ**) هاتووە واتە (**ابتعد**) یانی دوور كەوتنەوە لە ڕەحمەتی خوا، كەواتە هەركەسێك لە خوا یاخی بێ چ ئادەمیزاد چ جنۆكە ئەوا پێیان دەڵێن (الشیاطین) سەركردەی هەمووشیان (**شەیتان**)ە ئەگەر فریشتەكان گشتیان سەرباز و نوێنەری خێر و چاكەی خوا بن، ئەوا شەیتان و ئەو شەیتانانەی كه لەگەڵ ئەون گشتیان دوژمنی خوان و نوێنەری شەڕو ئاژاوەن.

## پ١٧٣/ ئایا ئادەمیزاد بەردەوام شەیتانێكی لەگەڵە یان نا، بە بەڵگەوە ئەوە بسەلمێنە؟

و: بەڵێ، هیچ ئادەمیزادێك نییە كەوا شەیتانێكی لەگەڵدا نەبێ، هەتا پێغەمبەرانیش (علیهم الصلاة والسلام) لەگەڵیانە. هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿**وَكَذَلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَاطِينَ الإِنْسِ وَالْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُورًا**﴾ الانعام ١١٢، واتە: بەم شێوەیە ئێمە بۆ هەموو پێغەمبەرێك شەیتانی جنۆكە و ئینسانمان داناوە، كه هێندێك هێندێكیان فریو دەدەن بە قسەی ڕازێنراو. هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿**مامِنْكُمْ مِنْ اَحَدٍ اِلاَّ وَقَدْ وكِّلَ بِهِ قَرِينُ مِنْ الْجِنِّ. قَالوا: وإِياكَ يا رَسُولَ اللهِ؟ قالَ: وَإِيَّايَ اِلاَّ إِنَّ اللهَ اَعانَنِي عَلَيْهِ فَأَسْلَمَ فَلا يأمُرني اِلاَّ بِخَيْر**﴾ رواه مسلم. واتە: هەریەك لە ئێوە برادەرێكی جنۆكەی لەگەڵ دایە، گوتیان تۆش ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی بەڵێ، بەڵام من خوا یارمەتی دام بەسەریا و تەسلیم بوو و ئێستاش لە خێر زیاتر هیچم پێناڵێ...

## پ١٧٤/ ئایا شەیتان دەتوانێ هەموو کەس لە خشتە بەرێ؟

و: نەخێر، تەنها ئەوانە نەبن کە پشت لە ئایینی خوا دەکەن. هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ إِلَّا مَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْغَاوِينَ﴾ الحجر ٤٢. واتە: تۆ دەسەلاتت بەسەر بەندەکانی مندا نی‌یە تەنها ئەو گومڕایانە نەبێت کە بەدوای تۆ کەوتوون.

## پ١٧٥/ خوای پەروەدگار چۆن باسی شەیتانمان بۆ دەکات لەومان ئاگادار دەکاتەوە؟

و: خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذُوهُ عَدُوًّا إِنَّمَا يَدْعُو حِزْبَهُ لِيَكُونُوا مِنْ أَصْحَابِ السَّعِيرِ﴾ فاطر ٦. واتە: بەڕاستی شەیتان دوژمنی ئێوەیە، دە ئێوەش بە دوژمنی خۆتانی دابنێن، چونکە شەیتان داوا لە پیرەکەی خۆی دەکات بۆ ئەوەی بیانکات بە هاوەڵانی دۆزەخ.

هەروەها دەفەرمووێ: ﴿يَا بَنِي آدَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ الشَّيْطَانُ كَمَا أَخْرَجَ أَبَوَيْكُمْ مِنَ الْجَنَّةِ﴾ الاعراف ٢٧. واتە: ئەی نەوەی ئادەمی با شەیتان فریوتان نەدات هەروەك فریوی دایك و باوكی ئێوەی دا.

## پ١٧٦/ ئایا ئەو شێوەزانە چین کە شەیتان دەیگرێتە بەر بۆ فریودانی ئادەمیزاد؟

و: خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا باسی شەیتانمان بۆ دەکات کە چۆن خۆی یە دەمی خۆی گوتوویەتی: ﴿قَالَ فَبِمَا أَغْوَيْتَنِي لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَاطَكَ الْمُسْتَقِيمَ﴾ الاعراف ١٦. واتە: گوتی لەبەر ئەوەی منت لە ڕێ لادا، (منیش) بۆیان دادەنیشم و ڕێگا ڕاستەکەی تۆیان لێ‌دەگرم. جا لەبەر ئەوە شەیتان چەند شێوازێك بە هەنگاو بۆ لە خشتە بردنی ئینسانی گرتۆتە بەر، بۆ نموونە.

١) **هەنگاوی یەکەم**: شەیتان لە هەموو لایەکەوە بۆ ئینسان دێت، بۆ ئەوەی کافری‌کات یان بیکاتە (**مشرك**)، بەڵام ئەگەر ئەم ئینسانە موسڵمان بێت ئەوا بە شێوازێکی تر لە قۆناغێکی گونجاوەوە بۆی دێت و هەوڵی تەفرەدانی دەدات.

٢) **هەنگاوی دووەم**: بریتی‌یە لە قۆناغی (بیدعە)، کەوا لە ئینسان دەکات کە پەل بۆ بیدعە بیات و ببێتە بیدعە چی‌یەکی نە قۆلاً، جا ئەگەر ئەم ئینسانە لە ئەهلی سووننە و جەماعە بوو ئەوا لە قۆناغێکی وەك سی‌یەما بۆی دێت.

٣) **هەنگاوی سێیەم**: قۆناغی گوناهە گەورەکان (**الكبائر**) کە بریتی‌یە: لە قۆناغی یاخی بوون، واتە شەیتان هەوڵی ئەوە دەدات کە گوناهی پێ‌بکات، بەڵام ئەگەر شەیتان ئەوەی پێ لەگەڵ نەکرا، ئەوا لە ڕێی ترەوە بۆی دەچێت.

٤) **هەنگاوی چوارەم**: قۆناغی گوناهە بچوکەکان (**السيئات**)، واتە هەوڵی ئەوەی لەگەڵ دەدات کە گوناهی (بچووك)ی پێبکات، بەڵام ئەگەر لەم ڕووەوەش نەیتوانی زەفەری پێببات ئەوا ئەم ئینسانە خەریك دەکات بە چەند شتێکی تر.

٥) **هەنگاوی پێنجەم**: ئەمەشیان قۆناغێکە تیایا شەیتان وا لە ئینسان دەکات کە خەریکی کات، کە (**کات بە فیرۆ**) بدا و بە شتە (**مباح**)ەکانی خەریك بکات.

٦) **هەنگاوی شەشەم**: بەڵام ئەگەر شەیتان هەر هیچی پێ لەگەڵ نەکرا ئەوا هەوڵی ئەوەی لەگەڵ دەدات کە ئەم ئینسانە لەبەر سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ ئاگای لە واجیەکان ببڕێ، واتە وای سەر قاڵی دەکات بە بەندایەتی بچوکەوە کە گەورەکانی بۆ نەکرێت، بۆ نموونە سوننەتی سادەی لێدەکات بەڕاتب و ڕاتبی لە بیر دەباتەوە یان بە سوننەتی ڕاتبەوە ئەوەندە سەرقاڵی دەکات کە فەرزی لەبیر بچێتەوە وەك ئەو کەسەی کە شەوان زۆر خەریکی وێرد و تەسبیحات دەبێت تا بەشێکی گرنگی شەو دەچێت و کاتی خەوت، بۆ نوێژی بەیانی بە خەبەر نایەت و خۆیشی ئەمە دەزانێ.

## پ١٧٧/ ئایا شەیتان لە چ دەرگایەك بۆ لە خشتە بردنی ئینسان دێتە پێش؟

و: شەیتان زۆر شێوازی هەنە بۆ لە خشتە بردنی ئینسان لەوانە:

١) **ڕازاندنەوەی کاری نابەجێ**: هەروەك خوای گەورە لەسەر زمانی شەیتان دەفەرمووێ: ﴿قَالَ رَبِّ بِمَا أَغْوَيْتَنِي لأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِي الأَرْضِ وَ لأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ إِلاَّ عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ﴾ الحجر ٣٩-٤٠. واتە: ئەی پەروەردگار لەبەر ئەوەی گومڕات کردم، منیش لەسەر زەوی کاری خراپیان بۆ دەڕازێنمەوە و هەر هەموویان گومڕا دەکەم، تەنها بەندە خواناسەکانی تۆ نەبێ لەوان.

٢) **لێزیاد کردن و لێکەم کردن**: هەر کاتێك خوا فەرمانی کرد بە بەندەکانی، ئەو دەمە شەیتان هەوڵی لە تەفرە دانییان دەدات.. کاتێك کە بەندەیەکی خوا (٤) ڕکات نوێژ بکات شەیتان وەسوەسە دەخاتە دڵی و پێی دەڵێ ڕکاتێکی زیاد بکات، یان کاتێك ئەو بەندەیە دەیەوێت خێرێك بکات و یارمەتی هەژارێك بدات، ئەو دەمە شەیتان دەچێتە ناو دڵی و پێی دەڵێ تۆ ئەگەر ئەو پارەیە ببەخشیت ئەوا ماڵ و منداڵت لە برسان دەمرن...هتد.

٣) **وا لە ئینسان دەکات کە تەمبەڵی بکات لە خێر و چاکە**: هەروەك ڕۆژێك بە پێغەمبەری خوایان گوت ﷺ کەوا فلانە پیاو شەوێ خەوتووە تا ڕۆژ هەڵاتووە لە خەو هەستاوە و نوێژی بەیانی لە کیس چووە، ئەویش فەرمووی: ﴿ذَلِكَ رَجُلٌ بَالَ الشَّيْطَانُ فِي أُذُنَيْهِ﴾ البخاري. واتە: ئەوا ئەم پیاوە شەیتان میزی لە گوێکانی کردووە.

٤) **پەیمانی بەدرۆدان:** شەیتان زۆر پەیمان بە ئینسان دەدات، بەڵام هیچی نایەنەتە جێی بۆ ئەوەی بەردەوام لە خشتەی بەرێ. هەروەك خوای گەورەش دەفەرمووێ: ﴿وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ وَقَالَ لاَ غَالِبَ لَكُمُ الْيَوْمَ مِنَ النَّاسِ وَإِنِّي جَارٌ لَّكُمْ، فَلَمَّا تَرَاءَتِ الْفِئَتَانِ نَكَصَ عَلَى عَقِبَيْهِ وَقَالَ إِنِّي بَرِيءٌ مِّنكُمْ...﴾ الانفال ٤٨. واته: شەیتان کارەکانی بۆ ڕازاندوونەوە، دەڵێ ئیمڕۆ هیچ کەس بەسەر ئێوەدا زاڵ نابێ، من لە تەك ئێوەم، بەڵام کاتێ چاوی کەوت بەکۆمەڵی ئیمان و کۆمەڵی کوفر یەکسەر بە پاژنە پێ گەڕایەوە و گوتی من لە ئێوە بەریم.

٥) **ڕازاندنەوەی بەناو ئامۆژگاریەکانی بۆ ئینسان:** هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَقَاسَمَهُمَا إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ النَّاصِحِينَ﴾ الاعراف ٢١. واته: شەیتان سوێندی خوارد بۆ ئادەم و حەوا و گوتی من ئامۆژگاریتان دەکەم.

٦) **پلە پلە لەگومڕاکردن:** شەیتان یەکسەر نایەت ئینسان لە خشتە ببات بەڵکو قۆناغ بە قۆناغ لە خشتەی دەبات، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿فَلَمَّا زَاغُوا أَزَاغَ اللهُ قُلُوبَهُمْ...﴾ الصف ٥. واته: کاتێ کە لایاندا خواش دڵی وەرگێڕان.

٧) **وا لە ئینسان دەکات تاوەکو خوا پەرستی لەبیر بکات و ئاگای ببڕێ لە ئیسلام:** هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿اسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ الشَّيْطَانُ فَأَنسَاهُمْ ذِكْرَ اللهِ...﴾ المجادلة ١٩. واته: شەیتان سواری منیان بووە و زیکری خوای لە بیر بردوونەوە.

٨) **ترساندنی بڕواداران و دۆستانی خوا:** هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّمَا ذَلِكُمُ الشَّيْطَانُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءَهُ فَلاَ تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِنْ كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ آل عمران١٧٥. واته: بێگومان شەیتان دۆستەکانی خوا دەترسێنێ، کەواتە ئێوە لێیان نەترسن بەتەنها لەمن بترسن ئەگەر بڕوادارن.

٩) **دەچێتە نێو دەروونی ئینسان، لەو دەرگایەی کە ئینسان پێیەوە سەرقاڵە:** هەروەك خوای گەورە لەسەر زمانی شەیتان دەفەرمووێ: ﴿...وَقَالَ مَا نَهَاكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ إِلاَّ أَنْ تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ الْخَالِدِينَ﴾ الاعراف ٢٠. واته: شەیتان بە (ئادەم وحەوای) گوت: خوای گەورە ئێوەی لەم دارە بەرگری نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێ کە ئێوە نەبن بە دوو فریشتە یان بە نەمری نەمێننەوە.

١٠) **دروست کردنی گومان و شوبوهات:** هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿يَأْتِي الشَّيْطَانُ أَحَدَكُمْ فَيَقُولُ: مَنْ خَلَقَ كَذَا؟ حَتَّى يَقُولُ مَنْ خَلَقَ رَبَّكَ؟ فَإِذَا بَلَغَهُ فَلْيَسْتَعِذْ بِاللهِ وَلْيَنْتَهِ﴾ البخاري ومسلم. واته: شەیتان دێتە لای یەك لە ئێوە و دەڵێ: کێ ئەوەی دروست کردووە؟ کێ ئەوەی دروست کردووە؟ هەتا دەڵێ: ئەی کێ خوای دروست کردووە؟ ئەگەر گەیشتە ئەم پرسیارە ئێوە پەنا ببەنە بەر خوا، ئەو دەمە شەیتان واز دەهێنێ.

١١)**له ڕێگەی ئارەق و قومار**: هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ...﴾ المائدة ٩١. واتە: بەڕاستی شەیتان دەیەوێ دوژمنایەتیتان بخاتە نێوان لە ڕێگەی ئارەق خواردنەوە و قومارکردنەوە.

١٢)**له ڕێگەی سیحرەوە**: هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿...وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَانُ وَلَكِنَّ الشَّيَاطِينَ كَفَرُوا يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ...﴾ البقرة ١٠٢. واتە: حەزرەتی سولەیمان (**علیه السلام**) کافر نەبوو، بەڵکو شەیتانەکان بۆ خۆیان کافر بوون بە هۆی ئەوەی کە خەڵکیان فێری سیحر دەکرد.

١٣)**شەیتان لە ڕێگەی خاڵە لاوازەکانی ئینسان دەتوانێ خەڵکی لە خشتە ببات**: خاڵە لاوازەکانیش بریتین لە: (**لاوازی، بێهیوای، چاوتەنگی، خۆ بەزل زانین، دڵ ڕەقی، زمان درێژی، سپڵەی، گومانی زیاد، نەزانی**...هتد).

١٤)**ئافرەت و خۆش ویستنی دونیا**: هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿الْمَرْأَةُ عَوْرَةٌ فَإِذَا خَرَجَتْ إِسْتَشْرَفَ عَنْهَا الشَّيْطَانُ﴾ رواه الترمذي وهو حديث حسن صحيح. واتە: ئافرەت عەورەتە، کاتێ کە دەرچوو شەیتان سەر پەرشتی دەکات.

١٥)**ترساندن بە هەژاری**: هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمُ الْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِالْفَحْشَاءِ...﴾ البقرة ٢٦٨. واتە: شەیتان هیواتان پێدەدا (دەتان ترسێنێ) بە هەژاری و فەرمانی داوێن پیسیتان پێدەکات.

## پ١٧٨/ ئەو چەکە چی‌یە کە بەرنگاری شەیتانی پێدەبیتەوە؟

و: ئەو هۆیانەی کە دەبنە هۆی ئەوەی کە شەیتانی (نەفرەت لێ کراو) نەتوانێ لە خشتەمان بەرێ بریتین لە:

١) **ئاگا لە خۆ بوون لە فێڵەکانی شەیتان**: چونکە شەیتان ناخەوێ شەو و ڕۆژ هەوڵی تەفرەدانمان دەدات..هەروەك ڕۆژێکیان لە شێخ (**حسن البصري**) یان پرسی: (أَيَنَامُ إِبْلِيسُ؟ قَالَ لَوَجَدْنَا رَاحَةً) واتە: ئایا شەیتان دەخەوێ، ئەویش فەرمووی: ئەگەر بخەوتبایە ئێمە دەحەواینەوە.

٢) **پابەند بوون بە قورئان سوننەتە بەرێزەکانی پێغەمبەر ﷺ**: چونکە قورئان پێمان دەڵێ: ﴿...وَلَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ﴾ البقرة ٢٠٨. واتە: بەدوای هەنگاوە فریودەرەکانی شەیتان مەکەون، چونکە شەیتان دوژمنی ئاشکرای ئێوەیە.

٣) **خۆ پاراستن بە خوای تاك و تەنیا**: هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ﴾ فصلت ٣٦. واتە: کاتێ کە شەیتان ویستی فریوت بدات تۆش پەنا ببە بەر خوا.

٤) **خۆ خەریک کردن بە زیکری خوا**: هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ وَاشْكُرُوا لِي وَلَا تَكْفُرُونِ﴾ البقرة ١٥٢. واتە: یادم بکەن یادتان دەکەم، سوپاسم بکەن و کوفرانەم مەکەن.

٥) **پابەند بوون بە جەماعەوە**: هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ: ﴿فَعَلَيْكُمْ بِالْجَمَاعَةِ فَإِنَّمَا يَأْكُلُ الذِّئْبُ مِنَ الغَنَمِ القَاصِيَةَ﴾ رواه أبو داود والنسائي بأسناد حسن. واتە: پا بەندی جەماعە بن چونکە گورگ پەلاماری مەڕێك دەدات و دەیخوا کە لە مێگەل دابڕا بێ.

٦) **جولانەوە بە پێچەوانەی خواستی شەیتان**: هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿لِيَأْكُلْ أَحَدُكُمْ بِيَمِينِهِ، وَيَشْرَبْ بِيَمِينِهِ، وَلْيَأْخُذْ بِيَمِينِهِ، واليعْطِ بِيَمِينِهِ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَأْكُلُ بِشِمَالِهِ، وَيَشْرِبُ بِشِمَالِهِ وَيَعْطِي بِشِمَالِهِ، وَيَأْخُذُ بِشِمَالِهِ﴾. رواه ابن ماجه باسناد صحيح، واتە: با لە ئێوە بە دەستە ڕاست نان بخوات وبە دەستە ڕاست بخواتەوە و بە دەستە ڕاست وەربگرێ، چونکە شەیتان بە دەستی چەپ دەخوا و بە دەستە چەپ دەخواتەوە و بە دەستە چەپ دەبەخشێ و بە دەستە چەپیش وەردەگرێ.

٧) **بڕوا بوون بە خوا**: هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّهُ لَيْسَ لَهُ سُلْطَانٌ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ النحل٩٩. واتە: شەیتان هیچ دەسەلاتێکی بەسەر بڕواداران و ئەوانەی کە پشتی خۆیان بە خوا دەبەستن نی‌یە.

٨) **یەکلا بوونەوە بۆ خوا**: هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ﴾ الحجر ٤٠. واتە: تەنها شەیتان دەسەلاتی بەسەر بەندە چاکەکانی خوا نی‌یە.

٩) **تۆبە و پەشمانی**: هەروەك خوای گەورە کاتێك لە ئادەم و حەوا خۆش بوو کە پەشیمان بوونەوە لە تاوانەکانیان و گوتیان: ﴿رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنْفُسَنَا وَإِنْ لَمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ الاعراف ٢٣. واتە: ئەی خوایە ئێمە (زوڵم)مان لە خۆ کرد ئەگەر تۆ لێما خۆش نەبیت و ڕەحمان پێ نەکەیت ئێمە لە خەسارەت مەندەکان دەبین.

## پ١٧٩/ ئەی کەواتە خوا بۆ شەیتانی دروست کردووە؟

و: فریشتە پاکترین دروست کراوی خوان و داوای شتی پاکیش دەکەن، بەهەمان شێوە شەیتانەکان خراپترین و بەدکارترین دروست کراوی خوان و داوای کاری خراپ دەکەن. ئادەمیزاد لە نێوان ئەمانەدا خاوەن وویست و بیرکردنەوەی خۆیەتی، دەتوانێ بە وویستی خۆی ڕێگای فریشتەکان هەڵبژێرێ وتاوەکو دوا ڕۆژ بچێتە بە هەشت. بەهەمان شێوە دەتوانێ بە وویستی خۆی ڕێگای شەیتان بگرێتە بەر و بەرە و دۆزەخ هەنگاو بنێت، لێرەدا ئادەمیزاد خاوەن وویستی خۆیەتی، خوای گەورەش ئاگاداری دەکاتەوە کەوا ڕێگای شەیتان نەگرێتە بەر، چونکە شەیتان هۆیەکە لە هۆیەکانی تاقی کردنەوەی مرۆڤ لەم ژیانەدا.

# بەشی دوازدەیەم

# باوەڕ هێنان بە کتێبەکانی خوا

## پ١٨٠/ باوەڕ هێنان بە کتێبەکانی خوا چی دەگرێتەوە؟

و: باوەڕهێنان بەکتێبەکانی خوا ئەمانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

١) باوەڕێکی تەواو بەوە کە گشت کتێبەکان لەلای خوا هاتوون بۆ پێغەمبەران و لەوانیشەوە بۆ بەندەکانی خوا، بە ئامانجی ڕێنموونی بۆ کاری چاك وچەسپاندنی یەکخواناسی.

٢) باوەڕبوون بەوە کە گشت کتێبەکان گوتەی خوان.

٣) باوەڕهێنان بەهەموو ئەو شەریعەتانەی کە لە قورئان دا هاتوون.

٤) باوەڕهێنان بەوە کەگشت کتێبە ئاسمانی‌یەکان یەکتر بەڕاست دەزانن.

٥) باوەڕهێنان بەوە کەهێندێك هێندێکیان نەسخ کردۆتەوە.

٦) باوەڕهێنان بەوە کە هیچ کتێبێکی تر لەدوای قورئان نایەت تاوەکو (نسخ)ی بکاتەوە.

٧) باوەڕهێنان بەگشت کتێبەکان و ئەوانەی کە تیایاندا هاتوون، کتێبەکانیش بریتین لە (**قورئان**) کە بۆ (**محمد**) ﷺ هاتۆتە خوارەوە.(**تەورات**) بۆ (**موسی**) و (**ئینجیل**) بۆ (**عیسی**) و (**زەبور**) بۆ (**داود**) و (**صحف**) بۆ (**ابراهیم** و **موسی**) (**علیهم الصلاة والسلام**) هاتۆتە خوارەوە.

٨) باوەڕهێنان بەوە کە قورئان هەموو کتێبەکانی تری (**نسخ**) کردۆتەوە و بەتەنها حوکم بەویش دەکرێ. ئەگەر پێغەمبەران زیندووببنەوە، هەردەبێ حوکم بەوبکەن.(**عیسی**) ؑ دوای هاتنە خوارەوەی لە ئاسمان حوکم بە قورئان دەکات.

## پ١٨١/ ئایا بۆچی ئەو کتێبانەی کەدەهاتنە خوار، دوا بەدوای ئەوان کتێبێکی تر دەهاتە خوارەوە گشت ئەوانی تری(نسخ) دەکردەوە؟

و:

هەر کتێبێکی ئاسمانی کە دەهاتە خوارەوە لەگەڵ ئاستی ژیری خەڵکەکە دەدوا، بەڵام لەبەر ئەوەی زانیاری بەردەوام بەرەو پێش دەچێت، بۆیە خوای گەورە کتێبێکی تری دەهێنا خوار بۆ ئەوەی لەگەڵ زانستی ئەم خەڵکە بگونجێ، ئینجا کە قورئانیش هاتە خوارەوە بەجۆرێ وابوو کە هەرچەند زانست و زانیاری پێش کەوێ لە سنووری ئەم قورئانە دەرنەدەچووو دەریش ناچێ.

چونکه کتێبەکانی پێشوو گشتیان لە سەر دەستی پێشەوا نابینی [illegible]
ئەم کاتی تێك دەچوو، (**چونکە عەجایەب نیە کە کاتێ پێشەوایانی نابینی ساتمەیان برد میللەتێک لە دوای ئەوان ساتمە بەرن، - لەکوردستانی خۆشمانا زۆر لە تەرزە پیاوی وا هەن کە بارن بەسەر دینەکەوەو خۆیان کردۆتە چاوساغی ئەم دینە بەلام عەجایەب لەوە دایە کە ئەحمەدی مفتی زادە بەرەحمەت بێ دەڵێ: ئەمان هەر هەن و دینی ئیسلامیش هەر وەک خۆی ماوە**) بەلام ئەمە عەجایەب نابێ چونکە کە بۆ دوا جار خوای گەورە قورئانی ناردەخوارەوە بۆخۆشی پارێزگاری لێدەکات و بە جۆرێ کە بەهیچ سەر لێ شێواوێك تێك نەچێ، هەروەك دەفەرمووێ: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾ الحجر٩. واتە: ئێمە بۆخۆمان قورئانمان ناردۆتە خوارەو، هەر بۆخۆشمان پارێزگاری لێدەکەین.

## پ١٨٢/ قورئان بە چەند قۆناغ هاتۆتە خوارەوە؟

و: قورئان بەسێ قۆناغ هاتۆتە خوارەوە:

١) **قۆناغی یەکەم:** قورئان هاتۆتە (**اللوح المحفوظ**) بە بەڵگەی ئەم ئایەتە: ﴿بَلْ هُوَ قُرْآنٌ مَجِيدٌ، فِي لَوْحٍ مَحْفُوظٍ﴾ البروج ٢١-٢٢. واتە: ئەم کتێبە قورئانێکی بەرزە لە (**لوح المحفوظ**)ە واتە بۆ یەکەم جار ئەم قوران لەلای خوا هاتۆتە (**لوح المحفوظ**).

٢) **قۆناغی دووەم:** لە (**لوح المحفوظ**)ەوە هاتۆتە (**بيت العز**) لە ئاسمانی دونیا، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّا أَنْزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ﴾ القدر ١. واتە: ئێمە قورئانمان لە شەوێکی پیرۆزەوە بۆ (**بيت العز**) ناردە خوارەوە...

٣) **قۆناغی سێیەم:** کە دوا قۆناغە ئەویش لە (**بيت العز**)ەوە لە ڕێگەی (**جبریل**)ەوە عليه السلام هاتە نێو دڵی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ، هەر وەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ عَلَى قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنْذِرِينَ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُبِينٍ﴾ الشعراء ١٩٣-١٩٥. واتە: جبریل عليه السلام قورئانی بۆ نێو دڵی تۆ هێنا خوارەوە بۆ ئەوەی بەزمانێکی ڕوونی عەرەبی ببیت بە ترسێنەرانی (خەڵکی).

## پ١٨٣/ قورئان چەند ناوی هەیە؟

و: قورئان زۆر ناوی هەیە گشتیشیان پێناسن بۆ قورئان:

بۆ نموونە:

١) **قورئان**: ﴿إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ﴾ الاسراء٩.

٢) **الكتاب**: ﴿لَقَدْ أَنْزَلْنَا إِلَيْكُمْ كِتَابًا فِيهِ ذِكْرُكُمْ﴾ الانبياء١٠.

٣) **الفرقان**: ﴿تَبَارَكَ الَّذِي نَزَّلَ الْفُرْقَانَ عَلَى عَبْدِهِ لِيَكُونَ لِلْعَالَمِينَ نَذِيرًا﴾ الفرقان ١.

٤) **الذكر**: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾ الحجر ٩.

٥) التنزيل: ﴿وَإِنَّهُ لَتَنْزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ الشعراء ١٩٢
٦) شكۆمەندی (مجيد) ﴿بَلْ هُوَ قُرْآنٌ مَجِيدٌ﴾ البروج ٢١. واتە: ئەم قورئان (قورئانێکی) خاوەن پایەو شکۆمەندە.
٧) موژدەدەر (بشير) و ترسێنەر (نذير): ﴿كِتَابٌ فُصِّلَتْ آيَاتُهُ قُرْآناً عَرَبِيّاً لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ بَشِيراً وَنَذِيراً﴾ فصلت ٣-٤. واتە: (ئەم کتێبە) کتێبێکە کە ئایەتەکانی جیا کەرەوەی هەق و ناهەقن، (ئەم قورئانە) قورئانێکە بۆئەوکەسانەی کە دەزانن، موژدە دەرو ترسێنەرە.

## پ١٨٤/ ئایا کەس دەتوانێ کتێبێك وەك ئەم قورئانە بنوسێ؟

و: نەخێر، هەر وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لاَيَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيراً﴾الاسراء ٨٨. واتە: ناتوانن وێنەی ئەم قورئانە بهێنن ئەگەر هێندێکیشیان پاڵپشتی هێندێکیان بن.

## پ١٨٥/ ئایا قورئان بۆچی بە یەکجار نە هاتۆتە خوارەوە؟

و: قورئان لەگەڵ ژیانی خەڵکی ئەو کات دەڕۆیشت و وەڵامی ئەو پرسیارانە بوو کە لەکاتی خۆی لە پێغەمبەر ﷺ دەکرا، هەروەها قورئان بەماوەی (٢٣) ساڵ لە مەککە و مەدینە هاتۆتە خوارەوە، کەمێك هاتووە لە(١١٤) سورەت، کە(٨٦)ی لە مەککە و(٢٨)ی لە مەدینە هاتوتە خوارەوە، ئەوانەی کە لە مەککە هاتوون پێیان دەڵێن سورەتی (مكي) ئەوانەی کەلەمەدینە هاتوونە خوارەوە پێیان دەڵێن: سورەتی (مدني).

## پ١٨٦/ ئایا قورئان قسەی خوا (كلام الله) یە یان دروست کراو (مخلوق)ە؟

و: قورئان بریتی یە لە قسەی خوا. هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلاَمَ اللهِ﴾ التوبة ٦. واتە: ئەگەر یەکێك لەموشریکەکان داوای پەناگەی لێ کردی تۆش پەنای بدە تا ئەوکاتەی گوێی لە قسەی خوا (ئایەتەکانی خوا) دەبێ.

## پ١٨٧/ ئایا قورئان بۆچی هاتووە؟

و: بۆکار پێ کردنی، بۆ ئەوەی خەڵکی لە تاریکایی رزگار بکات بەرەو رووناکاییان ببات. هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿فَاقْرَأُوا الْقُرآنَ واعْمَلُوا بِهِ ولاتَأْكُلُوا بِهِ﴾ رواه الامام احمد. واتە: قورئان بخوێنن و کاریشی پێ بکەن، بەڵام بازرگانی پێ مەکەن.

هەروەها خوای گەورە دەفەرمووی: ﴿... كِتَابٌ أَنْزَلْنَاهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ النَّاسَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ﴾ ابراهيم ٢. واتە: ئەم کتێبە کتێبێکە کە بۆ تۆ هاتۆتە خوارەوە (کە قورئانە) بۆ ئەوەیە کەوا خەڵکی رزگار کەیت لە تاریکاییەکانی (نەفامی) بورووناکایی (ئیسلام).

وەهەروەها قورئان بەچەند ناوێکەوە چوێنرایە کەگشتیان بریتین لەتایبەتمەندیەکانی قورئان، بۆنموونە:

١) **چرا (النور)**: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَكُمْ بُرْهَانٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكُمْ نُورًا مُبِينًا﴾ النساء ١٧٤. واتە: ئەی ئادەمی بەراستی پێتان گەیشت بەڵگەی ئاشکرا لەلایەن پەروەردگارتانەوە، وە ناردمانە خوارەوە بۆلای ئێوە رووناکی یەك کەقورئانە.

٢) **رێنمایی (الهدى) و چارەسازی (الشفاء) و خێروخۆشی (الرحمة) و ئامۆژگاری (الموعظة)**، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَتْكُمْ مَوْعِظَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَشِفَاءٌ لِمَا فِي الصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ يونس٥٧. واتە: ئەی خەڵکینە بەراستی بۆ ئێوە ئامۆژگاریتان لەلای پەروەردگارەوە بۆ هاتووە کەوا شیفایە بۆ دڵەکان و رێ نمایی و خێرو خۆشی یە بۆ بروا داران...

٣) **پیرۆزی (المبارك)**: ﴿وَهَذَا كِتَابٌ أَنْزَلْنَاهُ مُبَارَكٌ مُصَدِّقُ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ الانعام ١٩٢. واتە: ئەم کتێبە کتێبێکی پیرۆزە هاتۆتە خوارەوە کەوا هەموو کتێبەکانی پێش خۆشی بەراست دا ئەنێ.

٤) **مژدە (البشرى)**: ﴿مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ البقرة ٩٧. واتە: کتێبەکانی پێش خۆی بەراست دەزانێ و بۆخۆشی رێ نیشان دەرو مژدەیە بۆبڕواداران.

٥) **زاڵ (العزيز)**: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِالذِّكْرِ لَمَّا جَاءَهُمْ وَإِنَّهُ لَكِتَابٌ عَزِيزٌ﴾ فصلت ٤١. واتە: ئەوانەی بڕوایان بەقورئان نی یە لەو کاتەی کە بۆیان هات، بەڕاستی ئەم کتێبە زاڵە بەسەر هەموو کتێبێکی تر.

## پ١٨٨/ بۆچی قورئان لە مەککەوە لەناو عەرەبەکانا بەعەرەبی هات؟

و: لەبەر چەند هۆیەکی سەرەکی گرنگترینیان بریتی یە لە:

١) نیوە دوورگەی عەرەبی و شاری مەککە و دەروو بەری باشترین شوێن و رێ کەوتوترین جیگاو هەڵبژێرراوترین زەوی بوو بۆ هەڵقولاندن و پەرەسەندنی ئاینی پاکی ئیسلام لەو کاتەدا، وەگونجاوترین نوختەبوو بۆ ئەوەی ئەو کاروانە جیهانی یە لەوێ وە دەست پێ بکات.

٢) لەو کاتەوە دەوڵەتێکی دامەزراوو خاوەنی دەستوورو رژێم و سوپاو هێزو دەسەڵات نەبوو لەنیوە دوورگەدا کەبەدەسەڵاتەکەیەوە رابوەستی لەرێی عەقیدەو باوەرەکەداو

گیان لەبەر هەیە لە ئاسمانەکان و لە زەوی گشتیان گیانیان دەردەچێ تەنها ئەوانە نەبێ کە خوا دەیەوێ پاشان فووێکی تر ئەکرێ ئەمجارە هەرچی کە مردووە زیندوو دەکرێتەوە.

## پ٢٢٧/ چی ڕوودەدات کاتێ کە خەڵکی لەناو گۆڕەکانیان هەڵدەستنەوە؟

و: خەڵکی ڕادەکێشرێن بەرەو گۆڕەپانی (مەحشەر) هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَجَاءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَعَهَا سَائِقٌ وَشَهِيدٌ﴾ ق٢١. واتە: هەرچی کەسێك لەم ڕۆژە دوو فریشتەی لەگەڵ دایە یەکیان پەلی گرتووە و ڕایدەکێشێ ئەوی تریش شایەدی کردەوەکانی لەسەر دەدات.

## پ٢٢٨/ ڕۆژی حەشر چی یە؟

و: ڕۆژێکە خەڵکی لەدوای زیندوو بوونەوە کۆ دەکرێنەوە و چاوەڕێی ئەوە دەکەن کە خوای پەروەردگار حسێبیان لەگەڵ بکات. حاڵی ئەم خەڵکەش لەم ڕۆژەدا وەکو حاڵی ئەم ڕۆژەیە کە تیایا لە دایك بوونە. هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿**يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ القِيَامَةِ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلاً. قُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ ﷺ. يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ؟ قَالَ ﷺ: يَا عَائِشَةَ أَلأَمْرُ أَشَدُّ مِنْ أَنْ يَنْظُرَ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ**﴾ مسلم. واتە: خەڵکی کۆدەکرێنەوە لە ڕۆژی دوایی گشتیان پێ خواس ڕووت و قوت و سوننەت نەکراون، (**عائشە**)ش فەرمووی: چۆن تەماشای یەکتر ناکەن؟ ئەویش فەرمووی: نا یا عائیشە بەڵکو ڕۆژەکە زۆر لەوە ناخۆشترە کە تەماشای یەکتر بکەن...

لەم ڕۆژەدا بە تەنها ئادەمیزاد خڕناکرێتەوە، بەڵکو جنۆکە و باڵندە و ئاژەڵیشیان لەگەڵ کۆ دەکرێتەوە، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَإِذَا الْوُحُوشُ حُشِرَتْ﴾ التكوير٥. واتە: کاتێ کە ئاژەڵ کۆکرانەوە...

## پ٢٢٩/ چەند جار فوو بە (صور)دا دەکرێت؟

و: هێندێك لە زانایان دەڵێن (٣) جار فوو بە (صور)دا دەکرێت:

**یەکەم**: خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿فَإِذَا نُفِخَ فِي الصُّورِ نَفْخَةٌ وَاحِدَةٌ، وَحُمِلَتِ الأَرْضُ وَالْجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةً وَاحِدَةً، فَيَوْمَئِذٍ وَقَعَتِ الْوَاقِعَةُ، وَانْشَقَّتِ السَّمَاءُ فَهِيَ يَوْمَئِذٍ وَاهِيَةٌ﴾ الحاقة ١٣-٣٦. واتە: کاتێ کە یەك فوو بە (صور)دا کرا، زەوی و چیاکان بەرز دەبنەوە و بەیەك دا ئەدرێن و بەیەك تەکان زرمەیان لێ هەڵدەستێ لەم ڕۆژە کارەساتی گەورە ڕوودەدات و ئاسمان لەت و پەت دەبێ و سست و بێ کەڵك دەمێنێ.

**دووەم**: خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنْظُرُونَ﴾ الزمر ٦٨. واتە: پاشان فووێکی تر بە (صور)دا دەکرێ ئەمجارە تێکرا خەڵکی لە نێو خاکدا هەڵدەستنەوە.

**سێیەم**: خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ ذَلِكَ يَوْمُ الْوَعِيدِ، وَجَاءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَعَهَا سَائِقٌ وَشَهِيدٌ﴾ ق٢٠-٢١. واتە: کاتێ فوو بە (صور)دا دەکرێ ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە لە

پێشدا خوا پەیمانی بە سزادانی بێبڕواکان پێدا بوو، ئینجا لەم ڕۆژە تاك تاکی خەڵکی بە خۆ و بە دوو فریشتە یەکیان ڕای دەکێشێ و ئەوی تریان شایەدە لەسەر کردەوەکانی.
بەڵام ڕاستتر ئەوەیە کە دووجار فوو بە (صور)دا دەکرێت.

## پ٢٤٠/ (الحساب) چییەو خوای گەورە چۆن حسێب لەگەڵ خەڵکەکەدا دەکات؟

و: خوای پەروەردگار خاوەنی سیفەتی تێر و تەسەل و شایەستەی خۆیەتی، یەك لە سیفەتەکانی (خوا)ش بریتییە لە دادپەروەری (العدل)، ئەم ڕۆژەش ڕۆژێکە خەڵکی کردەوەکانی دەهێنرێتەوە پێش چاو و خوای گەورەش بە پێی کردەوەکانی حسێبی لەگەڵ دەکات بێ ئەوەی زوڵمی لێبکات. هەروەك دەفەرمووێ: ﴿وَلِكُلٍّ دَرَجَاتٌ مِمَّا عَمِلُوا...﴾ الاحقاف ١٩. واتە: بۆ هەمووان بە پێی کردەوەکان پلەیان پێئەدرێت. چۆنیەتی ئەم (حسێب)ەش بە پێی ئەم سوورەتەیە کە دەفەرمووێ: ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ الأَرْضُ زِلْزَالَهَا، وأَخْرَجَتِ الأَرْضُ أَثْقَالَهَا وقَالَ الإِنْسَانُ مَالَهَا، يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا، بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَى لَهَا، يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ النَّاسُ أَشْتَاتاً لِيُرَوْا أَعْمَالَهُمْ فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْراً يَرَهُ، ومَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرّاً يَرَهُ﴾ الزلزال. واتە: کاتێك کە زەوی لەرزی بە لەرزینێکی تەواو، هەرچی شتی قورس و گرانی هەیە هەمووی فڕێدایە دەرەوە، لەم کاتەدا ئادەمیزاد بە سەرسوڕمانەوە دەڵێ ئەوا ئەم زەوییە بۆ وای لێهات، ئەمە ڕۆژێکە زەوی هەواڵی خۆی دەگێڕێتەوە و شایەدی لەسەر کردەوەکانی ئادەمیزاد دەدات کە چ شتێکی ئەنجام داوە لەسەر پشتی زەوی، ئەمەش پەروەردگار پێی ڕاگەیاندووە کە کردەوەکانی خەڵکی بگێڕێتەوە، ئەم ڕۆژە ڕۆژێکە خەڵکی پۆل پۆل بە شێواوی دێنەوە بەردەستی خوا تا کردەوەی خۆیان نیشان بدرێ، ئینجا هەرکەسێك بەقەدەر ووردیلەیەك چاکەی کردبێ دەی بینێتەوە وە هەروەك بەقەدەر ووردیلەیەکیش خراپەی کردبێ دەی بینێتەوە...

هەورەها دەفەرمووێ: ﴿يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وأَيْدِيهِمْ وأَرْجُلُهُمْ بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ...﴾ النور. واتە: لەم ڕۆژە (خەڵکی دەمەکانیان دادەخرێن و) زمان و دەست و پێکانیان شایەدیان لەسەر دەدەن بە هۆی ئەو کردەوانەی کە لە دونیا کردوویانە...

## پ٢٤١/ چۆن کردەوەکانی ئادەمیزاد سەرژمێر دەکرێن و لە ڕۆژی دوایی نیشانیان دەدرێتەوە؟

و: ئادەمیزاد لە ژیاندا دوو فریشتەی لەگەڵدایە تا دەمرێ لێی جیا نابنەوە، فریشتەکانیش یەکیان کارە چاکەکان دەنووسێ و ئەوی تر خراپەکان دەنووسێ... هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿مَا يَلْفِظُ مِنْ قَوْلٍ إِلاَّ لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾ ق١٨. واتە: هەر ووتەیەك لە زار دەربچێ فریشتەکان چاودێرن بەسەریەوە و قسەکە ڕاستەوخۆ تۆمار دەکەن...

دوای ئەوەی، ئەو کەسە لە ڕۆژی دوایی دێتەوە بەر دەستی خوا. ئەو دەمە خوا کردەوەکانی بە بیر دەهێنێتـەوە... هـەروەك دەفـەرمووێ: ﴿وَوُضِـعَ الْكِتَـابُ فَتَرَى الْمُجْرِمِـينَ مُشْـفِقِينَ مِمَّـا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَا وَيْلَتَنَا مَالِ هَذَا الْكِتَـابِ لاَيُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلاَكَبِـيرَةً إِلاَّ أَحْصَاهَا وَوَجَدُوا مَا عَمِلُوا حَاضِراً وَلاَ يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَداً﴾ الكهف ٤٩. واتە: لە ڕۆژی دوایی هەرکـەس نامـەی خـۆی پێدەدرێتەوە، تاوانباران لەم ڕۆژەدا بە ترسێکی زۆرەوە سەیری کردەوە بەدەکانی خۆیـان دەکـەن و دەڵێـن: ئـەی خـاك بەسـەرمان ئـەم نامەیـە چی‌یـە کـە کردەوەیـەکی بچـوك یـان گـەورەی بەجێ‌نەهێشتووە بۆ گشتی ژماردوون، ئنجا ئەو کردەوانەی کە لـە دونیـا کردبوویـان دەیـان بیننـەوە، خوای گەورە بە هیچ جۆر زوڵم لە کەس ناکات...

## پ٢٤٢/ کێ حسێب لەگەڵ ئەم خەڵکە دەکات؟

و: خـوای پـەروەردگار بـە گـەورەیی خـۆی حـسێب لەگـەڵ ئـەم خەڵکـە دەکـات. هـەروەك پێغەمبەری پێشەوا ﷺ دەفەرمووێ: **﴿مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَـدٍ إِلاَّ سَـيُكَلِّمُهُ رَبُّـهُ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ، لَيْسَـتْ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ تَرْجُمَانٌ فَيَنْظُرُ أَيْمنَ مِنْهُ، فَلاَ يَرَى إِلاَّ مَاقَدَّمَ مِنْ عَمَلِهِ، وَيَنْظُرُ أَشْأَمَ مِنْهُ، فَلاَ يَرَى إِلاَّ مَاقَدَّمَ. وَيَنْظُرُ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَلاَ يَرَى إِلاَّ النَّارَ تِلْقَـاءَ وَجْهِـهِ، فَـاتَّقُوا النَّـارَ وَلَـوْ بِشَـقِّ تَمْـرَةٍ﴾** البخاري ومسلم والترمذي. واتە: هیچ کەس نی‌یە لە ئێـوە گـەر پـەروەردگار قسـەی لەگـەڵ نـەکات بـە شێوەیەك کـە هیـچ وەرگێـڕ (**ترجمان**)ێـك لـە نێوانیـان نی‌یـە، تەماشـای لای ڕاسـتی دەکـات هـەر کردەوەکانی دەبینێ، تەماشای لای چەپی دەکات بەهەمان شێوە کردەوەکانی دەبینێ، تەماشای پێشە خۆی دەکات تەنها ئاگری دۆزەخ دەبینێ کەوا بۆ لای دەم و چاوی دێت، کەواتە لـە خـوا بترسـن و خۆتان لە ئاگر بپارێزن با بە لەتێ خورماش بێت.

## پ٢٤٣/ حیکمەتی ئەم حسێبە چی‌یە؟

و: حیکمـەتی ئـەم حسێبە دەرخستنی پایـەی خواناسـانە لـەم شـوێنە مەترسی‌دارە و ئاشـکرا کردنی کردەوە خراپەکانی بێبڕوایان و یاخی بووانە، بەتایبەت سەرکردە خوانەناسەکان.

## پ٢٤٤/ پردی (صراط) چی‌یە؟

و: پردێکی درێژە کە لەسەر پشتی ئـاگری دۆزەخ ڕاهێنـراوە، هـەموو کـەس بەسـەریدا ڕەت دەبێ، چ بـڕوادار چ بێبـاوەڕ، بـەڵام بڕواداران بـەپێی کردەوەکانیـان هێندێکیـان وەکـو بروسـك هێندێکیـان وەکـو ڕەشـەبا هێندێکیـان بـە غـاردان هێندێکیـان بـەپێیان هێندێکیـان بـە نـەرمی و هێندێکیان بە گاگۆڵان...هتد، بەسەریدا ڕەت دەبن. بەڵام بێبڕواکـان نـاتوانن بەسـەریدا بـڕۆن، هەرکە چوونە سـەر پردەکە یەکـسەر بەردەبنەوە ناو ئاگر.

پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئەم پردە دەفەرمووێ: **(يُضْرَبُ الصِّرَاطُ بَيْـنَ ظَهْـرَي جَهَنَّـمْ، فَـأَكُونُ أَنَا وَأُمَّتِي أَوَّلَ مَنْ يَجِيزُ، وَلاَيَتَكَلَّـمُ، يَوْمَئِـذٍ إِلاَّ الرُّسُـلُ، وَدَعْـوَى الرُّسُـلِ يَوْمَئِـذٍ: اللَّهُـمَّ سَـلِّمْ**

**سَلِّم، وفِي جَهَنَم كِلاَلِيبُ مِثْلُ شَوكِ السَّعْدَانِ غَيْرَ أَنَّهُ لاَيَعْلَـمُ مَـاقَدَرَ عَظِمُهَـا اِلاَّ ا لله: تَخْطِفُ النَّاسَ بِأَعْمَالِهِم﴾** مسلم. واته: پردی (**صراط**) بەسەر پشـتی دۆزەخ ڕادەهێـنرێ، مـن و ئوممەتەکـەم یەکەم چینین کە بەسەریدا ڕەت دەبین، هیچ کەس لەم ڕۆژە قسان ناکات تەنها فریشـتەکان نـەبێ کـە دەڵێـن خودایـە سـەلامەتیان بکـە، خودایـە سـەلامەتیان بکـە، ئینجا لـەم دۆزەخـــە دەمەئاســن (قولاب)ی دۆزەخی هەن کە وەکو درکی (سەعدان) وایە هەر خوا بۆ خۆی دەزانێ کە ئەم قولابانە چەند گەورەن، خەڵکی بەپێ‌ی کردەوەکانیان دەکەونە بەر چنگی ئەم قولابانە و تێ‌فڕێدەدرێنـە نـاو دۆزەخ لە پاش (٧٠) ساڵ ئینجا دەکەونە بنەوەی دۆزەخ.

هەروەها دەفـەرمووێ: **﴿الصِّراطُ عَلَى جَهَنَّـمَ مِثْـلَ حَدِّ السَّيفِ. فَتَمُّر الطَّبَقَـةُ الأُولَــى كَـالْبَرْقِ، والثَّانِيَـةُ كَـالريحِ، والثَّالِثَـةُ كَـأَجْوَدِ الْخَيْــلِ، والرَّابِعَـةُ كَـأَجْوَدِ الْبَهَــائِمِ، ثُــمَّ يَمُرُّونَ وَالْمَلاَئِكَةُ يَقُولُونَ: اللَّهُمَّ سَلِّم سَلِّم)﴾** أخرجه ابن جرير. واتە: پردی سەر دۆزەخ وەکو نوکـی شمشێر باریك و تیژە، چینی یەکـەم وەکـو بروسـك پێ‌یدا ڕەت دەبـن، چیـنی دووەم وەکـو ڕەشـەبا، سێ‌یەم وەکو ماین، چوارەم وەکو گیانەوەر ئینجا ئەوانی تر بەسـەریدا ڕەت دەبـن و فریشـتەکانیش دوعایان بۆ دەکەن و دەڵێن: خودایە سەلامەتیان بکە (خودایە) سەلامەتیان بکە...

## پ٢٤٥/ (الشفاعة) چی‌یە؟

و: (**الشفاعة**) بریتی‌یە لەو دوعایانەی کە خوای پەروردگار وەری دەگرێت، ئەویش دەکرێـت بەم بەشانەی خوارەوە:

١) **شەفاعەتی گەورە**: شەفاعەتێکە لە غەیری پێغەمبەری ئیسلامﷺ هیـچ کەسـی تـر بـۆی نی‌یە ئەم شەفاعەتە بکات. ئەم شەفاعەتەش لەو ڕۆژە دەکرێت کەوا خەڵکی (٤٠) سـاڵ لـە گۆڕەپـانی (**حشـر**) دەمێننـەوە لـەبارودۆخێکی زۆر نـاخۆش دا دەژیـن، ڕۆژێکـە کەخەڵکی لەخۆیان بێزارن و ئاواتە خوازن خوا بیـان خاتـە دۆزەخ بـەس بـۆ ئـەوەی لـەم ڕۆژە دەربچن. دەچنە لای هەموو پێغەمبەران بۆ ئـەوەی لـە خـوا بپاڕێنـەوە لـەم ڕۆژەیـان دەرباز بکەن... بەڵام وەڵامی هەموو پێغەمبەران تەنها (**نفسي نفسي**)یە تـەنها پێغەمبـەری نازدار ﷺ نەبێ کە دەفەرموێ: (**أمتي أمتي**) واتە: (ئوممەتی خۆم ئوممەتی خۆم)، پاشـان سەر دەخاتـە سـەر سوژدە، دوای ماوەیـەك ئینجـا خـوا وەڵامـی دەداتـەوە، ئینجا پـێ‌ی دەفـەرمووێ: سـەرت هـەڵبڕە چیـت دەوێ تـاوەکو بـۆت جـێ بـەجێ بکـەم، ئینجـا پێغەمبەر ﷺ لەخۆشیان سوپاسێکی هێندە گـەورەی خـوا دەکـات کـە ئـەو دەمـە خـوای گـەورە دەیهێنێتـە سـەرزاری و بـەخوای گـەورە ڕادەگەیـەنێ کـە لـەو ڕۆژەیـان ڕزگارکات وحسێبێکیان لەگەڵ بکات.ئەگەر چی بشیانباتە دۆزەخ. ئینجا خـوا حسێبیان لەگەڵ دەکات.

٢) چەند گەڵێك هەن خوای گەورە بەبێ حسێب دەیانخاتـە بەهەشـت کـە خـۆی دەدات لـە (هەفتا هەزار)کەس هەروەك لە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بەریوایەتی (**مسلم و البخاري**)

بەوە هاتووە کەوا ئەمانە لەبەر کەمی تاوانەکانیان حسێبیان لەگەڵ ناکات ئەمەش شەفاعەتێکە کە خوا لەگەڵ ئەم کەسانەدا دەکات.

٣) خوای گەورە مسوڵمانە گوناهبارەکان دەخاتە بەرشەفاعەتی خۆی دوای ئەوەی کە لە گوناهەکان دەشۆرێن ئینجا لە دۆزەخ دەریان دەهێنێ و دەیانخاتە بەهەشت.

٤) شەفاعەت کردن بۆسووك کردنی سزا بۆ بەشێك لە بێ بڕوایان، وەکو حاڵی (أبو طالب)ی مامی پێغەمبەر ﷺ کە دوو پشکۆی ئاگری لە ژێر پێدا دائەنرێ تاوەکو مێشکی وەك مەنجەڵ دەبڵقێ، ئەو ئایەتەش کەدەفەرمووێ: ﴿لا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ الْعَذَابُ وَلا هُمْ يُنظَرُونَ﴾البقرة ١٦٢. واتە: سزایان لەسەر سووك ناکرێت و چاوەڕێی دەرباز بوونیشیان لێ ناکرێ، بەنسبەت (أبو طالب)یش لەوەندە سزایەی کە باسمان کرد سووکتر نابێ.

٥) خوای پەروەردگار پلەی بەهەشتی یەکان لەبەهەشت زیاد دەکات بە هۆی شەفاعەتەوە پێغەمبەران و شەهیدان و پیاوچاکان بەشدارن لەم شەفاعەتە.

٦) شەفاعەتی قورئان و ڕۆژوو: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ القُرآنَ والصِّيامَ يُشَفَّعانِ يوم القِيامَةِ...﴾ رواه ابوداود. واتە: لەڕۆژی دوایی قورئان (بەهۆی قورئان خوێندنی دونیاوە)و ڕۆژوو (بەهۆی ڕۆژوو گرتنی ئەو کەسە لە دونیا) شەفاعەت بۆ خاوەنەکەی لەلای خوای گەورە دەکەن..

## پ٣٤٦/ حەوز (الحوض) چی یە؟

و: لەڕۆژی دوایی هەر پێغەمبەرێك حەوزێکی هەیە، کە خۆیی و ئوممەتەکەی لێی دەخۆنەوە پێش ئەوەی بچنە بەهەشت، هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ لِكُلِّ نَبِيٍّ حَوْضاً﴾ رواه الترمذي.

پێغەمبەری ئیسلامیش ﷺ وەك پێغەمبەرانی تر حەوزێکی هەیە پێی دەڵێن: (حەوزی کەوسەر) هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿حوضي مسيرة شهر ماؤه أَبْيَضُ مِنَ اللَّبَنِ وريحُهُ أَطْيَبُ مِنَ المِسْكِ وكِيزَانُهُ كَنُجُومِ السَّمَاءِ، مَنْ شَرِبَ فِيهَا فَلَا يَظْمَأُ أَبَداً﴾ رواه البخاري. واتە: حەوزەکەی من پان و بەرینی یەك مانگەڕێ درێژە، ئاوەکەی لەشیر سپی تروبۆنەکەشی لە (مسك) خۆشترە، بەرداخی ئاوەکان ژمارەیان بەقەد ئەستێرەکانی ئاسمانە. هەر کەسێکی لێی بخواتەوە جارێکی تر تینووی نابێتەوە.

## پ٣٤٧/ تەرازوو (الميزان) چی یە؟

و: تەرازوویێکە کەوا کردەوەی چاك و خراپی پێ هەڵدەسەنگێنرێ، هەر کەسێك تای تەرازووی چاکەی لەهی خراپەی زیاتر بێ ئەوە بەهەشتی خۆی مسۆگەر دەکات. بەلام ئەگەر خراپەی زیاتر بێ، ئەوا یەکسەر بەرەو ئاگری دۆزەخ پەلکێش دەکرێ، ئەگەر خوا ڕەحمی پێ

نەكات (خوا پەنامان بدات)، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿فَأَمَّا مَنْ ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَاضِيَةٍ، وأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ فَأُمُّهُ هَاوِيَةٌ﴾ القارعة ٩.٦. واتە: ئەو کەسەی کێشی کردەوە چاکەکانی لە تەرازوو قورس بێت ئەوا یەکسەر لە بەهەشت دەخرێتە نێو ژیانێکی خۆشەوە. بەڵام ئەوەی کێشی کردەوە چاکەکانی لەتەرازوو سووك بێت ئەوا یەکسەر دەخرێتە دۆزەخەوە.

## پ٢٤٨/ دەفتەری کردەوەکان (صحف الاعمال) چی‌یە؟

و: خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ كِرَاماً كَاتِبِينَ﴾ الانفطار ١٠. واتە: چەند فریشتەیەك بەسەر ئێوەدا چاودێرن و کردەوەکان دەنووسن و بەڕێزن. ئینجا هەموو کەس لەڕۆژی دوایی ئەم نووسراوانە وەردەگرێتەوە، خوای گەورە پێیان دەفەرمووێ: ﴿إقْرأْ كِتَابَكَ﴾ الاسراء ١٤. واتە: دەفتەری کردەوەکانت بخوێنەوە. جا ئەم خەلکە لەوەرگرتنەوەی کتێبەکان دوو جۆرن، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَاباً يَسِيراً ويَنقَلِبُ إِلَى أَهْلِهِ مَسْرُوراً، وأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ وَرَاءَ ظَهْرِهِ فَسَوْفَ يَدْعُوا ثُبُوراً ويَصْلَى سَعِيراً﴾ الانشقاق ٧.١٠. واتە: هەرکەسێك دەفتەری کردەوەکانی بە دەستی ڕاست بدرێتەوە، ئەوا حسێبێکی گەلێك ئاسانی لەگەڵ دەکرێ و بەدڵ خۆشی دەگەڕێتەوە ناو خێزانەکەی لە بەهەشت، بەڵام هەرکەسێك لەلای پشتی‌یەوە (بەدەستە چەپ) دەفتەری کردەوەکانی بدرێتەوە ئەوە هاواری قوربەسەری و داماوی خۆی دەکاو دەچێتە دۆزەخ.

## پ٢٤٩/ ئەو چوار پرسیارە چین کە لە ڕۆژی دوایی لە خەڵکی دەکرێن؟

و: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿لَنْ تَزُولَ قَدَمَا عَبْدٍ يَوْمَ القِيَامَةِ حَتَّى يسْأَلَ عَنْ أَرْبَعِ خِصَالٍ: عَنْ عُمُرِهِ فِيمَا أَفناهُ، وعَنْ شَبَابِهِ فِيمَا أَبْلاهُ، وعَنْ مَالِهِ مِنْ أَيْنَ إِكْتَسَبَهُ وفِيمَا أَنْفَقَهُ وعَنْ عِلْمِهِ مَا عَمِلَ فِيهِ﴾ رواه البزار والطبراني باسناد صحيح. واتە: لە ڕۆژی دوایی قاچی هیچ بەندەیەك لە مەحاکەمە لاناکەوێت تاوەکو لەبارەی چوار شت پرسیاری لێ دەکرێت:

١ـ لەبارەی تەمەنی کە ئایا بەچی بەسەر بردووە؟

٢ـ لەبارەی گەنجێتی‌یەکەی کە ئایا لەچی بەسەر بردووە؟

٣ـ لەبارەی ماڵەکەی ئایا لە کوێ‌ی پەیدا کردووەو لە چی خەرج کردووە؟

٤ـ لەبارەی زانستەکەی، ئایا چی پێ کردووە؟

## پ٢٥٠/ دۆزەخ (جهنم) چی‌یە؟

و: خوای گەورە ئەگەر پاداشتی بڕواداران بداتەوە بە بەهەشت، ئەوا سزای تاوانبارو بێ بڕوایان بە ئاگرێك دەداتەوە کە پێی دەڵێن ئاگری دۆزەخ (**نار جهنم**).

کەواتە دۆزەخ ماڵیکی (ئاگر)ینە کەوا بێبڕوایانی تێدەخرێتە ناو لە تۆڵەی ئەو کردەوە ناپەسندانەی کە لە دونیا خەریکی بوو ون.

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا، وَجِيٓءَ يَوْمَئِذٍۭ بِجَهَنَّمَ﴾ الفجر ٢٢، ٢٣. واتە: لەسڕۆژی دوایی خوای پەروەردگار، پاشان فریشتەکان پۆل پۆل دێنە مەیدانی مەحشەر، ئینجا (٤٩٠٠٠٠٠٠٠) چوار هەزارو نۆسەد ملیۆن فریشتە ئاگری دۆزەخ دەهێنن، بەڵام لەم کاتە دۆزەخ زۆر تووڕەیەو لەهەفتا هەزار لاوە فریشتەکان گرتوویانە، بەڵام ئەو لەداخی بێ بڕوایان ڕاناوەستێ‌و هێرشیان بۆ دەبات، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ ٱلْغَيْظِ...﴾تبارك ٨. واتە: دۆزەخ لەو ڕۆژە دا لەداخا وەختە پارچە پارچە بێ.

## پ٢٥١/ ئاگری دۆزەخ چەند ناوی هەیە؟

و: ئاگری دۆزەخ لە قورئان بەزۆر ناو هاتووە، لەوانە: ﴿الهاوية، السعير، لظى، الحطمة﴾.

## پ٢٥٢/ سووتەمەنی دۆزەخ چین؟

و: سووتەمەنی دۆزەخ بەتەنها بەرد و ئادەمیزادە هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ....﴾التحريم ٦. واتە: ئەی بڕوادارینە خۆتان و ماڵ و منداڵتان لە ئاگرێك بپارێزن کە سووتەمەنییەکەی لە بەرد و ئادەمیزاد پێك هاتووە...

زانایان دەڵێن: ئەو بەردە پێی دەڵێن (بەردی کبریت)[1] کە پێنج خەسڵەتی ناوێزە (شاذ) ی تیایە کەئەمانەن:

١- زووگڕدەگری.
٢- دووکەڵێکی چڕی هەیە.
٣- بۆنێکی ناخۆشی هەیە.
٤- گەرمایییەکی زۆری هەیە.
٥- بەتووندی بە پێستی ئادەمیزادەوە دەنووسێ.

## پ٢٥٣/ ئایا دۆزەخ جێی ئەم هەموو خەڵکەی تیا دەبێتەوە؟

و: بەڵێ بە زیادەوەش جێی دەبێتەوە، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ ٱمْتَلَأْتِ وَتَقُولُ هَلْ مِن مَّزِيدٍ﴾ ق ٥٠. واتە: ئێمە لەو ڕۆژە بەدۆزەخ دەڵێین: ئایا پڕبوویت؟ ئەویش دەڵێ: ئایا زیاتر ماون تا بیانسووتێنم؟ واتە: (هێشتا جێگا لە دۆزەخ دەمێنێ کە پڕ بێ).

---

[1] هەر چەندە خوای پەروەردگار توانای ئەوەی هەیە کە هەر بەردێك بکات بە سووتەمەنی دۆزەخ.

## پ٢٥٤/ ئایا خواردن وخواردنەومیان لە دۆزەخ چی‌یە؟

و: زۆر جۆرە خواردنی ناریك و بێزراویان بۆ هەیە لەوانە خواردنی داری (زقوم)ە کەپێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ: (ئەگەر پەلکە گەلایەکی ئەم دارە بکەوێتە سەر دونیا هەمووی گردەگرێ). خوای گەورە باسی ئەو دارە دەکات و دەفەرمووێ: ﴿أَذَٰلِكَ خَيْرٌ نُّزُلًا أَمْ شَجَرَةُ الزَّقُّومِ إِنَّا جَعَلْنَاهَا فِتْنَةً لِّلظَّالِمِينَ إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِي أَصْلِ الْجَحِيمِ، طَلْعُهَا كَأَنَّهُ رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ، فَإِنَّهُمْ لَآكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِئُونَ مِنْهَا الْبُطُونَ، ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ﴾الصافات ٦٠.٦٧. واتە: ئایا بەهەشت چاکترە یان (خواردنی) داری زەققوم کەوا ئێمە بۆ مەینەتی زۆردارانمان ئامادەکردووە، دارێکە لەناخی دۆزەخەوە وەکو سەری شەیتانەکان وایە و دەردەچێ، بێ بڕوایان لەم دارە دەخۆن و سکی خۆیان لێ پڕ دەکەن، لەدوای ئەوە لەسەرەوەئاوێکی کوڵاویان (بەسەردادەکرێ و پاشان) دەرخواردیان دەدرێ.

خواردنەوەشیان بریتی‌یە لە ئاوێکی کوڵاووگەرم، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَإِن يَسْتَغِيثُوا يُغَاثُوا بِمَاءٍ كَالْمُهْلِ يَشْوِي الْوُجُوهَ، بِئْسَ الشَّرَابُ وَسَاءَتْ مُرْتَفَقًا﴾ الکهف ٢٩. واتە: ئەگەر داوای ئاویان کرد ئاوێکیان دەدرێتێ وەکو مسی تواوە، یەکسەر دەم و چاویان دەسووتێ و هەڵدەکەنێ، ئەم ئاوەش پیسترین و خراپترین خواردنەوەیە دەرخواردیان دەدرێ..

## پ٢٥٥/ دۆزەخی‌یەکان چ جلێکیان لەبەرە لەم ڕۆژەدا؟

و: دۆزەخی‌یەکان لەم ڕۆژەدا جلێکی ئاگرینیان لەبەر بڕدراوە.. هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿....فَالَّذِينَ كَفَرُوا قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُءُوسِهِمُ الْحَمِيمُ، يُصْهَرُ بِهِ مَا فِي بُطُونِهِمْ وَالْجُلُودُ، وَلَهُم مَّقَامِعُ مِنْ حَدِيدٍ، كُلَّمَا أَرَادُوا أَن يَخْرُجُوا مِنْهَا مِنْ غَمٍّ أُعِيدُوا فِيهَا وَذُوقُوا عَذَابَ الْحَرِيقِ﴾ الحج ١٩، ٢٢. واتە: ئەوانەی کە بێ‌بڕوان جلێکیان لەبەر دەبڕدرێ لە ئاگر، ئینجا لەسەرەوە ئاوێکی کوڵاویان پیا دا دەکرێ کە پێست و هەرچی شتێك کە لە هەناویان داهەیە دەقرچێن و دەسووتێن و لێك دەپچرێن، ئینجا کوتێکی پۆڵایینیان هەیە بۆ لێدانیان هەرکاتێك ویستیان لە ناو ئاگرەکە ڕابکەن یەکسەر دەکەونە ناوی‌و (پێیان دەڵێن) بچێژن ئازاری سووتێنەر.

## پ٢٥٦/ ئایا کەس لە حەژمەتی ئەم ئاگرە دەمرێ؟

و: لە دۆزەخ خەڵکی لەنێوان مردن و ژیان دان، نەمردنی مردنەو نە ژیانی ژیانە، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿.. ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ﴾ الأعلى ١٣. واتە: پاشان لەم شوێنەدا نە دەمرن و نە دەژین..

## پ٢٥٧/ ئایا پاش ئەوەی کەئەم خەڵکە سووتان.. چی‌یان دەمێنێ تا بسووتێ؟

و: خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُمْ بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا الْعَذَابَ....﴾ النساء٥٦. واتە: ئەوانەی کە بی‌بڕوان بە ئایەتەکانمان، دەیان خەینە ناو ئاگرێك، هەرکاتێك پێستەکانیان سووتێنرا، یەکسەر پێستێکی تریان بۆ دروست دەکەینەوە، بۆ ئەوەی بەردەوام ئەم ئازارە بچێژن... کەواتە، هەر بەشێکی ئەو ئادەمیزادەی کە دەسووتێت یەکسەر بۆی دروست دەبێتەوە.

## پ٢٥٨/ ئایا بێزاری ئەم خەڵکەی ناو دۆزەخ دەگاتە چ ئاستێك؟

و: خەڵکی لە دۆزەخ هێندە بێزارو ماندوون، ئامادەن هەموو شتێك بکەن بەقوربانی خۆیان، بەس بۆ ئەوەی لە دۆزەخ پێی دەربچن! هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿يَوَدُّ الْمُجْرِمُ لَوْ يَفْتَدِي مِنْ عَذَابِ يَوْمِئِذٍ بِبَنِيهِ، وَصَاحِبَتِهِ وَأَخِيهِ وَفَصِيلَتِهِ الَّتِي تُؤْوِيهِ، وَمَنْ فِي الأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ يُنْجِيهِ، كَلاَّ﴾ المعارج ١١، ١٥. واتە: تاوانبار، لەم ڕۆژە پێی خۆشە کوڕەکەی‌و خێزانەکەی‌و براکەی‌و عەشیرەتەکەی کە لەدونیا پشتیان دەگرت و هەرچی خەڵکی سەر زەوی هەیە بیکات بە بەلاگێڕی سەری خۆی بەس بۆ ئەوەی ڕزگاری بێ لە ئازارو ئەشکەنجەی ئاگری دۆزەخ (بەڵام خوا ڕزگاری ناکات ﷻ دەفەرمووێ:) نەخێر، (ڕزگارت ناکەم).

## پ٢٥٩/ ئاسانترین سزا لە دۆزەخ چ سزایەکە؟

و: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ أَهْوَنَ أَهْلِ النَّارِ عَذَاباً مَنْ لَهُ نَعلان، وشِراكان مِنْ نـار، يُغلي مِنْهُما دَماغُه كَما يُغْلي المِرْجَلُ. ما يَرى أَنَّ أَحداً أَشَدَّ مِنهُ عَذاباً. وإِنَّه لأَهْوَنُهُمْ عذاباً﴾ رواه البخاري ومسلم واللفظ لمسلم. واتە: سووکترین ئازار، ئازاری کەسێکەو کەدوونەعلی لەبەردایەو دوو لاستیکی ئاگری پێ‌یە و مێشکی لەتاوا وەکو مەنجەڵ دەکوڵێ. پێی وانی‌یە کە کەس ئازاری لەو زیاتر بێ، بەلام کەچی سووکترین ئازاریشە لە دۆزەخ.

## پ٢٦٠/ چۆن ئاگری دونیا بەراورد دەکرێ لەگەڵ ئاگری دۆزەخ؟

و: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿نارُكُمْ هذِهِ الَّتي تُوقِدُونَ جُزءٌ مِنْ سَبعِينَ جُـزْءاً مِـنْ حَرِّ جَهَنَّمْ، قالوا: وا للهِ إِنْ كانَت لَكافيةً يارَسُوُلَ الله. قالَ: فإِنَّها فُضِّلَتْ بِتِسْعَةٍ وسِتِّين جُـزءاً كُلُّهُنَّ مِثْلُ حَرِّها﴾ البخاري ومسلم والترمذي واللفظ لمسلم. واتە: ئەو(ئاگرە) گەورەیەی کە ئێوە لەدونیا دەیکەنەوە بەشێکە لە هەفتا بەشی ئاگری دۆزەخ، ئەوانیش گوتیان: هەر ئەوەندە ئاگرەی دونیا بەس بوو (تا تاوانبارانی پێ بسووتابا) ئەویش فەرمووی: ئاگری دۆزەخ شەست و نۆی بەسەر ئاگری

دونیاوە هەیە، هەر بەشەو گەرمی یەکەی وەك گەرمی یەکەی دونیا وایە، کەواتە ئاگری دۆزەخ شەست و نۆجار بەقەد ئاگری دونیا گەرمترە.

## پ٢٦١/ دوا کەس لە تاوانباران کە لە ئاگری دۆزەخ دەردەچێ کێیە؟

و: هیچ کەس لەکافرو بێ بڕوایان نایەنە دەر، تەنها ئەو گوناهبارانە نەبێ کە گوناهەکانیان بە ئاگرنەبێ لێ هەڵنەوەراون...

دوا کەس لەوانەی کە دوای تۆڵەسەندنەکەی لە دۆزەخ دێتە دەرەوە کەسێکە دەرواو بەردەبێتەوە ناو ئاگر، تا ئەو دەمەی کە لە ئاگرەکە دەرباز دەبێ‌و (ئاوڕدەداتەوە بەدۆزەخ دەڵێ:) پاکی و بێ گەردی بۆ ئەو خوایەی کە منی لە چنگ تۆ دەرباز کرد، لە دوورەوە دارێك دەبینێ و دەڵێ: ئەی پەروەردگار بمبە ژێر ئەو دارە بۆ ئەوەی بحەسێمەوەو هێندێك لە ئاوەکەی بخۆم، خوای گەورەش دەفەرمووێ: ئەگەر ئەو دارەت پێ ببەخشم داوای هیچی ترم لێ دەکەیت؟ ئەویش دەڵێ: نا بەو خوایە داوای چیترت لێ ناکەم و (پەیمانی دەداتێ)، دوای ئەوەی کە دەچێتە ژێر سێبەری دارەکەو هێندێك ئاو دەخواتەوە لەو دەمە خوای گەورە دارێکی تری پێ نیشان دەدات، کە گەلێك لەدارەکەی پێشوو جوانترو ڕێك و پێکترە، بڕوادارەکەش کە چاوی بەدارەکە دەکەوێت و خۆی پێ ناگیرێ‌و دەڵێ: بمبە ژێر ئەو دارەش تا نەختێك لەژێریا بحەسێمەوەو هێنێك ئاوی لێ بخۆم.. ئیتر داوای چیترت لێ ناکەم، خوای گەورەش دەفەرمووێ: ئەی تۆ پەیمانت نەدا کەداوای چیترم لێ نەکەیت؟ ئێستا ئەگەر پێت ببەخشم داوای شتی تریشم لێ دەکەیت، ئەویش پەیمانی پێ دەدات کە داوای شتی تری لێ نەکات.. ئەمجارە خوای گەورە دارێکی تری پێ نیشان دەدات لە نزیك بەهەشت کە لە هەردوو دارەکانی پێشوو دڵڕفێنتر و جوانتر بوو.. ئەم جارەش وەکو جاران پیاوەکە لەگەڵ خوادا دەدوێ‌و داوای دارەکە دەکات و پەیمانیشی دەداتێ کە داوای چیتری لێ نەکات.. کاتێ کە دەچێتە ژێر ئەو دارەش، گوێی لەدەنگی بەهەشتی یەکان دەبێ، دیسان خۆی پێ ناگیرێ‌و داوا لە خوا دەکات کە بیخاتە بەهەشت.. خوای گەورەش پێی دەڵێ: ئەی ئادەمیزاد چ شتێك چاوت تێر دەکات و وات لێ دەکات کە داوای چیترم لێ نەکەیت؟ دەتەوێ هەموو دونیات بدەمێ تاوەکو ڕازی بیت؟ ئەویش دەڵێ: ئەی پەروردگار گاڵتەم پێ دەکەیت کەتۆ پەروەردگاری هەمووجیهانی؟ ئینجا خوای پەروەردگار پێ دەکەنێ‌و پێی دەفەرمووێ: من گاڵتەت پێ ناکەم، بەڵام من دەسەڵاتم بە سەر هەموو شتێك هەیە کە بیکەم. ئینجا خوای پەروەردگار دەیباتە بەهەشت... رواه مسلم.

## پ٢٦٢/ ئایا دۆزەخ ئێستا لەبوون (وجود) دا هەیە؟

و: بەڵێ، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ﴾ آل عمران ١٣١. واتە: خۆتان لە ئاگرێك بپارێزن کەوا بۆ بێ‌بڕواکانمان ئامادە کردووە.

## پ٢٦٣/ بەهەشت چی‌یە؟

و: بەهەشت باخ و بیستانێکە کە خوای پەروەردگار دایناوە بۆ ئەو کەسانەی کە بڕوادارن و کردەوەی چاك ئەنجام دەدەن کە فراوانی‌یەکەی بەقەد فراوانی ئاسمانەکان و زەوی‌یە، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿...وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَوَاتُ وَالأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ﴾ آل عمران ١٣٣. واتە: بەهەشتێکە فراوانی‌یەکەی بەقەد ئاسمانەکان و زەوی‌یە کە بۆ پارێزکاران لە تاوان ئامادە کراوە.

## پ٢٦٤/ بەهەشت بە چەند ناو لە قورئان دا هاتووە؟

و: خوای پەروەردگار بەزۆر ناو لە قورئان ناوی بەهەشتی هێناوە کە ئەمانەی خوارەوەن:
﴿المأوى، عدن، خلود، الفردوس، دار السلام، جنات النعيم، المقام الأمين﴾

## پ٢٦٥/ بەهەشت چۆنە؟

و: خوای گەورە دەربارەی چۆنی‌یەتی بەهەشت دەفەرمووێ: ﴿يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُخَلَّدُونَ بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِنْ مَعِينٍ لاَيُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلاَيُنْزِفُونَ، وَفَاكِهَةٍ مِمَّا يَتَخَيَّرُونَ وَلَحْمِ طَيْرٍ مِمَّا يَشْتَهُونَ وَحُورٌ عِينٌ كَأَمْثَالِ اللُّؤْلُؤِ الْمَكْنُونِ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ الواقعة ١٧. ٢٤. واتە: منداڵی جوان و بێ موو لەدەوریان خول دەخۆن، بەخۆو بە فینجان و سوراحی و بەرداغی پڕ لەشەراب، هەرکاتێ بیخۆنەوە دووچاری سەرێشە و بێ هۆشی نایەن.. (ئینجا لەم بەهەشتە) سەوزەو میوەجاتێکی وای لێ‌یە کە بۆخۆیان هەڵی بژێرن، لەگەڵ گۆشتی باڵندەیەك کە دڵیان ئارەزووی لێ هەبێ، ئینجا حۆری چاو گەورەی وایان پێشکەش دەکرێ کە لە جوانیان وەکو مۆریو مەرجان وان، ئەمە پاداشتی ئەم کردەوە چاکانەیە کە لەدونیا کردوویانە..

هەروەها خوای گەورە لە فەرموودەیەکی قودسی دا دەفەرمووێ: ﴿أعْدَدْتُ لِعِبادي الصَّالِحينَ مالا عَينٌ رَأَتْ ولا أُذُنٌ سَمِعَتْ ولا خَطَرَ عَلى قَلْبِ بَشَر...﴾ رواه الشيخان والترمذي. واتە: بۆ بەندە چاکەکانی خۆم ئامادەم کردووە، شتی وا کەوا هیچ چاوێك نەیبینیوەو هیچ گوێیەك نەی بیستووەو بەسەر هیچ دڵێکیشدا نەهاتووە.

## پ٢٦٦/ کۆشك و خشت و خاك و خۆڵی بەهەشت چۆنە؟

و: پێغەمبەر ﷺ لەبارەیان دەفەرمووێ: ﴿.. لَبنةٌ مِنْ فِضَّةٍ ولَبنَةٌ مِنْ ذَهَبٍ ومِلاطُها المِسْكُ الاذفرُ وحَصْبَاؤُها اللؤلؤُ والياقُوتُ وتُرْبَتُها الزَعْفرانُ مَنْ دَخَلَها يَنْعَمُ ولا يَبْؤُسُ ويُخَلَّدُ ولا يَموتُ لاتُبْلى ثِيابُهُمْ ولا يَفْنى شَبابُهُمْ...﴾ الترمذي. واتە: کۆشکەکانیان بە جۆرێك دروست کراوە، کە خشتەکانی بریتی‌یە لە زێڕو زیو، نێوان هەر دوو خشتیش بریتی‌یە لە جۆرە بۆنێك کە پێی دەڵێن: (المسك الاذفر) ئینجا ناواخنی ژوورەکەش بە مۆریو مەرجان ڕازێنراوەتەوە، خاك و خۆڵی ژوورەکەش جۆرە خۆڵێکە پێی دەڵێن: (زەعفەران) هەر کەسێك بچێتە ناوی هەر لەخۆشی

دادەژیو بە هیچ جۆرێ تووشی کلۆڵی نابێ، بە نەمریش دەمێنێتەوەو مردنی بەسەر دانایەو جلەکانیان کۆن نابێو گەنجێتی یەکەیان بەسەرناچێ.

## پ٢٦٧/ چ پلەیەك لە بە هەشت لەهەموو پلەیك خۆشترە؟

و: لە بەهەشت (١٠٠) پلە هەیە، لە نێوان ئەوانیش بەهەشتی فیردەوس خۆشترین بەهەشتە هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿**فِي الْجَنَّةِ مِائَةُ دَرجةٍ مابَينَ كُلِّ دَرَجَتينِ كَما بَينَ السَّماءِ والأرضِ والفِردَوسُ أعلاها دَرَجةً ومِنْها تُفَجَّرُ أنْهارُ الجنَّةِ.. ومِنْ فَوقِها يَكونُ العَرْشُ فاذا سَأَلْتُمُ اللهَ فَسْئَلوهُ الفِرْدَوسَ**﴾ رواه البخاري والترمذي. واتە: لەبەهەشت (١٠٠) پلە هەیە، نێوان هەر پلەیەك تا پلەیەك نێوان ئاسمان و زەوی یە بەهەشتی فیردەوسیش لە سەرووی هەموویانە، کەسەرچاوەی ئاوی بەهەشت لەوێیە، لەسەر ئەم بەهەشتەش بارەگای خوای لێیە، بۆیە ئەگەر داوای شتێکتان لەخوا کرد داوای بەهەشتی فیردەوسی لێ بکەن.

## پ٢٦٨/ ڕوبارەکانی بەهەشت چۆنن؟

و: خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿**مَثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ فِيهَا أَنْهَارٌ مِنْ مَاءٍ غَيْرِ آسِنٍ وَأَنْهَارٌ مِنْ لَبَنٍ لَمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُ وَأَنْهَارٌ مِنْ خَمْرٍ لَذَّةٍ لِلشَّارِبِينَ وَأَنْهَارٌ مِنْ عَسَلٍ مُصَفًّى....**﴾محمد ١٥. واتە: نموونەی ئەو بەهەشتەی کە پەیمانمان لێ بە بەهەشتی یەکان داوە، ڕوبارەکانی بریتین لەئاوی پاك و سازگارو چەندین ڕووباری شیر کە تام و بۆنی بەهیچ جۆرێك تێك ناچێو چەندین ڕووباری ئارەق کە زۆر بەتامە بۆ ئەوانەی کە دەیخۆنەوەو چەندین ڕووباری تریش لەهەنگوینی پاڵفتە کراویان بۆ هەیە.

## پ٢٦٩/ دارو درەختەکانی بەهەشت چۆنن؟

و: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿**إنَّ في الجنَّةِ لَشَجَرةً يَسيرُ الرَّاكِبُ في ظِلِّهَا مِائةَ عَامٍ لاَ يَقْطَعُهَا**﴾ رواه الشيخان. واتە: لەبەهەشت داری وای لێیە کەوا پیاو (١٠٠) ساڵان بەسواری بەژێریدا دەڕوات وسێبەرەکەی کۆتایی نایە.

## پ٢٧٠/ ژوورەکانی بەهەشت چۆنن؟

و: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿**إنَّ في الجنَّةِ لَغُرَفاً يُرى ظُهُورُها مِنْ بُطُونِها وبُطونُها مِنْ ظُهُورِها..**﴾ رواه الترمذي. واتە: بەهەشت ژووری وای لێیە کە لەجوانیان لە دەرەوە ژوورەوەی دیارەو لەژوورەوەش دەرەوەی دیارە.

## پ٢٧١/ ئەهلی بەهەشت چۆنن؟

و: ئەهلی بەهەشت بەم شێوەی خوارەوەن:

١) خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إنّ أصْحابَ الجَنّةِ اليَوْمَ في شُغُلٍ فاكِهُونَ هُمْ وأزواجُهُم في ظِلالٍ عَلى الأرائِكِ مُتّكِئُونَ لَهُمْ فِيهَا فاكِهَةٌ ولَهُمْ ما يَدّعُونَ سَلامٌ قَولاً مِنْ رَبٍّ رَحِيمٍ﴾ يس ٥٥.٥٨. واتە: بەڕاستی هاوڕێیانی بەهەشت لەم ڕۆژەدا سەرقاڵی خواردنی میوەجاتەکانن و خۆیان و خێزانەکانیان لەسەر سیسەم لەژێر سێبەرێکا شانیان داناوەو، ئینجا هەرچی سەوزەیەك داوا بکەن خوا پێیان ئەدا و ماوە ماوە لەلای خوای بەبەزەییشەوە سەلامیان لێ دەکرێت.

٢) پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿أهلُ الجنَّةِ جُردٌ مُردٌ كُحلٌ لايُفنَى شَبابُهُمْ ولا تَبْلَى ثِيابُهُمْ﴾ رواه الترمذي. واتە: هاوڕێیانی بەهەشت نە موو ونە ڕیشیان لێ نایەت و چاوەکانیشیان پڕە لە کل، نە گەنجێتی‌یان بەسەر دەبردرێ و نەجلەکانیشیان کۆن دەبن.

٣) هەروەها دەفەرمووێ: ﴿مَنْ ماتَ أهْلُ الجنَّةِ مِنْ صَغِيرٍ أوكَبِيرٍ يُرَدّونَ أبنـاءَ ثَلاثِينَ في الجَنَّةِ لايَزِيدونَ عَلَيْها أبَداً وكذلِكَ أهلُ النَّارِ﴾ رواه الترمذي. واتە: هەرکەسێ بمرێ لە ئەهلی بەهەشت چ بچووك بێ چ گەورە، دێنە سەر دۆخی تەمەنی (٣٠) ساڵی، نەکەم دەبنەوە و نە زیادیش دەبن، ئەهلی دۆزەخیش بەهەمان شێوەن.

٤) هەروەها دەفەرمووێ: ﴿إنَّ أوَّلَ زُمْرةٍ يَدخلُونَ الجَنَّةَ عَلى صُورةِ القَمَرِ لَيلَةَ البَدرِ والَّذينَ يَلونَهُمْ عَلى أشَدِّ كَوْكَبٍ دُرّيٍّ في السَّماءِ إضاءَةً لايَبولُونَ ولايَتَغَوَّطُونَ ولايَمتَخِطُونَ، أمشاطُهُمْ الذَّهَبُ ورَشْحُهُمْ المِسْكُ ومَجامِرُهُمْ الألُوَّةُ وأزْواجُهُمْ الحُورُ العَيْنُ أخلاقُهُمْ عَلى خُلُقِ رَجُلٍ واحِدٍ عَلى صُورةِ أبيهِمْ آدَمَ سِتُّونَ ذِراعاً في السَّماءِ ولِكُلِّ واحِدٍ مِنهُمْ زَوجَتانِ يُرَى مُخُّ ساقِهِما مِنْ وراءِ اللَّحْمِ مِنَ الحُسْنِ لا اختِلافَ بَيْنَهُمْ ولاتَباغُضَ قُلوبُهُمْ قَلْبُ واحِدٍ يُسَبِّحونَ بُكرةً وعَشِيّاً﴾ رواه الشيخان والترمذي. واتە: یەکەم کۆمەڵ کە دێنە بەهەشت شێوەیان لەمانگی چواردە دەکات، ئەوەی لەدوای ئەمانیشەوە دێن شێوەیان لە ئەستێرەیەکی پرشنگدار دەکات و دەبریسکێنەوە بەجۆرێك نەمیزیان هەیە نەپیسایی دەکەن و نەتف و نەچڵمیشیان هەیە، ئەم شانەیەی کەبەکاری دەهێنن لەزێڕ دروست کراوە ئارەقەکانیشیان لە میسك پێك هاتووەو بۆندارترین بخور لەم ڕۆژەدا دادەگیرسێنن، خێزانەکانیان حۆری عەینن و لەسەر یەك شێوە ڕەوشت ڕاهێنراون، شێوەشیان لە ئادەم دەکات کەوا (٦٠) باڵ درێژ بووە بەرەو ئاسمان، هەر یەکێکیش لەوانە دوو ئافرەتی بۆ هەیە، ئافرەتەکان هێندە جوانن لەجوانیان مۆخی ناو ئێسکیان لەگەڵ دیارە، ئینجا ئەم دوو ئافرەتە هیچ ڕق و بوغزێکیان لەگەڵ یەك دا نی‌یە، دڵی هەردووکیان لەیەك دڵ پێك هاتووەو بەیانیان و ئێواران خوای خۆیان بە پاك ڕادەگرن.

## پ۲۷۲/ ئافرەتەکانی بەهەشت چۆنن؟

و: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿ولو انَّ إمرأةً مِنَ نِساء اَهْل الجنَّةِ اطّلَعَتْ إلىَ الأرض لأضاءَتْ مابَيْنهُمَا ولَمَلأتْ ما بَيْنَهُما ريحاً ولَنَصيفُها خَيرٌ مِنَ الدُّنيا ومَا فيهَا﴾ رواه البخاري والترمذي. واتە: ئەگەر یەك ئافرەت لە ئافرەتانی بەهەشت سەر دەربێنێتە سەر زەوی ئەوا نێوان ئاسمانەکان و سەر زەوی ڕووناك دەکاتەوە و هەموو کون وکەلەبەرێکی ئەم زەوییە بۆنـدار دەکـات، ئەو چارۆگەیەی کە لەسەریشی دەکەن بەنرخترە لە دونیاو ئەوەی کە لە دونیا دا هەیە.

## پ۲۷۳/ یەکەم کەس کە دەچێتە بەهەشت کێ‌یە؟

و: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿..أنا أوَّلُ مَنْ يَقرَعُ بابَ الجنَّةِ..﴾ رواه مسلم. واتـە: من یەکەم کەسم کە لەدەرگای بەهەشت دەدەم.

## پ۲۷٤/ ئایا بەهەشتی‌یەکان خوای خۆیان دەبینن؟

و: بەڵێ، هەموو بەهەشتی‌یەك خوای خۆی دەبینێ، تـەنها دۆزەخی‌یـەکان نـەبن، هـەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿إذا دَخلَ اَهْلُ الجنَّة الجنَّة يَقولُ الله تَبارَكَ وتَعالىَ: تُريدُونَ شَيْئاً أزيدُكُمْ فيَقولُونَ: اَلَمْ تُبَيِّضْ وجوهَنا اَلَمْ تُدْخِلْنَا الجنَّةَ وتُنْجنا مِنَ النَّار قالَ: فَيَكْشِفُ الحِجابُ، فما أُعْطُوا شَيئاً أحَبَّ إليْهِمْ مِنَ النَّظَرِ الى رَبِّهِمْ عزَّ وجَلَّ﴾ رواه مسلم والترمذي. واتـە: کاتێ کە ئەهلی بەهەشت چوونە بەهەشت خوای گەورە پێیان دەفـەرمووێ: ئایا چیتـرتـان دەوێ تاکو بۆتـانی زیادکـەم؟ ئـەوانیش دەڵێـن: ئـەی ڕووی ئێمـەت سپی نـەکردەوە، ئـەی نەتبردووینـە بەهەشت، ئەی لە ئاگر دەربازت نەکردین؟ ئینجا لەو دەمە ئەو پەردەی کەلە نێوان خـوا و (پاشـان) خەڵکی هەیە، لادەدرێت هەرهەموویان بە چاوی خۆیان خوای خۆیان دەبینن؟!! هیـچ شـتێك لـەم کاتە دا لە بینینی خوا خۆشتر نی‌یە.

## پ۲۷٥/ ئایا تا ئێستا بەهەشت دروست کراوە؟

و: بەڵێ، هەروەك خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿وَسَارِعُوا إلَى مَغْفِرَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَوَاتُ والأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ﴾ آل عمران ۱۳۳. واتە: پێشبڕکێ بکەن بـۆ لێبوردەیـی خوای پەروەردگارتان و بەهەشتێك کەبەرینایی بەقەد ئاسمانـەکان و زەوی‌یـە، کـە بـۆ پارێزکارانمـان ئامادەکردووە.

## پ٢٧٦/ ئایا بەهەشتیو دۆزەخییەکان یەکتری دەبینن؟ ئایا چی بە یەکتر دەڵێن؟

و: بەڵێ هەردوولا یەکتر دەبینن و قسەش لە گەڵ یەکتر دەکەن، بۆ نموونە: بەهەشتییەکان روو لەدۆزەخییەکان دەکەن و دەڵێن: ﴿وَنَادَى أَصْحَابُ الْجَنَّةِ أَصْحَابَ النَّارِ أَنْ قَدْ وَجَدْنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقًّا فَهَلْ وَجَدْتُمْ مَا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا، قَالُوا نَعَمْ، فَأَذَّنَ مُؤَذِّنٌ بَيْنَهُمْ أَنْ لَعْنَةُ اللهِ عَلَى الظَّالِمِينَ﴾ الأعراف ٤٤. واتە: بەهەشتییەکان بانگی دۆزەخییەکان دەکەن و دەڵێن: ئێمە دەستمان کەوت لەو بەهەشتەی کە خوا پەیمانی پێ دابووین، ئایا ئێوەش وەدەستتان گەیشت لە ئازارو سزای ئەو دۆزەخەی کە کاتی خۆی پەیمانتان پێ درابوو؟ گوتیان بەڵێ: ئینجا لەم کاتەدا بانگ کەرێ بانگ دەکاو ئەڵێ: نەفرەتی خوا لەوانەبێ کە زۆردارو ستەم کارن.

هەروەها دۆزەخییەکان بەهەمان شێوە روو دەکەنە بەهەشتییەکان و پێیان دەڵێن: ﴿وَنَادَى أَصْحَابُ النَّارِ أَصْحَابَ الْجَنَّةِ أَنْ أَفِيضُوا عَلَيْنَا مِنَ الْمَاءِ أَوْ مِمَّا رَزَقَكُمُ اللهُ، قَالُوا إِنَّ اللهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى الْكَافِرِينَ، الَّذِينَ اتَّخَذُوا دِينَهُمْ لَهْوًا وَلَعِبًا وَغَرَّتْهُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا فَالْيَوْمَ نَنْسَاهُمْ كَمَا نَسُوا لِقَاءَ يَوْمِهِمْ هَذَا وَمَا كَانُوا بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ﴾ الاعراف ٥٠-٥١. واتە: دۆزەخییەکان بانگی بەهەشتییەکان دەکەن و دەڵێن: هێنێك ئاو یان لەو خواردنەی کە خوا بە ئێوەی بەخشیوە بماندەنێ، (بەهەشتییەکان) پێیان دەڵێن: خوا ئەوانەی لەسەر بێ بڕوایان حەرام کردووە، ئەو کافرانەی کە دینی خوایان بە گەمەو گاڵتە گرتبوو و ژیانی دونیا فریوی پێ خواردبوون، بۆیە ئێمەش ئەمڕۆ لەیادیان دەکەین هەروەك چۆن ئەوان کاتی خۆی دیداری ئەم ڕۆژەیان لەیاد کردبوو و نکوڵیان لەئایەتەکانی ئێمە دەکرد.

## پ٢٧٧/ (الأعراف)[1] چییە؟

و: (اعراف) شوێنێکە دەکەوێتە نێوان دۆزەخ و بەهەشت، کەبریتییە لە شوێنی ئەو کەسانەی کە خێرو شەڕیان چاکەو خراپەیان وەکو یەکە، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَبَيْنَهُمَا حِجَابٌ وَعَلَى الْأَعْرَافِ رِجَالٌ يَعْرِفُونَ كُلًّا بِسِيمَاهُمْ وَنَادَوْا أَصْحَابَ الْجَنَّةِ أَنْ سَلَامٌ عَلَيْكُمْ لَمْ يَدْخُلُوهَا وَهُمْ يَطْمَعُونَ، وَإِذَا صُرِفَتْ أَبْصَارُهُمْ تِلْقَاءَ أَصْحَابِ النَّارِ قَالُوا رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ، وَنَادَى أَصْحَابُ الْأَعْرَافِ رِجَالًا يَعْرِفُونَهُمْ بِسِيمَاهُمْ قَالُوا مَا أَغْنَى عَنْكُمْ جَمْعُكُمْ وَمَا كُنْتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ، أَهَؤُلَاءِ الَّذِينَ أَقْسَمْتُمْ لَا يَنَالُهُمُ اللهُ بِرَحْمَةٍ ادْخُلُوا الْجَنَّةَ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمْ وَلَا أَنْتُمْ تَحْزَنُونَ﴾ الأعراف ٤٦-٤٩. واتە: لەنێوان دۆزەخ و بەهەشت پەردەیەك هەیە لێکی جیا کردوونەتەوە، وە لەسەر بەرزیو ئەو پۆپەی ئەم پەردەیەکە لە نێوان بەهەشت و

---

[1] دەربارەی (اعراف) سەعدی شیرازی لە شیعرێکی فارسیدا دەڵێ:

**از دوزخیان اعراف جنتش　　　　واز جنتیان اعراف دوزخش**

واتە: دۆزەخییەکان وا تێ دەگەن کە ئەعراف بەهەشتە و بەهەشتییەکانیش وا تێ دەگەن کە ئەعراف دۆزەخە. هەرچەندە نازانم بەڵگەی ئەم شاعیرە لەم پێناسەیە چییە، بۆیە دەشکرێ وەر نەگیرێ.

دۆزەخ دایە چەند پیاوێك هەیە کە هەموو ئەهلی بەهەشت و دۆزەخ بە دیمەن دەناسن، ئەم (پیاوانە) بانگی بەهەشتی یەکان دەکەن و دەڵێن: درودی خواتان لەسەر بێ (ئەوکاتە دا خوای گەورە دەفەرموێ:) ئەم پیاوانە نەچوونەتە بەهەشت و کەچی زۆریش تامەزرۆنە بۆچوونە ناوی، کاتێکیش کە ڕوو دەکەنە دۆزەخی یەکان (و پێ یان دەڵێن): خودایە مەمانگێڕە بە کۆمەڵی زۆردارو ستەمکاران، ئینجا ئەم پیاوانە بانگ ئەکەن لەچەند پیاوێ کە بەسیماو شێوەکانیانەوە دەیانناسن و پێ یان دەڵێن: بەڕاستی تاقم بوون و کۆبوونەوەکەتان (بەگەورە تەماشا دەکرد) بەڵام هیچ سوودی پێ نەگەیاندن وخۆ بەگەورە زانینیشتان هەر بە پووچی مایەوەو سوودی پێ نەگەیاندن، (هەروەها) پێ یان دەڵێن: ئایا ئەم تاقمە مسوڵمانە بوو (لەو دەمە ئاماژە بۆ بەهەشتی یەکان دەکەن) کەوا کاتی خۆی سویندتان دەخواردو پێتان وابوو کە ناکەونە بەر ڕەحمەتی خوا؟(کەوانە ئێستا خودا بەهەشتی پێ بەخشیون؟) (ئینجا بە بەهەشتی یەکان دەڵێن): فەرموون بڕۆنە ناو ئەو بەهەشتە کە بۆتان ئامادە کراوەو هیچ ترس و بیمتان لەسەر نابێ و دڵگرانیش نابن...

# بەشی یازدەیەم

# باوەڕ بە قەزا و قەدەر

## پ٢٧٨/ قەزاوقەدەر (القضاء والقدر) چی‌یە؟

و: یەکێکە لەشەش بنچینەکانی بیروباوەری مرۆڤی مسولمان، واتە مرۆڤ بە بێ‌بروا هەبوون بەوە کە خۆشی و ناخۆشی، چاك وخراپ، قەزا و قەدەری خوایە، بەمرۆڤێکی مسولمان و برواداردانانرێ. چەمك و واتای (قەزا و قەدەر)یش زانایان بەزۆر جۆر لێکیان داوەتەوە، بۆنموونە: (راغب الاصفهاني) دەربارەی ووشەی (قدر) دەڵێ:

(قەدەر) یانی روونکردنەوەی ئەندازەی شت... ئەوە کە ئەو شتە بگیرێ بەئەندازەیەکی تایبەتی، دەربارەی ووشەی (قضاء)یش دەڵێ: (قضاء)یانی جێ‌بەجێ کردنی شتێك، جا ئەوشتە قسەبێ یان کردەوە.

وە قەزای (خودا) لەقەدەر تایبەتی‌ترە چونکە (قەدەر) بریتی‌یە لە ئەندازەگیری (تقدیر) بەڵام (قەزا) بریتی‌یە لەدابرین و جێ بەجێ کردن، هێندێك زاناش گوتوویانە: قەدەر وەکو ئەو شتە وایە کە بۆ پێوان سازکرابێ، وە قەزا وەکو پێوان وایە.

کەواتە (قەدەر) یانی: ئەندازەگیری و نەخشەکێشان وبەرنامەدانانی خودا بۆ هەرچی هەبووە و هەیە و دەبێ، هەر لە ئەزەلەوە و هەتا ئەبەد. (قەزا) یانی: حوکم کردنی خوا بەجێ بەجێ کردنی ئەو شتانەی کە لە ئەزەلەوە زانیاری و ئیرادەی بێ سنووری پەیوەندی‌یان پێوە بەستوون لەکات و شوێنی تایبەتی‌داو بە شێوە و چۆنیەتی دیاری کراویان.

## پ٢٧٩/ بڕوابوون بە (قەزاو قەدەر) یانی چی؟

و: واتە بڕوابوون بەوەی کە هەموو شتێك: ماددی یان نامادی، زانیاری‌و ئیرادەی خودا لە ئەزەلەوە پەیوەندی‌یان پی‌یەوە هەبوو، وە هەرچی هاتۆتەدی یان دێتەدی بەپێ‌ی ویستی خودا هاتۆتەدی یان دێتەدی و بەبێ ئیرادەی خودا هیچ شتێك نایەتەدی و بەرگی بوون ناپۆشێ. خوداش بۆیە خودایە چونکە پەدیهێنەر و پەیداکەری غەیری خۆیەتی.

## پ٢٨٠/ ئایا ئینسان تاچەندی ئازادە لە ئاقار قەزاو قەدەر؟

و: پێش ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بدرێتەوە پێویستە پێشەکی هەرکەسێك کە خۆی بە مسوڵمان بزانێ سێ (٣) خاڵی گرنگ لەبەرچاو بگرێ‌و بڕوایەکی پتەوی دوور لە دوودڵی پێیان هەبێ:

١) هیچ شتێك نی‌یە مومكین بێ هەبێ و لەژێر ركێفی زانیاری و ویستی خۆیدا نەبێ، هەرچی هەبووە و هەیە و دەگونجێ پەیدا بێ لەئەزەلەوە لەودەمەیدا كە جگە لە خودا هیچ شتێك نەبووە، خودا زانیاری هەبووە لەسەر پەیدابوونی. هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَيَعْلَمُ مَا فِي السَّمٰوٰتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾ آل عمران٢٩. واتە: خودا هەرچی لە ئاسمانەكان وهەرچی لەزەویدا هەیە دەزانێ.

٢) خوای پەروەردگار دادگەر (**عادل**) وكاربەجێ (**حكیم**)ە بە جۆرێك ستەم لە هیچ لە دروستكراوەكانی خۆی ناكات و هیچ كارێكی بێ‌جێشی لێ ناوەشێتەوە. هەروەك خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿أَلَيْسَ اللهُ بِأَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ﴾التین ٨. واتە:ئایا خودا داد گەرترین و حوكم گێڕو فەرمانڕەوا نی‌یە؟ یان دەفەرمووێ: ﴿وَكَانَ اللهُ عَلِيماً حَكِيماً﴾ النساء ٩٢، واتە: خودا زاناو كارزانە.

٣) ئینسان ئازادە و بە ویستی خۆی دەژی: هەروەك خوای گەورە و كاربەجێ دەفەرمووێ: ﴿فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ﴾ الكهف٢٩. واتە: جاكی دەیەوێ باباوەڕ بێ وكێش دەیەوێ بابروا نەیەنێ و (كافربێ)

ئینجا بۆ وەڵامی پرسیارەكەش هەر لە كۆنەوە سێ (٣) جۆرە وەڵام سازكراون:

- **وەڵامی جەبرییەكان (الجبرية):**

دەڵێن: بەڵێ خودا هەر لە ئەزەلەوە كوفر و خراپەی لە كافرو خراپكاران زانیوە و ویستووە هەر بۆ خۆشی ئەو كوفر و خراپانەی تێدا خولقاندوون و مرۆڤ لە دەست و توانا و ویستی خوادا وەكو قەڵەمێك (پێنوس) وایە لە چنگ نووسەردا و هەرچی دەیكات و لێی وەدی دێت لە چاكە و خراپە بۆ خۆی هیچ دەستی تێدا نی‌یە و خودا پێی‌ی دەكات.

- **وەڵامی موعتەزیلەكان (القدرية):**

دەڵێن: نەخێر، خودا ویستی لەسەر تاوان وخراپەی تاوانباران نەبووە و پەدیهێنەری كردەوەكانی مرۆڤ نی‌یە، ئاواش نەبێ دادگەری خودا ناچەسپێ.

- **وەڵامی جەماوەری مسوڵمانان:(جمهور المسلمين)** كە لە كۆنەوە بە (اهل السنة) ناسراون، دەڵێن: شتێكی ئاشكرایەكە ئەم بوونەوەرەی تێدا دەژین سێ جۆرە دروستكراو (**مخلوق**)ی تێدا هەن:

١) تۆبزی لێ كراو و بێ ئاگا: كە ماددەی بێ گیان و رووەكە، بۆنموونە: رۆژ هەموو بەیانی‌یەك بەناچاری لە رۆژهەڵاتەوە دەبێ بێ بۆ رۆژئاوا و ئێواری ئاوا دەبێ، بێ‌ئەوەی هەست بكات و ئاگاداری ئەو كار وكردەوەی خۆی بێ.

٢) تۆبزی لێ كراوی ئاگا: كەگیاندارانن، بۆ وێنە: مێشەنگوین (هەنگ) بەپێی سروشت و غەریزەیەكی خوارسك شیلی گوڵان دەمژێ و هەنگوین دروست دەكات، هەرچەندە هەستیش بە كردەوەی خۆی دەكات، بەڵام بە ناچاری و تۆبزی لێكراو (مجبور)ە.

٣) ئازادی تەگا: کە ئینسانە و هەزارەها کردەوە و ڕەفتاری چاك و خراپی لێ‌دەپشکوێتەوە بە ئاگاداری و ویستی خۆی.

**کەواتە:**

وەلامی ڕاستەقینەش بۆ پرسیارەکە، هەر وەلامەکەی سێیەمە، کە وەلامی **(اهل السنة والجماعة)**یە.

## پ٢٨١/ ئەی وەلامت چی‌یە دەربارەی هەلوێستی جەبری‌یەکان یان موعتەزیلەکان لە ئاقار ئازادی‌و نا ئازادی ئینسان؟

و: دەربارەی ڕای جەبری‌یەکان دەلێین:

١) ڕاستە خودا لەئەزەلەوە کوفر و خراپەی لەکافر و خراپکاران زانیوە و ویستووە، وە ڕاستە خودا بەدیهێنەری هەموو شتێکە تەنانەت کردەوەی بەندەکانیش. بەلام ڕاست نی‌یە کە هەرچی مرۆڤ دەیکات خودا پێی دەکات و بۆ خۆی هیچ دەستی تێدا نی‌یە بەلکو ڕێرای ئەوەی کە خودا یارمەتی مرۆڤ دەدات بۆ بەدیهێنانی کردەوەکان، مرۆڤیش بۆ خۆی بە ئیرادەی خۆی کردەوەکان هەلدەبژێرێ و دیاری‌یان دەکات.

٢) ڕاست نی‌یەکە خودا هەر بۆ خۆی تاوان و خراپە بە بەندەکانی دەکات و سزاشیان دەدات بەلکو خوا لەسەر ئەو کردەوانە مرۆڤ سزا دەدات کە بۆ خۆی بە ئیرادە و هەلبژاردنی خۆی ئەنجامیان دەدات.

٣) ئەوەی ڕوای لە جەبری‌یەکان کردووە کە سیفەتی ستەم **(ظلم)** و بێ دادی پالدەنە لای خوای پاك ئەوەیە کە ویستوویانە لە کاردانەوەی **(رد الفعل)**ی موعتەزیلەکان بەرگری لە زانیاری و ئیرادە و دەسەلاتی خودا بکەن.

وە دەربارەی موعتەزیلەکانیش دەلێین:

١) ناگونجێ بگوترێ خوا ویستی لەسەر تاوان و خراپەی تاوانباران نەبووە چونکە ماقوول نی‌یە شتێك لە مولکی خودادا ڕوو بدات بەبێ ئیرادەی وی، دیسان ئەگەر بلێین خودا نەی ویستووە بابای کافر کافر بێ و خراپە بکات بەلام بە پێچەوانەی ویستی خوداوە کافر بوو و خراپەی کرد مانای وایە ویستی بەندەیەکمان بەسەر ویستی خودا زال کرد، هەروەك خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ التکویر ٢٩. واتە: ناتانەوێ تا خوانەیەوێ.

٢) وە ناگونجێ بگوترێ خودا کردەوەکانی مرۆڤی نەخولقاندوون و مرۆڤ خۆی خالیقی کردەوەکانیەتی، چونکە ئەگەر وا بلێین وێرای ئەوەی کە هەندێك لە دروستکراوەکانی خودامان لەژێر ڕکێفی خوادا دەرهێناوە هاوبەشیشمان بۆ بڕیارداوە چونکە وێرای وی ئینسانیشمان بەخالیق و بەدیهێنەر لەقەلەم داوە، خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيْءٍ﴾ الزمر ٦. واتە: خودا بەدیهێنەری هەموو شتێکە. (واتە هەرچی هەیە خوا خولقاندوویەتی).

٣) ئینجا ئەوەی کە پاڵی بە (موعتەزیلەکان)ەوە ناوە کە ئاوا لە تەسک کردنەوە و گچکە کردنەوەی ئیرادە و توانای خواوەوخۆکەون بریتیی بوو لەچەسپاندن و سەلماندنی دادگەری خودا.

## پ٢٨٢/ کاتی یەکێك یەکێك دەکوژی ئایا بەدیهێنەرو بەڕێوەبەری ئەو کوشتنە خودایە یان بابای پیاوکوژ (قاتل)؟ واتەڕای جەبریەکان ڕاسترە یان موعتەزیلەکان لە ئاقار ئەم پرسیارە؟

و: پێش ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە پێویستە دوو مەسەلە ڕوون بکرێتەوە:

١ـ زانیاری (علم) و ویست (ارادة) و توانا (قدرة)ی خودا وەکو سێ ئەڵقەی زنجیرێك پێکەوە پەیوەستن و لێك جوێ نابنەوە، چونکە هەرچی لەئەزەلەوە زانیاری و ویستی خودا پەیوەندیيان پێوە بەستبێ حەتمەن هەر بە توانا و دەسەڵاتی ویش پەیدا دەبێ.

٢ـ ویست (إرادة) و ڕەزامەندی (رضاء)ی خودا لێك جودان، چونکە هەرچی ئینسان وغەیری ئینسانیش ئەنجامی دەدات خێر بێ یان شەڕ حەتمەن بە پێی ئیرادەی خودایە و ئەوەی خودا ویستی لەسەر نەبێ نابێ، بەڵام مەرج نی یە هەرچی بەپێی ویستی خودا دێتە دی پێشی ڕازی بێ. چونکە خودا بەس بە چاکە ڕازیە و فەرمانی پێدەکات و بە خراپە نارازیە و بەرهەڵستیشی لێ کردووە، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ وَإِنْ تَشْكُرُوا يَرْضَهُ لَكُمْ﴾الزمر٦٢. واتە: خودا ڕازی نی یە بەندەکانی کافربن، وە ئەگەر سوپاسی بکەن لێتان ڕازی دەبێ و بۆتان قبوڵ دەکات. ئینجا بۆ وەڵامی پرسیارەکە.

ئێمە دەڵێین ڕای هیچ کامێکیان ڕاست نی یە، نە بەس خودا بەتەنێ ئەوکارەی ئەنجامداوە، تاکو قسەی جەبریەکان ڕاست دەرچێ، وە نە مرۆڤیش بە تەنێ ئەنجامی داوە، تا قسەی موعتەزیلەکان ڕاست دەرچێ، بەڵکو لەڕاستیدا هەم خودا و هەم مرۆڤیش کاریگەرێتی هەبووە لە هێنانەدی ئەو کارەدا. بابزانین چۆن:

جارێ لەو لایەنەوە کە هەر لە ئەزەلەوە زانیاری و ویستی خودا پەیوەندیيان بەوکارەوە بەستوە، بە توانای خوداش هاتۆتە دی، ئەوە خودا تێیدا بەشدارە، دیسان لەولایەنەوە کە بابای پیاوکوژ بە ویست و هەڵبژاردنی خۆی ئەوکارەی ئەنجامداوە، مانای وایە ئەویش تێیدا بەشدارە.

بۆ نموونە: گریمان کورسی یەکی کارەبایی هەیە جێی مرۆڤێك دەبێ تێیدا دانیشێ کابرای دانیشتوو بۆکوێی بوێ بۆ وێ بچێ، بۆ مەی خواردنەوە، یان بۆ جیهاد، وە ئەوکورسی یە بە هۆی دینەمۆیەکەوە کاربکات و بەسەری ڕابگات، وە کابرای دانیشتوو بۆ کێی بوێ یارمەتی بدات و کورسی یەکەی بۆ بئاژوێ: جارمجارەش ئاگاداری بکاتەوە پێی بڵێ:

کورە هەرچی بکەی بۆکوێ مەبەستت بێ یارمەتیت دەدەم و دەستت ناگرم، بەڵام فلان کار مەکە خراپە و سزای لەسەرە فلانە ئیش بکە چاکە و پاداشتی لە دوایە. بێگومان پیاوی نێو کورسی دیارە بە ویستی خۆی چاکە و خراپەکانی دەکات، بەڵام نەك بە تەنیا و سەربەخۆ، بەڵکو بە یارمەتی و هاوکاری ئەو کەسەی کە لە سەر دینەمۆیەکە و کورسی یەکەی بۆ بە جوڵە دێنێ.

ئینجا دیارە کابرای نێو کورسی‌یەکە ناتوانی بڵێ: کە من بۆخۆم بەتەنێ بێ یارمەتی هیچ کەس چاکە و خراپەکانم کردوون، و ناشتوانێ بڵێ: من بە تۆبزی ئەو کردەوانەم پێ کراون و هیچ دەستم تێیان دانەبووە دەجا مەسەلەی کاریگەری مرۆڤیش سەبارەت بە کردەوەکانی بە هەمان شێوەیە. خواش لە ئاقار ویستی ئادەمیزاد دەفەرمووێ: ﴿فَمَنْ شَآءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَآءَ فَلْيَكْفُرْ﴾ الكهف ٢٩. واتە: جاکێ هەیەوی با بروا بێنێ و کێ دەیەوێ با کافر بێ.

## پ٢٨٣/ ئەی بۆچی خوا دەفەرمووێ: ﴿فَيُضِلُّ اللهُ مَنْ يَشَآءُ وَيَهْدِي مَنْ يَشَآءُ﴾ ابراهيم ٤؟ واتە: خوا کەسەکی بیەوێ گومرای دەکات و هەرکەسێکی بیەوێ ڕێنموونی دەکات. ئایا ئەم ئایەتە واناگەیەنێ کە ئادەمیزاد بۆ خۆی وەدیهێنەری کردەوەکانی خۆی نی‌یە؟

و: نەخێر، بەڵکو ئەم ئایەتەش بەڵگەیە لەسەر ئازادی مرۆڤ، چونکە خوا دەیەوێ کەسێك گومرا بکات، کە ئەو ئینسانە بۆ خۆی گومرایی هەڵبژاردبێ، کەسێکیش ڕێی ڕاستی هەڵبژاردبێ خوا ڕێی ڕاستی پێ ئەبەخشێ. هەروەك خوای باڵا دەست دەفەرمووێ: ﴿فَإِنَّ اللهَ لاَيَهْدِي مَنْ يُضِلُّ﴾ النحل ٣٧ ـ واتە: بێگومان خوا ڕێنمایی گومرابووان ناکات، واتە: کەسێك گومرایی هەڵبژێرێ (خوا گومرای دەکات). هەروەها دەفەرمووێ: ﴿فَإِنْ أَسْلَمُوا فَقَدِ اهْتَدَوا﴾ آل عمران ٢٠، واتە: ئەگەر مسوڵمان بوون (ئەوەدەمە) ڕێنمایی (خوا) وەردەگرن.

## پ٢٨٤/ ئایا بروا بوون بە قەزا و قەدەر دەبێتە هۆی پاڵدانەوە و واز هێنان لە کارەکانی دونیا؟

و: نەخێر: بەڵکو بروا هەبوون بە قەزاو قەدەر مایەی جووڵان و کارکردن و خەبات و ڕەنج دانە، چونکە بەبێ هەوڵ و ڕەنج دان هیچ بۆ ئینسانێك نایەتەدی، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَأَنْ لَيْسَ لِلإِنْسَانِ إِلاَّ مَا سَعَى﴾ النجم ٣٩. واتە: هیچ شتێك بۆ مرۆڤ نی‌یە جگە لەوەی کە هەوڵی بۆ دەدات.

## پ٢٨٥/ ڕێنمایی کردنی خوا (الهداية) چەند بەشە؟

و: ڕێنمایی کردنی خوا دەکرێت بە چوار بەش:

**یەکەم**: ڕێنمایی کردنی بوون (**هداية الفطرة**) بۆ ئەو مەبەستەی کە لە پێناویا دروست کراوی. هەروەك کاتی خۆی (**فرعون**) لە حەزرەتی (**موسى**) (عليه السلام)ی پرسی: کێ پەروەردگاری ئێوەیە؟ لەوەڵامدا گوتی: ﴿قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى﴾ طه ٥٠. واتە: گوتی پەروەردگاری ئێمە ئەو خوایەیە کەوا هەر شتە و سیما و شێوەی دروست کردنی خۆی داوەتێ ئەمجا ڕێنمایی کردووە. خوای گەورە مریشکی بە جۆرێ دروست کردووە و ڕێنمایی کردووە کەوا لە هەفتەی سێیەمدا، نەختێك باڵەکانی لەسەر هێلکەکانی بلندکاتەوە بۆ ئەوەی جووجەڵەکانی بە ئاسانی ئۆکسجین ($O_2$) وەرگرن و هەناسە بدەن جا ئەگەر وا نەبووایە جووجەڵەکان بە هەناسە

سواری دەمردن. دیسان خوای گەورە بەجۆرێکی وا (سەگ)ی دروست کردووە کەوا بەبێ چاودێری کردن و سەرپەرشتی شەوان هەمووی بە پاسەوانی یەوە بیاتە سەر....بێ گومان هەموو بونەوەرێك لەسەر زەوی بۆ مەبەست و پەیامێك درووست کراوە و ئەویش بۆچ مەبەستێك دروست کراوە بەجی ی دەهێنی.

**دووەم**: ڕێنمایی کردن: ئەمەش پەیامی پێغەمبەران و پیاوچاکانە، مەبەست لەم ڕێنمایی کردنە بڕینی ڕێگەی بیانووی بەندەکانە لەسەر (خوا) کە ئەفەرمووێ: ﴿رُسُلاً مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ لِئَلاَّ يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ﴾ النساء ١٦٥. واتە: پێغەمبەرانی مـوژدەدەر بەپاداشت و ترسێنەر، (بەسزا) بۆ ئەوەی خەڵکی ئیتر هیچ بیانوویەکیان نەمێنێ لەسەر خواوە لە پاش ناردنی ئەم پێغەمبەرانە، هەر کەسیش پاش ئەم ڕێنمایی کردنە گومرا بێت ئەوە بێگومان بە ئاگادری و زانینەوە گومرا بووە... هەروەها دەفەرمووێ: ﴿وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَاهُمْ فَاسْتَحَبُّوا الْعَمَى عَلَى الْهُدَى﴾فصلت ١٧. واتە: ئێمە ڕێنمایی گەلی (ثمود)مان کرد، کەچی ئەوان کوێریان پێ خۆشتربوو لەڕێنمایی[1]. هەر لەم بوارەدا خوای گەورە بە پێغەمبەری ئیسلام ﷺ دەفەرمووێ: ﴿وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ﴾ الشورى ٥٢. واتە: بە ڕاستی تۆ ڕێ نیشاندەری ڕێگای ڕاستی.

**سێیەم**: ڕێنمایی کردنی یارمەتی دان (هداية التوفيق) بۆکردەوەی چاك ئەمەش تەنها بەدەستی خۆیەتی. ئەم ڕێنمایی کردنە لەوکارانەیە کەوا لە توانای هیچ کەس دانی یە تەنها خوا نەبێت: ﴿وَمَا تَوْفِيقِي إِلاَّ بِاللهِ﴾ هود٨٨. واتە: سەرخستن و یارمەتی دانم تەنها بەدەست خوایە. دیسان قورئان پێمان دەڵێ: هیچ ئادەمی یەك توانای ڕێنمایی کردنی یارمەتی دانی نی یە، تەنانەت پێغەمبەریش کە خوای گەورە پی ی دەڵێ: ﴿إِنَّكَ لاَ تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ﴾القصص٥٦. واتە: بێگومان تۆ ناتوانیت ڕێنمایی ئەو کەسانە بکەیت کە خۆشت دەوێن، بەلام خوا هەر کەسی بوێ ڕێنمایی دەکات.

**چوارەم**: ڕێنمایی کردنی باوەڕدارەکان بۆ ماڵەکانیان لە بەهەشتدا: خوای گەورە ئاگاداری کردوون کەوا بەهەشت بەرین و فراوانە، کەوابوو ئایا خەڵکەکە چۆن ئەتوانن بەئاسانی ماڵەکانیان تیا بدۆزنەوە، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَالَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللهِ فَلَنْ يُضِلَّ أَعْمَالَهُمْ، سَيَهْدِيهِمْ وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ، وَيُدْخِلُهُمُ الْجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمْ﴾ محمد ٤-٥-٦. واتە: ئەوانەی کەوا لە ڕێگەی خوادا شەهید بوون، کردەوەکانیان وون نابێ و خوای گەورە لەداهاتوودا ڕێنموونیان ئەکاو بارو دۆخیان چاك ئەکا و ئەمجا ئەیانخاتە ئەو بەهەشتەوە کەپی ی ناساندوون، ئەوانیش بەم ڕێنموونی یە ماڵەکانیان تیا ئەدۆزنەوە.

فەرموودەی خوا ﴿سَيَهْدِيهِمْ﴾ لە پاش شەهید بوون لە پێناوی خوادا هاتوە کەواتە خوا پاش مردنیان ڕێنمایی یان ئەکات بەرەو ماڵەکانی بەهەشتیان. کەوا پی ی ناساندوون ئەوانیش بەم ڕێنمایی کردنە ماڵەکانیان ئەدۆزنەوە.

---

[1] ڕێنمایی کردن لێرە دا بەمانای فێرکردن و ڕێ نیشاندان هاتووە.

## پ٢٨٦/ ڕێ نمایی کردنی یارمەتی‌دان، کێ‌پێی بەختەوەردەبێ؟

و: خوای پەروەردگار ئەم ڕێنماییەیە بەکەسێك ئەبەخشێ کە ئەم دوو خەسڵەتەی تیا بێتەدی:

**یەکەم**: پێغەمبەران بکات بەچاوساغ و چرای ڕێ نیشاندەریان و رازی بوون بە ڕێنمایی‌یەکانیان. هەرکەسێکی باوەڕی بە پێغەمبەران نەبێ و مل پێچی لەڕێنمایی کردنیان بکات، لەڕێنمایی کردنی یارمەتی دان (التوفیق) بێ‌بەش ئەکرێ، بۆنموونە:

ئەگەر شوفێرێك پرسیاری لێ کردیت کەوا ڕێگەی پێ نیشان دەیت ئینجا پاش ئەوەی تۆش ڕێنموونیت کرد ڕێزی قسەکانی گرتیت و سوپاسی کردیت ئەوا جارێکی تر ئەگەر ئەم کابرایە ئۆتۆمبێنەکەی پەکی کەوت مافی لەسەرت هەیە یارمەتی بدەیت.

بەڵام ئەگەر ڕێنموونی‌یەکەی تۆی وەرنەگرت و چەنەبازی و زمان درێژی کرد لە رووتا، ئیتر هیچ مافێکی لەسەرت نامێنێ ئەگەر جارێکی تر ئۆتۆمبێلەکەی پەکی بکەوێ.

نموونەی بەرز و باڵاش تەنها شایانی خوای گەورەیە.

**دووەم**: بوونی ئارەزووی کردەوەی چاك و خێر لە ناو دڵ و مێشکی ئەو کەسەدا. چونکە خوای گەورە هەر مرۆڤێك بەگوێرەی نیاز و کردەوەی خۆی ڕێنمایی دەکات و دەفەرمووێ: ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى، وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى﴾ اللیل ٥-٧. واتە: ئەو کەسەی ببەخشێ و لە خوا بترسێ و بڕوای ببێ بە چاکە، زوو یارمەتی ئەدەین بۆ ڕێی ئاسان (کەچاکەیە).

هەروەها دەفەرمووێ: ﴿وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَى، وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَى، فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَى﴾ اللیل ٨،٩،١٠. واتە: ئەوکەسەش ڕژدی و ڕەزیلی بکات و خۆی بێ نیاز بزانێ و بڕوای نەبێ بە چاکە زوو ڕێی سەختی بۆ ئاسان ئەکەین.

## پ٢٨٧/ قەزا و قەدەر دەکرێت بە چەند بەش؟

و: ئەو قەزا و قەدەرەی کە بە دەست خۆی نی‌یە وەك (کورت ودرێژی جوانی ناشرینی و زیرەکی وتەمبەڵی).

ئەمانە باسکران هیچێکیان بە دەستی ئینسان نی‌یە. هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿هُوَ الَّذِي يُصَوِّرُكُمْ فِي الْأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَاءُ﴾ آل عمران٦. واتە: ئەو خوایەی کەوا چۆن بیەوێ لە ناو منداڵدانا وێنە و نەخشەی ئێوە دەکێشێ. کەواتە ئینسان لەم خاڵەدا سەربەستی نی‌یە واتە (مُسَیر)ە و (مُخَیر) نی‌یە. بۆیە لەسەریان بەر پرسیار نی‌یە.

٢- ئەو قەزا و قەدەرەی کە پێویستی بە چارسەرکردنی هەیە:

بۆ نموونە نەخۆش دەبێ چارسەر بکرێ و قوتابی دەبێ بخوێنێت و ئاگر دەبێ تخوونی نەکەوێت....

کەواتە: هەر کام لە نەخۆشی و قوتابی و ئاگر لە قەزا و قەدەرەوە بڕیار دراوە بەڵام پێویستیشیان بە ماندوو بوون هەیە تاوەکو چارسەری بکەیت. هەروەك دەگێرنەوە کاتێك کە (عومەری کوڕی خەتتاب) ڕەزای خوای لێ‌بێ ویستی بچێت بۆ وولاتی (شام) ئاگاداریان کردەوە کەوا پەتای ڕشانەوە (الطاعون) لەم وولاتەدا بلاو بۆتەوە، ئەویش بەمە سەردانەکەی دوا خست.

دەڵێ کە (ابو عبیدەی کوڕی جراح) ڕەزای خوای لێ بێ پێی گوت: ئـەی میری مـسوڵمانان ئایا لەدەست قەدەری خوا هەڵدێی؟ عومەریش لەوەڵامدا پێی گوت: لەدەست قەدەری خوا هـەڵدێم بـۆ دەست قەدەری خوا. کەواتە قەزاو قەدەر نابێتە هۆی پاڵدانەوەو کۆشش نەکردن.

٣ـ ئەوەی کە ئینسان تیایا سەربەستە لە سنووری ئەم سەربەستی‌یە بەرپرسیارە. هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ﴾ الكهف ٢٩. واتە: هەرکەسێ دەیەوێ با باوەڕ بێنێ وە هەرکەسێکیش نایەوێ با باوەڕ نەهێنێ و کافر بێ.

## پ٢٨٨/ ئەنجام و سوودی بڕوابوون بە قەزاو قەدەر چی‌یە؟

و: ئەنجام و شوێنەواری بڕوا بوون بە قەزا و قەدەر بریتی‌یە لە:

**یەکەم**: خۆڕاگرتن لە ئاقار بەڵاو تەنگانەدا و بێزاری دەرنەبڕین و خەفەت نـەخواردن بـەهۆی لەدەست چوونی بەرژەوەندی و قازانجێکی دونیایی.

**دووەم**: لەخۆبایی نـەبوون بـە هـۆی وە دەسـت هێنـانی قـازانج و بەرژەوەندی‌یـەك. هـەروەك خوای گەورە بۆ هەردوو حاڵ دەفەرمووێ: ﴿مَا أَصَابَ مِنْ مُصِيبَةٍ فِي الأَرْضِ وَلاَ فِي أَنْفُسِكُمْ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ نَبْرَأَهَا إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللهِ يَسِيرٌ. لِكَيْلاَ تَأْسَوْا عَلَى مَا فَاتَكُمْ وَلاَ تَفْرَحُـوا بِمَا آتَاكُم....﴾ الحديد ٢٣.٢٢. واتـە: هیـچ بەڵایـەکتان تـووش نـابێ نـە لـە زەوی و مـاڵ و نـە لـە خۆتاندا مەگەر پێش خوڵقاندنی نووسرابێ، ئەوەش بۆ خودا ئاسانە، بۆ ئەوەی نە بۆ شـتێك کـە لـە دەستتان دەچێ دڵتەنگ بن. وە نە بۆ شتێك کە دەتانداتێ دڵخۆش بن.

**سـێیەم**: ترسـان لـە مـردن و نەسـڵەمینەوە لـەو ڕووداو و کارەسـاتانەی کـــە دژوارن و دەردەسەری و ئەرك و ئازاریان بەدواوەیە. هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿قُلْ لَنْ يُصِيبَنَا إِلاَّ مَا كَتَبَ اللهُ لَنَا﴾ التوبة ٥١. واتە: بڵێ تووشمان نابێ ئەوە نەبێ کە خوا بۆی نووسـیوین، (ئـەوەش کەنوسیویەتی هەردەبێ ببێ، کەواتە ترس و لەرزی ناوێ).

**چوارەم**: نائومێد نەبوون بە هۆی تاوانباری‌یەوە و لەخۆبایی نەبوون بە هۆی چاکەکاری‌یـەوە. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿فَوَاللهِ إِنَّ أَحَدَكُمْ أَوِ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّـارِ حَتَّـى مـا يَكـُونَ بَيْنَهُ وبَيْنَها إِلاَّ ذِرَاعٌ أَو بَاعٌ فَيَسْـبِقُ عَلَيـهِ الكِتَـابُ فَيَعْمَـلُ بِعَمَـلِ أَهْـلِ الجَنَّـةِ فَيَدْخُلُهـا. وإِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الجنَّةِ حَتَّى مَا يَكُونَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا غَيرَ ذِرَاعٍ أَوْ ذِرَاعَـيْنِ فَيَسْـبِقُ عَلَيـهِ الكِتَابُ فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهلِ النَّارِ فَيَدْخُلُهَا﴾ رواه البخاري. واتە: بابای وا هەیە کردەوەی دۆزەخیانی لێ دەپشکوێتەوە هەتا باسکێکی دەمێنێ بگاتە دۆزەخ (یان بـاڵێك) بـەڵام نووسـراوی قـەدەری خـوا پێشی لێ دەگرێتەوە و کردەوەی بەهەشتی‌یان دەکات و دەچێتە بەهەشتێ، وەئـی واهەیـە کـردەوەی بەهەشتی‌یان دەکات هەتا باسکێك یان دووباسکی نـامێنێ بیگـاتێ، (یەکـسەر) نووسـراوی ئـەزەل پێشی دەکەوێتەوە وکردەوەی دۆزەخیان دەکات و دەچێتە نێوی.

**پێنجەم**: خۆیەکلاکردنەوە بۆ خوداو پشت بە خوا بەستن. چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَكُونَ أَقْوَى النَّاس فَلْيَتَوَكَّلْ عَلَى ا للهِ﴾ ابن ابی حاتم. واتە: هەرکسێك پێی خۆشە لە هەمووکەس بەتواناتر بێ با پشت بە خوا ببەستێ.

**شەشەم**: ئیتسان هەمووکات توانای خۆی دەخاتە کار بۆ چاکەکاری و پەسندکاری تاکو لەخودا نزیك بێتەوە و شایستەی چوونە بەهەشت و چەپاڵە دران بێ لەدۆزەخ.... هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَأَمَّا مَنْ آمَنَ وعَمِلَ صالِحاً فَلَهُ جَزاءً الْحُسْنى﴾ الكهف ٨٨. واتە: بەلاَم هەرکەسێ بروا بێنێ و کردەوەی چاك بکات ئەوە پاداشتی چاکتری بۆهەیە.

# بەشی شازدەیەم

# پێناسەی سەلەف وبانگەوازی سەلەفی

## پ٢٨٩/ ئایا ئەم عەقیدەیەی کەباسمان کرد، چ عەقیدەیەکی پێ ئەڵێن؟

و: ئەو عەقیدەیەی کەباس کرا عەقیدەی (سەلەفی ساڵح)ی پێ ئەڵێن.

## پ٢٩٠/ (سەلەف) کێنە؟

و: سەلەف ئەم دەستەیەن کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەیان دەفەرمووێ: ﴿ **إِنَّ خَيْرَكُمْ قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ** ﴾ البخاري و مسلم. **واتە**: چاکترینتان ئەواتەن کە لە سەردەمی من دا ژیاون، ئینجا ئەوانەی دوای ئەوان، ئینجا ئەوانەی دوای ئەوان.

## پ٢٩١/ تایبەتمەندی‌یەکانی سەلەف چین؟

و: ئێمە کاتێك دەڵێین سەلەفی واتە:

١) خەوارج نین تەنها بەگوناهێ خوێنی مسوڵمانان حەلاڵ کەن.

٢) (**رافضي**) نین هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کافر کەن.

٣) لەوانەش نین کە گۆڕانکاری و لێکدانەوەی نابەجێ بۆ سیفەتەکانی خوا دەکەن، وەك (موعتەزیلەکان).

٤) خوای گەورە بەهیچ لە دروست کراوەکانی ناچوێنن وەك (**مشبّه**) کان.

٥) سۆفی و شیخ پەرست وگۆڕ پەرستیش نین.

٦) دەمارگیریان بۆ ووتەی هیچ پێشەوایەك نی‌یە کاتێك کە زانیان ووتەکانیان پێچەوانەی ئایەت و فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ.

٧) (**تعطیل**)ی ناوو سیفەتەکانی خوا ناکەن.

## پ٢٩٢/ بەرنامەی وەرگرتن لای سەلەفیەکان چی‌یە؟

مەبەست لە بەرنامەی وەرگرتن، ئەوەیە کە سەلەفی ساڵح بەپێی بەرنامەیەکی تایبەت مامەڵە لەگەڵ واقیع دەکەن، واتە :

١- هەرشتێك کۆك (موافق) بێ بە قورئان و سوننەت وەری دەگرن هەر شتێکیش پێچەوانەی قورئان و سوننەت بێ ڕەتی دەکەنەوە.

٢-هیچ کسێکیان لەلا معصوم نی یە غەیری پێغەمبەرﷺ نەبێ

٣-کۆڕا (اجماع) ی سەلەفی ساڵح لە لایان بیانوو (حجە) ی شەرعی یەو خەڵکیش لەسەریانە کە وەری گرن

٤- هیچ گووتەیەك و هیچ رایەك وەرناگرن بەبێ هەڵسەنگاندنیان بە قورئان و سوننەت و اجماع.

٥- لامێلی ناکەن لەگەڵ قورئان و سوننەت بەپێ ی ئەقڵ یان راو بۆ چوون یان پێوان (قیاس).

٦- کۆمەڵکاری (الجماعە) لای سەلەفیەکان کەشتی رزگار بوونە لە گۆبەندی دونیا و تا خۆشی رۆژی دوایی.

٧- بە پێویستی نازانن لە سەر کسێکی بێ توانا کە زانست و وزانیاری وەرگری، وەك کەسێ کە توانای هەبێ.

## پ٢٩٣/ ئامانجەکانی بانگەوازی سەلەفی چین؟

و: بانگەوازی سەلەفی لەم سەردەمەدا لەپێناو چەند ئامانج و مەبەستێکی گرنگ دایە:

١) کردنە یەکی مسوڵمانان لە ژێر یەك بیروباوەرداو یەك رێرەوی تشریع و یاسادا.

٢) پێ گەیاندنی مسوڵمانی پاك و دوور لەهەموو هاوتاپەرستی یەك و ئەفسانەو دەماگیری یەك.

٣) پاك کردنەوەی کۆمەڵگەی ئیسلامی لەهاوتاپەرستی و بیدعەو ئەفسانەو هەموو جۆرە شتێکی هەڵبەستراوو رازێنراو.

٤) دژایەتی کردنی هەموو بیرو بۆچوونێکی کوفر کە هاتۆتە نێو کۆمەڵگەی ئیسلامی.

٥) رزگار کردنی جیهانی ئیسلامی لەژێر چنگی دوژمنانی ئیسلام، ئەویش بە جیهاد کردن دەکرێ.

## پ٢٩٤/ گرنکترین تایبەتمەندی یەکانی رێرەوی سەلەفی چین؟

و: تایبەتمەندی یەکانی رێرەوی سەلەفی بریتین لە:

١) پەیوەست بوون بە قورئان و سوننەت و تێگەیشتنیان لەسەر رێرەوی سەلەفی ساڵح، وەك سەرچاوەیەك بۆ یاساو شەرع وە هەڵسەنگاندنی هەر ووتەیەك پێیانەوە.

٢) یەکخواناسی بکرێتە بنچینەی خاڵی دەست پێ کردن و خاڵی کۆتایی، واتە هەموو ئیشێك بۆ ئەمەبێ.

٣) پەیوەست بوون بەیەك بوون و یەك ریزی مسوڵمانان، وە رێ نەدان بە لێك ترازان و پارچە پارچە بوون.

٤) دیارکردنەوەو جیاکردنەوەی (هەق و ناهەق) و(یەکخواناسی وهاوتاپەرستی) و(سوننەت و بیدعە).

## پ٢٩٥/ تاقمی رزگاربوو (الفرقة الناجیة) کێن؟ یان پێغەمبەری

خوا ﷻ ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ دەکرێن بە چەندین تاقم، گشتیان دەچنە دۆزەخ تەنها یەك تاقم نەبێ ئایا ئەم تاقمە کێن؟

و: تاقمی رزگاربوو، ئەو کەسانەن کە لە سەر رێگەی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی پێغەمبەر دەڕۆن، هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ ﴿وَأَنَّ بَنِي إِسْرَائِيلَ تَفَرَّقَتْ عَلَى إِثْنَتَيْنِ وسَبْعِينَ مِلَّةً. وتَفْتَرِقُ أُمَّتِي عَلَى ثَلاثٍ وسَبْعِينَ مِلَّةً كُلُّهمْ فِي النَّارِ إلا مِلَّةً واحِدَةً: مَا أَنا عَلَيْهِ وأَصْحَابِي﴾ رواه الترمذي. واتە: بەنی ئیسرائیلی‌یەکان بوون بە هەفتاو دوو (٧٢) تاقم، ئومەتی منیش دەبێتە هەفتاو سێ(٧٣) تاقم هەر هەموویان دەچنە ناو ئاگر، تەنها تاقمێك نەبێ: ئەوانەن کە لە سەر رێی من و هاوەڵانم دەڕۆن.

## پ٢٩٦/ نیشانەکانی تاقمی ڕزگار بوو چین؟

و: کۆمەڵی رزگاربوو چەند نیشانەیەکیان هەیە کە بریتین لە:

١ـ کۆمەڵێکی کەمن و کۆمەڵێکی زۆریش دوژمنایەتیان دەکەن، خوای گەورەش پیایان دا هەڵدەڵێ و دەفەرمووێ: ﴿وَقَلِيلٌ مِنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ﴾ السبأ ١٣. واتە: کەمێك لە بەندەکان سوپاس گوزاری منن.

پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرمووێ: ﴿طُوبَى لِلْغُرَبَاءِ: أُنَاسٌ صَالِحُونَ، في أُنَاسِ سُوءٍ كَثِيرٍ، مَنْ يَعْصِيهِمْ أَكْثَرُ مِمَّنْ يُطِيعِهُمْ﴾ صحيح رواه احمد. واتە: خۆشی بۆ غەریبان، کە کۆمەڵە خەڵکێکی چاکن، لەناو کۆمەڵێکی زۆری خەڵکی خراپ دا ناسراون، ئەو کەسانەی کەبە گوێیان ناکەن گەلێ زیاترن لەوانەی کە بە گوێیان دەکەن.

٢ـ هەموو ئەو کەسانەی کە لەسەر ڕێڕەوی سەلەفی سالحن بریتین لە تاقمی ڕزگاربوو.

## پ٢٩٧/ بنچینەکانی کاری تاقمی ڕزگاربوو چین؟

و: تاقمی رزگاربوو لەسەر چەند بنچینەیەك کاردەکەن وەکو بەرنامە بەپێی ئەم خالانەی خوارەوە:

- ئەم تاقمە کارو کردەوەکانیان لە سۆنگەی کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەرەوە ﷺ هەڵدەبڕن، هەروەك پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرمووێ: ﴿ تَرَكْتُ فِيكُمْ شَيْئَيْنِ لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُمَا: كِتَابَ الله وسُنَّتِي...﴾ رواه الحاكم والطبراني ومالك. واتە: دووشتتان لە نێو بەجێ دەهێڵم (ئەگەر خۆتانی پێوە بگرن بە هیچ جۆرێك گومڕا نابن، ئەویش کتێبی خوا (قورئان) و سوننەتەکانی منن.

• تـاقمی رزگـاربوو: هـەرکاتێك دووچـاری کێشـەیەك بـوون یەکسـەر دەگەڕێنـەوە سـەر فەرمانی خواو پێغەمبەر ﷺ بۆ چارەسەر کردنی کێشەکە، ئەویش بەپێی ئەم ئایەتەی خوارەوە: ﴿فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ﴾ النساء ٥٩. واتـە: ئەگـەر لەهـەر شتێکا تێك گیربوون، یەکسەر بگەڕێنەوە سەر فەرمانی خواو پێغەمبەر ﷺ، گەر ئێوە برواتان بە خـواو بـەڕۆژی دوایـی هێناوە..

• تاقمی رزگاربوو: قسەی خۆ بەپێش قسەی خواوپێغەمبـەر ﷺ نایـەخن، هـەروەك خـوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ الحجرات ١. واتە: ئەی بڕوادارینـە قسـەی خۆتـان بـەپێش قسـەی خـواو پێغەمبەر ﷺ مەیـەخن. هەروەك (ابن عباس) یش ڕەزای خـوای لێ بـێ دەفـەرمووێ: **(اخشـى ان تـنزل عليكـم حجارة من السماء، اقول لكم قال رسول الله، وتقولون قال ابو بكر وعمر!)** واتە: مـن لەوە ئەترسـم لە ئاسمانەوە (بەرد) تان بەسەرا بێتە خوارەوە لەوەی کە من دەڵێم پێغەمبـەری خوا ﷺ وا دەفەرمووێ، ئێوەش بڵێن ئاخر (ابوبكرو عمر)یش وا دەفەرموون!

• تاقمی رزگار بوو: کارەکانیان لەسەر یەکخواناسیەوە ئەنجام ئەدەن کە بریتی‌یە لـە خـوا بە یەك زانین و بە تەنها پەنا بردنە بەر ئەو و خۆ یەکلا کردنەوە بۆ ئـەو، هـەروەك خـوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿لَا تَتَّخِذُوا إِلَٰهَيْنِ اثْنَيْنِ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ﴾ النحل ٥١. واتـە: دوو خوا بۆخۆتان بڕیار مەدەن و مەیان پەرستن، چونکـە خـوای ڕاسـتەقینەی ئێـوە تـەنها خوایەکەو بەس.

• تاقمی ڕزگاربوو: هەمیشە سوننەت و ئاکاری پێغەمبەر ﷺ دەبووژێننەوە، لـە کاتێکداکـە ئەم سوونەتە لەنێو خەڵکی غەریب بێ. هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفـەرمووێ: ﴿إِنَّ الإِسْلامَ بَدَأَ غَرِيباً وَسَيَعُودُ غَرِيباً كَمَا بَدَأَ فَطُوبَى لِلْغُرَبَاءِ الَّذِينَ يُصْلِحُونَ إِذَا فَسَدَ النَّاسُ﴾ رواه مسلم. واتە: بێ گومان ئیسلام بە غەریبی دەسـتی پـێ کـرد کـاتێکیش کـە دەگەڕێتەوە بۆ هەمان شێوە بە غەریبی دەگەڕێتەوە، خۆشی بۆ ئەو غەریبانـەی کـە چاکـە دەنێنەوە دوای ئەوەی کە خەڵکی بەرەو زەلکاوی خراپی ڕێ گرتوو بوو ون.

• تـاقمی رزگـاربوو: دەمارگیریـان بـۆ قسـەی هیـچ کەسێك نی‌یـە تـەنها قسـەی خـواو پێغەمبەری خوا ﷺ نەبێ.

• تاقمی رزگـاربوو: ئـەو تاقمـەن کەپێغەمبـەری خـوا دەربارەیـان دەفـەرمووێ: ﴿لَا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي ظَاهِرِينَ عَلَى الحَقِّ، لا يَضُرُّهُمْ مَنْ خَذَلَهُمْ حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللهِ﴾ رواه مسلم. واتە: بـەردەوام تـاقمێك لـە ئوممـەتی مـن لەسـەر ڕاسـتی دەمێننـەوە، زیانبـار نـابن بەوانەی پشت گیریان ناکەن تاوەکو فەرمانی خوا دێتە جێ.

• تاقمی رزگـاربوو: ڕێـز لـە پێشـەوایانی ئـایینی دەگـرن بـەبێ هیـچ دەمارگیری‌یـەك هـەر قسـەیەك کە لە زاری پێشەوایان دەردەچێت، پێوەر بۆ قسـەکانیان قورئان و سـوننەتە، هـەر

قسەیەك پێچەوانەی ئەم دوو سەرچاوەیە بێ دەكێشرێ بە دیوارا. هەروەك ئیمامی (**شافعي**) (رەحمەتی خوای لێ بێ) وای فەرمووە.

- تاقمی رزگار بوو: فەرمان بە چاكە دەكەن و بەر هەڵستی لە خراپە دەكەن، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَلْتَكُنْ مِنْكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ﴾ آل عمران ١٠٤. واتە: دەبا لە ئێوە ئوممەتێك هەبن كە بانگ بۆشتی چاك بكەن وفەرمان بە چاكە و بەرهەڵستی لە خراپە بكەن.
- تاقمی رزگار بوو: داوا لە خەڵكی دەكەن كەوا خۆیان بگرن بە سوننەتی پێغەمبەرەوە ﷺ.
- تاقمی رزگاربوو: هەموو یاسا داهێنراوەكان دەبوغزێنن و داوای حوكمی ئیسلامی دەكەن و هەوڵی دووبارە پیادە كردنەوەی دەدەن.
- تاقمی رزگاربوو: بانگی خەڵكی دەكەن بۆ جیهاد، بە هەر سێ وەسیلەوە، كەبریتین: لە جیهادكردن بە (زمان و بە ماڵ و بە گیان) هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿جَاهِدُوا الْمُشْرِكِينَ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنْفُسِكُمْ وَأَلْسِنَتِكُمْ﴾ صحيح رواه ابو داود. واتە: جیهاد بكەن لەگەڵ هاوبەش دانەران بە ماڵ و بە گیان و بە زمان.

كەواتە دەتوانین بڵێین پوختەی وەڵام ئەوەیە كە سەلەفی‌یەكان لەسەر (٣) بنچینە كار دەكەن، كەبریتین لە: (یەكخواناسی و شوێن كەوتنی پێغەمبەرو خۆ پاك كردنەوە لە گوناح).

## پ٢٩٨/ ئایا مەرجە كە تاقمی رزگاربوو، ئەم تاقمە بێت كە خوا لە دونیا سەریان بخات؟

و: نەخێر، مەرج نی‌یە هەموو تاقمێكی رزگار بوو خوا سەركەوتنیان لە سەر دەستا بێنێت...

## پ٢٩٩/ ئەی كێن ئەو كەسانەی كە خوا سەركەوتنی یان لەسەر دەستا دێنێ؟ یان ئایا كۆمەڵی سەركەوتوو (الطائفة المنصورة) كێن؟

و: موجاهیدان و زانایان كۆمەڵی سەرخراون، هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿لاتَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي ظَاهِرِينَ عَلَى الحَقِّ يُقَاتِلُونَ وهُمْ أَهْلُ الْعِلْمِ﴾ رواه البخاري. واتە: بەردەوام كۆمەڵێك هەن لە ئوممەتی من كە لەسەر هەقن و شەڕ دەكەن لە ڕێگەی خوا، ئەویش خاوەن زانیاری‌یە (**توحید**)یەكانن.

زانایانیش وەڵامی جیا جیایان هەیە لە ئاقار ئەم پرسیارە، بۆ نموونە:

١-(ابن حجر) رەزای خوای لێ بێ دەڵێ:

تاقمێكن لە (**قدس**) پێ‌یان دەڵێن: (**شامي**) و خاوەن هێزێكی زۆرن بۆ جیهاد كردن لە ڕێگەی خوا.

٢- ئیمامی (**النووي**) رەزای خوای لێ بێ دەڵێ:

دەگونجێ کە ئەم تاقمە فرە کۆمەڵێك بن لە هەموو جۆرە بڕوادارێك کە بریتین لە: (موجاهیدان و فەقیهەکان و ریوایەت کەران و ڕاڤەکەران و فەرمان بە چاکەو ڕێگران لە خراپەو دونیا نەویست و خواناسان و... هتدن.

٣ـ (ابن المبارك) ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ:

ئەم تاقمە بریتین لە خاوەن فەرموودەکان (اصحاب الحديث)

پوختەی قسان کۆمەڵی سەرکەوتوو بریتین لەو کەسانەی کە دەستیان گرتووە بە فەرموودەکانی پێغەمبەرو دەست پێشخەری فەرمانی خواو پێغەمبەر نین، جیهادیش دەکەن لە ڕێگەی خوا.

## پ٢٠٠/ مسوڵمانان چۆن دەبن بە تاقمی سەرکەوتوو؟ یان مسوڵمانان چۆن سەردەکەون؟

و: مسوڵمانان بە سێ شتان سەر دەکەون کەبریتین لە:

١ـ یەکخواناسی: واتە بە تەنها یەك خوا بناسن و غەیری ئەو کەسی تر نەپەرستن و بەتەنها داوا لە خوا بکەن و...هتد. هەروەك و پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿قُولُوا لا إِلَهَ إِلاَّ الله تُفْلِحُوا﴾ الامام احمد. واتە: بڵێن: ﴿لااله الا الله﴾ و سەردەکەون.

٢ـ برایەتی: واتە: مسوڵمانان لەسەر ئەساسی برایەتی و تەبایی کار لەگەڵ یەکدا بکەن و مشوور گێڕی کاری یەکتر بن.

بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿ الْمُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ يَشُدُّ بَعْضُهُمْ بَعْضاً﴾متفق عليه. واتە: بڕوادار بۆ بڕوادار وەك قەڵایەکی پتەو وان کە هێندێکیان هێندێکیان بەهێز دەکەن.

٣ ـ خۆ ئامادەکردن (الإعداد): دوای بڕینی دوو قۆناغەکەی پێشوو ئینجا هەوڵی خۆ ئامادەکردن بدرێ بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر هەڕەشەیەك کە لە چارەنووسی ئیسلام و مسوڵمانان دەکرێ.

هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وأعدوا لهم ما استطعتم من قوة﴾ الأنفال ٦٠. واتە: بۆیان ئامادە بکەن لەوەندە هێزەی کە لە تواناتاندا هەیە.

# تەواو

## سوپاس بۆ خوا

لە ڕۆژی شەممە کاتژمێر (٢)ی پاش نیوەڕۆ

لە نووسینی ئەم کتێبە بوومەوە. لە بەرواری (٢٥)ی**ذوالقعدة**

ساڵی ١٤١٦ی کۆچـــی بەرامبەر (١٣)ی نیسانی ١٩٩٦ی زایینی

**وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين**

# چەند تێبینییەکی گرنگ

**تێبینی یەکەم: رەواندنەوەی چەند تەم ومژێک**

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿والذين يؤذون المؤمنين والمؤمنات بغير ما اكتسبوا فقد احتملوا بهتاناً واثماً مبينا﴾ الاحزاب ٥٨

له (٢٧) رەمەزانی ساڵی ١٤١٧ ی كۆچی بۆیەكەم جار كتێبێك بەناونیشانی (بیروباوەری ئیسلامی لە دوو توێی قورئان وسوننەت دا) دەرچـوو كەبەتێرو تەسـەلی هـەموو كـون وكەلەبـەرەكانی (عقيدة) ی روون كردبۆوە، ئەویش ئەم كتێبە بوو كەئێستا لەبەر دەستی جەنابتانایە...

بەڵام نەك وەك كتێبێكی ئاسایی، جگە لەوەی هەموو پیتەكانی بـوو بوونـە نەشـتەرێك بـۆ پەڕەكـەی دڵـی چـەند فەریكـە خوێندەوارێكی موعتەزیلـە ئاسـای خـۆ پـێ زانـای هیـچ نـەزان.. یەكـەمین نووسـینی (عـەقیدەی تێروتەسـەل) بوولـە سەراسـەری كوردسـتان كەبەشـێوەكی زانسـتی واقعیانـە توانـی ئەقـە لـەبنی مەنجەڵەكە هەڵسێنێ و عەقڵیەتی لە جێ لاچووو هەرزەلیوی هەرزە كارانەی ئەوان گێژو خـوڵ پـێ بـدات و هەمبانەی پڕلە فوویـان بەنەشـتەری بیروبـاوەڕی راسـتەقینە فـش كاتـەوە، بۆیـە زۆر لـەو وڕگانـەی فوویـان تێچوو بوو تـەقین وشـەقیان بـردو گـەلێك هێرشـی راسـتەوخۆ كرایـە سـەر نووسـراوەكەو تەنانـەت سـەر بەندەش.

دوای دەرچوونی ئەم كتێبە.. هێندێ كەسی هەل پەرست وبێ ویژدان زۆر نا حەكیمانە لە (الف)ەوە تاوەكو (یاء) بەمیكرۆسكۆپ بەدوای هەڵەدا گەراون. تەنیا بۆ ئەوەی رەواج بە بازاڕی خۆیان بدەن ،چونكـە دڵنیان كە بازاڕیان رەواجی نەماوە. ئەگەر چی من لەكتێبەكەدا لەپێشەكی‌یەكەی باسی ئەوەم كردووە، كە ئەگەر ئەم كتێبە لەگەڵ دیدی هێندێ كەس نەگونجا، بابێن لەرێگەی گفت وگۆوە لەگەڵم بدوێـن وقەناعـەتم پێ بهێنن... بـەڵام سـەد حـەیف وخـابن تـاقمی واهـەن بـەبێ هیـچ رەچـاو كردنـی ئـاداب ورەوشـتێكی ئیسلامی دوای ئـەوەی رووی شـەرمەزاری خۆیـان دەرخسـت لەبـەردەم خزمـەت كـارانی ئـەهلی سـوننەو جەماعەت تەنانەت بەمە نەوەستان و بەڵكو بەناو (بەیان) ێكیشیان لەدژی بەندەو كتێبەكـە بـڵاو كـردەوە... لەهەمووش سەیرتر داوایان لێ‌دەكردم، پەشیمانی خۆم لەعەقیدەكە دەربڕم بەڵام دوای ئـەوەی.. خـەڵكێكی زۆر بەبێ تێبینی كتێبەكە لەسەر رەئی هەندێك ئەهلی حەسەد نـارەزایی توندیـان دەربڕیبـوو شـان بەشـانی ئەوان، بەڵام سوپاس بۆخوا دوای لێكۆڵینەوەو دیراسە كردنیان بـە انصافەوە بـۆ كتێبەكـە داوای لێبوردنیـان كردوو (تەبەڕای) قسەی خۆیان كرد كەپێشتر (تەوقیع) یان كردبوو.

بەڵێ برایان دۆستان.. ئەمە بەدرێژایی مێژوو كـاری هەمیشـەی یـان بـووە لەگـەڵ ئـەهلی ئیسـلام... ئەوەتە كاتی خـۆی چ دەردێكیـان هێنـا بەسـەر (ئیمام احمد) لەسـەر مەسـەلەی خـەڵقی قورئـان... بـەزۆر دەیانویست ملـی پێ‌كـەچ بكـەن لەسـەر ئـەوەی كەموعتەزیلـەكان دەیـانگوت قورئـان (مخلوق)ەو ئـەویش دەیگوت نەخێر، قورئان كەلامی خوایە.. زۆریان لێ كرد تابەزۆر پەشیمانی كەنەوە، بەڵام ئەو هەرئـەوەندە بوو دەیگوت: من چۆن قسەیەك دەكەم كەلەدوای من خەڵكی كاری پێ‌بكەن وپـێ یـەوە گومڕابـن؟ بـەڵێ ئەمـە هەڵوێستیان بـووە بـەدرێژایی مێـژوو لـە گـەڵ ئـەهلی ئیسـلام. ئـەوەتا بـەچاوی خـۆ دەبینـن كـەچ پروپاگەندەیەكیان لەدژی بەندەو كتێبەكە دروست كردووە؟!

بەرچاوترین رەخنەشیان ئەمانەی خوارەوەن:

١- سەڵاوات لێدانی دوای بانگ بەدەنگ:دەڵێن گوایە من سەڵاوات لێدانم دوای بانگ حەرام کردووە... بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر بەبێ ویژدانی وبێ (انصاف) ە وە لەکتێبەکەم راماون.. بۆیە لەهەموو کوردستان مسوڵمانان ئێستا بەقێزو بێزەوە سەیری ئەم تاقمە دەکەن... ئەگەرنا با تۆزێك بە ویژدانەوە بروانە کتێبەکە و بزانن تا چەندی قسەکانیان لە تەرازووی زێری دا پوولێکی قەڵب دەهێنێ. ئەوندە بەسە بۆ دەم کوت کردنی ئەو تاقمە کەلەگەڵ ناو هێنانی ووشەی پێغەمبەرﷺ زۆر بە جوانیو بە شانازییەوە نووسیتم ﴿صلی الله علیه و سلم﴾ یان بادیقەت بدەنە پرسیاری (٩٧- ١٠٠- ٢٠٧ کە دووجار لەوێ هاتووە) وراببێنن وبزانن من چی دەڵێم دەربارەی (سەڵموات لێدان) لەسەر پێغەمبەرﷺ.. بەڵام من گوتوومە: سەڵموات لێدان بەم جۆرە راستەو بەم جۆرە نا درووستە ، واتە ئەسڵی سەڵمواتم بە خراب نەزانیوە بەڵکو قسەم لە چۆنیەتەکە کردووە. بۆ نموونە نوێژ کردن فەرمانێکی خوایە بەڵام درووست نییە لە نوێژێکی بەیانیا (سێ) رکات نوێژی بکەیت لە جیاتی (دوو) رکات.باسەکەشم دەربارەی سەڵموات هەر بەم جۆرە بووە. ئەگەرنا سەڵاوات لێدان جێبەجێ کردنی فەرمانێکی خوایە هەروەك دەفەرموێ: ﴿**ان الله وملائکته یصلون علی النبي یاایها الذین آمنوا صلوا علیه وسلموا تسلیماً**﴾ ئامادەشم هەرکەسێك بەڵگەیەکی شەرعیم لەقورئان وسوننەت بۆ بهێنێ لەسەر ئەو جۆرە سەڵاواتەی کەباسم کردووە، ئەو دەم ئامادەم لە گوتەی خۆم پەشیمان ببمەوە. دیسان گلەییان کردووە کەوا من... زیکری خوام حەرام کردووە.. دیسان منْ هەر هێندەیان پێ دەڵێمو با کاتژمێرێکیش بۆ ئەمە تەرخان بکەن و بابزانن لەچەند شوێنان من (تأکید) م کردووە لەسەر زیکر کردن، دەبا دیقەت بدەنە پرسیاری(٦١دووجار- ١٠٠- ١٧٧- ١٧٨) وبزانن وایە یان نا.. بەڵام ئەوەی کە من گوتوومە وەك سەڵواتەکە زیاتر لەچۆنیەتەکەی بووە نەك کردنی.

٢- گلەییان لەلاپەرە (٣٥) کردووە کەگوایە سیفەتی خوام فراوانکردووەو وەك خۆیان ئاسا لە (٧) سیفەتان وێکم نەهێناوەتەوە... ئەوان ئەگەر هێندە لا مەزهەب بن بەرامبەر بەخوا تەنها لە (٧) سیفەتان خوا حەصر کەن (خوا پەنامان بدات) من هەڵسوو کەمربەندی ئەوانم شکاندووە وگوتومە گوناهە شەرِ بەخوا دەفرۆشن وبوختانی پێدەکەن؟!!! جا هەیاران هی من چاکترە یان هی ئەوان؟

٣- رەخنەیان گرتووە لە لاپەرە (٦٣) کە گوایە من یاساغم کردووە کەلە خۆشەویستی پێغەمبەری خوا رۆبچیت. من مەبەستم لە رۆچوونی زێدەرەوی بووە نەوەك خۆشویستن چونکە پێغەمبەری خوا بۆ ئەوە نەهاتووە بەجۆرێك بەرزی کەینەوە کە شیاوی مەقامی خۆی نەبێ.. تا بەقەولی ئەوان بڵێین: (**لولاك لولاك ماخلقت الافلاك**)؟!!

٤- لەلاپەرە (١٦٢) گوایە من پێستم بۆ خوا بڕیار داوە:من هیچ کات نەم ویستووە لەش بۆ خوا بڕیار بدەم.. بەڵکو ئەوانەی کە پێست بۆ خوای گەورە دیار دەکەن بە (مشرك) یان دەزانم ئەوەتا لەبابەتی (اسماء وصفات)، (مشبهه) کانم لەقاوغی ئەهلی سوننەوجەماعە دەرهێناوە.. بەڵام ئەوان کەزمانی کوردیان لەبیرچۆتەوە، بۆچی گلەیی لەمن دەکەن. من کە دەڵێم: (خوای پەروەردگار خاوەنی سیفەتی تێرو تەسەل وپڕ بەپێستی خۆیەتی) .. پەنا بەخوا خۆمن نەمویستووە (پێست) بۆ خوای گەورە بڕیار بدەم.. بەڵام لە زمانی کوردی دا دەڵێ: (ئەم چرایە زۆر جوانە، پڕ بەپێستی ژوورەکەیە) یان (ئەم شتلە نەمامە زۆر جوانە، پڕ بەپێستی باخچەکەیە). دیارە نە(ژوور)ەکەو نە (باخچەکە)ش لەپێست دروست نەکراون، بەڵام ئەوە (کینایە)یە بۆ رێك وپێکی (چرا) کە بۆ ژوورەکەو (شتلە نەمامەکە) ش بۆ باغچەکە، بەهەمان شێوەش کە دەڵێم پڕ بە پێستی خۆیەتی.. واتە زۆر جوانەو هیچ کەم وکوڕیەکی نییە.

٥- لە لاپەرە (١٨٦) دیسان بە بەرەواژوو لەمەسەلەکە گەیشتوون من هاتووم لە جیهانی ئیسلامی سەلەفی یەکانم کردۆتە چوار بەش.. واتە چوار جۆرە سەلەفی هەنە لە هەموو (دنیا) بەڵام ئەوان هاتوون بۆ هەرخاڵێك لە خاڵەکان وەك پیشەی هەمیشەیی خۆیان (تاویل)ێکیان بۆ کردوە؟!

خاڵی یەکەم: نووسیتم: ئەو کەسانەن کە گرنگی بە زانستی شەرعی دەدەن و زۆر گرنگی بەباسی سوننەت وبیدعە دەدەن وبروایان بە جەماعە وحاکمیەت وجیهاد نی یە (واتە پشت گیری جەماعە ئیسلامی یەکان وجیهادیەکان ناکەن). بەڵام ئەوان هەڵساون گوتویانە: (ئەمە لەگەڵ ئیمەیەتی؟!) ناشزانن ئەم قسەیە لە ساڵحی خۆیانە.

خاڵی دووەم: باسم کردووە کەوا سەلەفی وا هەن ولە (سعودیە) دروست کراون ویەە ئیش خراون... کە مەبەستم ئەوانە بووە کە کاتی خۆی فەتوایان دا بۆ شەهید کردنی (جهیمان) لە مەککەو بەند کردنی زانایانی بەناوبانگ (سلمان العودة) و(سفر الحوالي) و هتد... بەڵام ئەوان وایان (تأویل) کردووە کەوا من لەم خاڵە مەبەستم پێ سەلەفی یەکانی کوردستانە؟! خۆ ئەگەر واش بێ هێشتا هەر لەساڵحی خۆیانە.

خاڵی سێیەم: سیاسی یە چاك سازی یەکان: من لێرەدا مەبەستم چەند تاقمێکە کە لەجیهانی ئیسلامی سەلەفی یان پێ دەگوترێ وبرواشیان بە هەڵبژاردن وپەرلەمان هەیە.. کەچی هەڵساون ئەمەشیان (تأویل) کردووە ودەڵێن: مەبەستی نووسەر (یەکگرتووی ئیسلامی یە)؟!! دەی خۆ ئەگەر مەبەستم (یەکگرتووی ئیسلامی) ش بێ هیچ لەهیچ ناگۆڕێ وبۆ ئەوان پێ ی قەڵس بوو ون؟ ئەگەر چیش مەبەستم ئەوان نەبووە.

خاڵی چوارەم: گوتوومە ئەو کەسانەن بەدوای فیقهی ابن تیمیە ومەنهەجی بزووتنەوەو حاکمیەتی (سید قطب) کەوتوون. ئەوان هەڵساون (تأویل) یان کردووە ودوو ڕەخنەیان لەم خاڵە گرتووە:

ا- گوتوویانە بۆچی نەینووسیوە فیقهی (شافعی) بۆ نووسراوە فیقهی (ابن تیمیة)!!! جاومرە تا ئاو لە چاوت دەنێ بۆحاڵی ئەم تەرزە کەسانە مەگریە.. من هەڵساوم پێناسەی ئەم جەماعەتەم کردووە کە سیفەتیان ئەوەیە کە بەدوای (فیقهی ابن تیمیة) کەوتوون.. ئەوان لەمن دەپرسن بۆچی بەدوای فیقهی (ئیمام شافعی) نەکەوتوون.. ئەو گلەیی یە لە من ناکرێ کە بۆچی بەدوای فیقهی ئیمام شافعی نەکەوتوون.. چونکە من تەنها پێناسەی ئەم جەماعەتەم کردووە بۆیە دەتوانن لەم جەماعەتە خۆیان بپرسن کە بۆچی بەدوای فیقهی ئیمام شافعی نەکەوتوون. دەی مادام ئەوان هێندە جەرگ سۆزی (ئیمام شافعی)ن بۆ بەحەقیقەت بەدوای ناکەون، خۆ ئیمام شافعی لەسەدەی سەلەف دا ژیاوە واتە ئەویش یەك بوو لەسەلەفی صالح ئەومتا (ئیمام شافعی) نی یە کە دەڵێ (گەر هەر قسەیەکی منتان بینی پێچەوانەی قورئان وسوننەت بوو بیکێشن بەدیوارا) کەواتە ئێمە کەدەڵێین (سەلەفی) ن واتە قوتابی ئەو کەسانەین کە پێغەمبەری خوا شایەدی سەر ڕاستی بۆ داون. (ئیمام شافعی)یش یەك بووە لەم سەلەفی یانە.. کەواتە هیچمان پێ شەرم نی یە کە قوتابی ئیمام (شافعی)بین.. بەڵام لەهەمان کات ئێمە ئیمام شافعی وەك خۆیان ئاسا ناکەینە (معبود)ێك وبیپەرستین؟!

ب- گوتوویانە من لەم خاڵەدا مەبەستم بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستانە؟! دیارە لەم خاڵ... ناوی گۆڕین ساتمەیان بردووە وهەرزەلیون من کە دەڵێم مەنهەجی بزووتنەوە وحاکمیەتی سید قطب، واتە (المنهج الحركي والحاكمية لسيد قطب).. بەڵام قەیناکە (ئەوەی سێر سوور بێ بە هەمزاغەیان زانیوە)

٧- ڕەخنەیان گرتووە لەلاپەرە (٧٨) کە گوایە من گوتوومە بیدعە(حسنه وسیئه) ی نی یە..دەی باشە خۆ ئەوە قسەی من نی یە.. ئەومتە نی یە کە ئیمام (شافعی) مامۆستامان دەفەرمووێ: (مَنْ حَسَّنَ بِدْعَةً فَقَدْ اِسْتَدْرَكَ عَلَى النَّبِيِّ) واتە: هەرکەسێك بیدعەیەك بە (حسنة) دابنێ ئەوە خۆی لەپێغەمبەر بە زاناتر زانیوە. یان (عبدا لله ی کوڕی عمر) ڕەزای خوایان لێ بێ، دەفەرمووێ: ﴿كُلُّ بِدْعَةٍ سَيِّئَةٌ وَإِنْ رَآهُ النَّاسُ حَسَنَةً﴾ واتە: هەموو بیدعەیەك بۆ ئەم دینە گومڕایی یە بلخەڵکی بە (حسنة) شتی بزانن. بەڵام

کەسێت گوێ بە ﴿کل بدعة ضلالة﴾ فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ نەدات چۆن گوێ بە (ئیمام شافعی) و(الالبانی) دەگرێت..

**تێبینی دووەم: دەردی لەهەموو دەردان گرانتر.**

لەبەر ئەوەی بەڕێز مامۆستا بەشیر (تقریظ) ی ئەم کتێبەی کردووە. هەڵساون تا زمانیان شل بووە قسەی نارێکیان بە بەڕێزی داوە.. کەوا چۆن تەزکیەی ئەم کتێبەی کردوە؟ بەڵکو بەمەندەش نەوەستان تاپێیان کراوە بوختانێکی تەڕو تازەیان پێ کردوە، کە گوایە مامۆستای بەڕێز گوتوویەتی نووسەری ئەم کتێبە خیانەتی لەگەڵ من کردووە، کە هەندێ شت کە گوتوویەتی ڕەشی کەوە من ڕەشم نەکردۆتەوە.

ئەم ناوەدا زۆر بە ڕاشکاوی دەڵێم سوپاس بۆ خوا دەست نووسەکەو ئاماژەکانی مامۆستا بەشیر ماوەو ڕەشم نەکردووە.. بەڵام چەند هەڵەیەکی نائیرادی دروست بووە کە بەم شێوەیە: خوا شایەدە هەرچی ئاماژەی کە مامۆستا بەشیر کردبێ من دەقاو دەق وەرم گرتووە و تەنها پرسیاری (٢٩٤) نەبێ کە شیاوی نەشر نییە..کە دەربارەی جۆرەکانی سەلەفی بوو بەڵام خوا دەزانێ من کە ئەم بابەتەم ... ویستبوم (موعتەزیلەکان) ئاگادار کەمەوە کە هەموو سەلەفییەك وەك یەك نین.. چونکە ... سەلەفی بوایە بە (خوارج) یان دەزانی بۆیە من باسەکەم نەشر کرد. کە بەڕێز مامۆستا بەشیر ڕەز... لەنیەتی من حاڵی نەبووبێ. بەڵام: ئەوەی کە کێشەکەی دروست کردوە چەند مەسەلەیەك ... مامۆستای بەڕێز هێڵی بەژێری دا هێنابوو یان ئاماژەیەکی بۆ کردبوو.. بەڵام لەبەر ئەوەی هیچ تێبینییەکی لەسەر نەنوسرابوو، بۆیە بەڕاستی من بە هەندم هەر نەگرتبوو.. چونکە دوای ئەوە (تقریظ)ە کەی ...، بۆیە منیش یەکسەر تێبینییە نوسراوەکانی مامۆستام چاك کردو کتێبەکەم بەچاپ گەیاند.

ئەو حاڵانەش کە مامۆستای بەڕێز ئاماژەی پێ کردبوو بەبێ تێبینی ئەمانەی خوارەوە بوون:

پ ٣١/ هەروەك ئێستا خەڵکی نەفام.. تادەگاتە (شەفاعەتمان) بۆ دەکەن لەلای خوا؟ هێڵی بەژێر ...بوو.

پ ٦٠/ نابێ بەجۆرێك (تاویل) بکرێت (هێلی بەژێر داهێنابوو)

/ حاڵی (ا) بە سیفاتەکانی خوا بێت (هێلی بە ژێر داهێنابوو).

١٠/ بۆ نموونە بڵێین (ئەی خوای گەورە... تادەگاتە (فلانە سەید وام بۆ بکە) (خستبوویە ناو ...

١/ حاڵی (١) وەکو نەورۆزی کوردەواری (نووسیبوی ئەگەر بە جەژن حساب بکرێ ئەوجا حەر...

حاڵی (٣) زیکری (الله الله) سەهمێکی بۆ کردبوو.

حاڵی (٤) ووشەی مانگی شەعبان (هێڵی لەژێر کێشرابوو).

پ ١١٧/ ووشەی پشت هەڵکات سەهمی بۆ کرابوو.

پ ١١٠/ قیمت دەربڕین بەزمان (سەهمی بۆ کرابوو).

حاڵی (٤) ووشەی بەهەموو جۆرێکەوە (هێڵی بەژێردا کێشرابوو).

حاڵی (٧) مەولود نامەی کوردی تا کۆتایی (سەهمی بۆ کردبوو). ئەوەندە و هیچی تر.

**تێبینی سێیەم:**

دوای دەرچوونی چاپی یەکەمی ئەم کتێبە هێندێ

برای بەڕێز وخۆشەویست زۆر بەویژدانەوە لەکتێبەکە ڕامان وچەند تێبینی یەکی گرنگیان بۆ ڕەوان کردم، منیش بەڕاستی قەناعەتم بەتێبینی یەکان کرد، کەهەمووی بەڵگەی قورئان وسوننەتیان لەگەڵ بوو، بۆیە لەم چاپی دووەمەدا تێبینیەکانم جێبەجێ کردوو دەست کاری هێندێك لەناوەرۆکی ئەم کتێبەم کرد. خوا پاداشتیان بداتەوە:

**دوا قسەم:**

١) کتێبی ناوبراو کتێبێکە باس لە عەقیدە دەکات، بەڵام ناسنامەی هیچ لایەن وگروپێکی ئیسلامی نی یە لەکوردستان وروو لەهیچ لایەنێکی ئیسلامیش ناکات.

٢- دەکرا بۆ چارەسەر کردنی ئەم کێشەیە.. بهاتبان قسەیان لەگەڵ بەندە بکردبایە، ئینجا هەڵوێستی خۆیان دەربریباو پەلەیان نەکردبا لەدەرکردنی ئەم بەناو (بەیانە)ی کەلەسەر بەندە وکتێبەکە نوسراوە چونکە من ئامادە بوومە لەگەڵ هەرکەسێك دانیشبام کە گومانیان لە کتێبەکە هەبوو هەرچەندە من لەسەر داخوازی مامۆستا بەشیر مەوعیدیکمان دانا لەگەڵ چەند مەلایەك... بەڵام بەداخەوە، ئەوەی کە لە هەموومان زیاتر گری گرتبوو، لە پێش هەمووان بۆ دانیشتنەکە نەهات ئەگەرچی بەڵێنیشی دابوو کەبێ بەڵام من بە خوێنەران دەڵێم ئایا دبێ بۆچی نەهاتێ ؟؟ ئایا دەبێ لەبەر ئەوە نەهاتێ کە (؟!!) ـ انا لله وانا الیه راجعون ـ بۆیە دڵنیام لەوە کە لە هەڵایساندنی ئاگری دووبەرەکی هیچی تری لانەبوو!!.. تا ئێستاش نەك یەکێك لەم تەرزە پیاوانە بەڵکو لەتکە یەکێکیش لەوانە نەهاتووە بڵێت با هێندێ قسە لەسەر ئەم کتێبە بکەین بەڵام بەداخەوە بەبێ ئاگاداری من بەیانیش دەرچوو هیچ حسێبێکی شەرعی خواشیان نەکرد.

٣) باچاك بزانن، کە من تۆزقاڵێك لە نووسینی ئەم کتێبە پەشیمان نیم. لەوانە نەبێ کە قەناعەتم پێیان هاتووە کە هەڵە یە ئەویش خوا پاداشتی چەند گەنجێکی شارەکمان بداتەوە کە بە پێی فەرموودەی ﴿المؤمن مرآة المؤمن﴾ هاتنە لام و تێبینی خۆیان دربری، ئەنا ئەگەر دەرفەتم بوایە زیاتر پەردەم لەسەر هەقیقەتەکان ڕا دەماڵی و ئەوەی ژێر بەرەم دەهێنایە سەر بەر.

من لە کۆتایی دا هیچ ناڵێم تەنها ئەوە نەبێ ودەنگی خۆم دەخەمە پاڵ (مەحوی) شاعیر کەدەڵێ:

**لە پاداشتی قسەی سەردا هەموو ئاهوو هەناسەی سەرد**
**کەسێ شێتانە بەردم تێ ئەگرێ من بەرقی تێ ئەگرم**
**شوکور هۆشیارە (محوی) تێدەگا دونیا خەراباتە**
**کەبەد مەستی بکا ئەهلی خراپەی بۆ چی لێ ئەگرم**

**والسلام علی عباد الله الصالحین**

**براتان/ هێمن عبدالعزیز**

**ئاگاداری:**

١. بۆ لەچاپ دانەوەی سەر لە نوێی ئەم کتێبە خۆم لێی بەر پرسیارم نەك کەسانی تر. واتە (نە مامۆستا بەشیرو نە مامۆستا عبدالقادر نە کەسانی تر پەیوەندیان پێوە نی یە.)
٢. داوا لە خوێنەرانی کتێبی بیرو باوەری ئیسلامی دەکەم ، ئەوانەی کە چاپی یەکەمی ئەم کتێبەیان کەوتۆتە دەست با سەر بدەن لەم شوێنانەی خوارەوە بۆ وەرگرتنی چەند تێبینی یەك لەسەر ئەم کتێبە:
٣. تۆمارگای ئاشتی: لە بینایەی بازارگای (القلعة) لە هەولێر.
٤. تۆمارگای فورقان: لە هەمان بازارگا.
٥. کتێبخانەی ڕەسەن: لەپشت بینایەی پارێزگای هەولێر.
٦. کتێبخانەی مەحوی: ناو کتێب فرۆشەکان نزیك دەروازەی قەڵا.

# سەرچاوەکان

## ...ترین سەرچاوە عەرەبی یەکان


١.قورئانی پیرۆز

٢.فەرموودە بەڕێزەکانی پێغەمبەر ﷺ.

٣..........................................محمد نعيم ياسين

...زم..........................................سعيد حوى

...تفسير ابن كثير..........................................ابن كثير

...التفاسير..........................................محمد علي صابوني

...الجامع للاصول..........................................شيخ منصور علي ناصف

...والنهاية..........................................ابن كثير

...الدين الاسلامي..........................................عفيف عبدالفتاح الطبارة

...في الطريق..........................................سيد قطب

...التوحيد..........................................عبد المجيد الزنداني

...العقائد الاسلامية..........................................سيد سابق

...الحق..........................................ابراهيم النعمة

...عقيدتك ايها المسلم..........................................عبد العليم عبدالرحمن السعدي

...رياض الصالحين..........................................للامام النووي

١٦.مختصر شرح العقيدة الطحاوية..........................................صلاح احمد ابراهيم السامرائي

١٧.الدين القيم..........................................ابو الاعلى المودودي

١٨.العقيدة واثرها في بناء الجيل..........................................الشهيد د. عبدا لله عزام

١٩.المصطلحات الاربعة..........................................ابو الاعلى المودودي

٢٠.مفردات في غريب القرآن..........................................راغب الاصفهاني

٢١.مفهوم الحاكمية في فكر الشهيد عزام..........................................ابو عبادة الانصاري

...معالم التوحيد..........................................مروان ابراهيم القيسي

...معناه واقسامه..........................................عبد العزيز محمد عبد اللطيف

...الارشاد الى صحيح الاعتقاد..........................................د. صالح بن فوزان

...الولاء والبراء في الاسلام..........................................محمد بن سعيد القحطاني

٢٦.اصناف الحكام واحكامهم..........................................د. عمر عبدالرحمن

٢٧.علوم القرآن..........................................احمد عادل

٢٨.القواعد المثلى في صفات الله الحسنى..........................................محمد بن صالح العثيمن

...معالم الانطلاقة الكبرى..........................................محمد عبدالهادي المصري

...الثمرات الزكية في العقائد السلفية..........................................احمد فريد

٣١.اصول الدعوة..........................................عبدالكريم الزيدان

٣٢.اصول التربية الاسلامية واساليبها..........................................عبدالرحمن النحلاوي

٣٣.العقيدة في الله          د. عمر سليمان الاشقر

## گرنگترین سەرچاوە کوردیەکان:


١. تەفسیری خال..................................................شێخ محمدی خال
٢. تەفسیری قورئانی پیرۆز.........................................عثمان عبدالعزیز
٣. پوختەیەك دەربارەی ئیسلام..................................عەلی باپیر
٤. قەزا و قەدەر ......................................................عەلی باپیر
٥. سۆزی نەتەوایەتی................................................عەلی باپیر
٦. رێگای صالح بوون و بەرە و خوا چوون.........................عەلی باپیر
٧. پێغەمبەران (علیهم السلام)....................................عەلی باپیر
٨. پرۆژەی بەرنامەی فیکری کاری ئیسلامی ....................عەلی باپیر
٩. حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری تاغوت...........................عەلی باپیر
١٠. ژیانی پێغەمبەری مەزن ﷺ....................................عبدالعزیز پارەزانی
١١. رێکەوت لە تەرازووی ژیریدا.................................محمد ملا صالح شارەزووری
١٢. سروشت لە تەرازووی ژیریدا..................................محمد ملا صالح شارەزووری
١٣. بگە بە کاروان ....................................................د. عبدا لله عزام
١٤. قەزا و قەدر .......................................................حامد محمد صالح
١٥. ئاوێنەی خوا ناسین.............................................صابر گرد عازەبانی

# ناوەرۆک

# ئەم کتێبە

پێک هاتووە لە ( ٣٠٠ ) پرسیار و وەڵام دەربارەی بیروباوەڕی ئیسلامی لە نێوان قورئان و سوننەتدا . کە وەک بەرنامە بۆ رۆڵەکانی ئیسلام نووسراوە .

هەموو کون و قوژبنەکانی بیروباوەڕی ئیسلامی لە ژێر رۆشنایی قورئان و سوننەت بە تێرو تەسەلی بە بەڵگە روون کردۆتەوە .

بیری هەڵەی چەند تاقمێک دەخاتە بەرچاو کە لەبەردەم هێندێک باسی بیروباوەڕدا ساتمەیان بردووە . بە تایبەت دەربارەی هەقیقەتی باوەڕ و ناو و سیفەتەکانی خوا و قەزا و قەدەر و بیدعە و ... هتد .

ئاماژە بە چاکترین و رێک و پێک ترین بیرو بۆچوونو رێڕەو دەکات کە رێبازی رەسەنی سەلەفی سالحە.

رێز و نەوازشێکی چاک دەنێ لە زاناو پێشەوایانی ئیسلامی ، بەتایبەت ئەوانەی فەزڵی زۆریان هەبووە بەسەر ئوممەتی ئیسلامی و کۆمەڵی مسوڵمانان .